# شۆڕشەکانی کورد

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

## کورد و کۆماری عێراق

(لە ڕووی دەق بنچینەی کۆنی خۆیەوە)



دانراوی:
مامۆستا عەلائەددین سەججادی

| | |
|---|---|
| سرشناسه | سجادی، علاءالدین، ۱۹۰۷ - ۱۹۸۴م. |
| عنوان و نام پدیدآور | شورشه‌کانی کورد و کورد و کوماری عیراق/ تالیف علاء الدین سجادی. |
| مشخصات نشر | سنندج : کردستان، ۱۳۹۵. |
| مشخصات ظاهری | ۳۰٤ ص. |
| شابک | ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-۲۵۹-٦ |
| وضعیت فهرست نویسی | فیپا |
| یادداشت | کردی. |
| موضوع | کردان -- ایران -- جنبش‌ها و قیام‌ها |
| موضوع | کردان -- عراق -- جنبش‌ها و قیام‌ها |
| موضوع | کردان -- جنبش‌ها و قیام‌ها |
| رده بندی کنگره | ۱۳۹۴ ۳س۴ک/DSR۷۲ |
| رده بندی دیویی | ۹۵۵/۹۸۴ |
| شماره کتابشناسی ملی | ۴۰۳۹۶۲۵ |

# شۆڕشەکانی کورد

و

## کورد و کۆماری عێراق

**(لە ڕووی دەقی بنچینەی کۆنی خۆیەوە)**

دانانی:

**عەلائەددین سەجادی**

انتشارات کردستان
سنه

# شۆڕشەکانی کورد

## و کورد و کۆماری عێراق


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | شۆڕشەکانی کورد و کورد و کۆماری عێراق |
| ✓ دانراوی (مؤلف): | عەلائەددین سەججادی |
| ✓ پیاچوونەوە و هەڵەبژێری (تصحیح): | ئیلهام قەوامی ـ ژیلا قەوامی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ١٣٩٦ـ٢٠١٧ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ١٠٠٠ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ٣٠٤ لاپەڕە (صفحەی وزیری) |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |
| ✓ شابک: | ٦ـ٢٥٩ـ٩٨٠ـ٩٦٤ـ٩٧٨ |

✓ نرخ (قیمت): ١٧,٠٠٠ تمەن ـ ٧,٠٠٠ دینار



سنندج ـ چهارراه شهدا ـ پاساژ عزتی ـ انتشارات کُردستان ـ تلفن: ٠٨٧٣٣١٦٥٣٨٢

سنە ـ پاساژی عیزەتی ـ بڵاوکردنەوەی کوردستان ـ تەلەفوون: ٣٣١٦٥٣٨٢ ٨٧ ٩٨+

# ناوەڕۆك

# به نێوی خوای گەورە

## سەرەتا

مێژوو لاپەڕەی خۆی هەڵئەگێڕێتەوە و نەتەوە ئەو لاپەڕەیە ئەخوێنێتەوە؛ ئەیخوێنێتەوە بۆ ئەوە بزانێ چە کارەسات و قەوماوێك لە باو و باپیرەکانیەوە بەجێ ماوە و چە کرد و کۆششێکیان کردووە لە ژێر ئەم ئاسمانە شینەدا بۆ ئەوە لەگەڵ ژیانا هەنگاو باوێژن وە یا ژیانی بەرزی لەگەڵیانا شان بە شان بڕوا بەڕێوە؟!..

گەلێ جار مێژووی تاقەکەسێك لە قەومێکا و لە دەورێکا مێژووی هەموو قەومەکەیە لەو دەورەدا، وەکوو چۆن زۆرجار مێژووی هەموو قەومەکە ئەبێتە مێژووی نەفسیەتی تاقەتاقەی ئەو گەلە. بە تایبەتی تاکوو گەل لەبارەی نەفسیەتا بەتەواوی لێك نزیك ئەبنەوە؛ چونکە ئەو تاقەکەسەی کە ئەبێ بە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشەکە وە نەبێ هەموو بوون و نەبوونی شۆڕشەکە لەوا دروست بووبێ، ئەگەر هاوکارەکانی وە یا گەلەکەی ئەو شایانییەیان تیا نەبێ ئەو ناتوانێ شۆڕشەکە بگێڕێ. پەندی پێشینانی کوردی ئەڵێ: «چەپڵە بە دەستێك لێ نادرێ!.». ئەوەندە هەیە هەندێ کاروباری تایبەتی سەرەتا ڕوو ئەکاتە سەرۆکی شۆڕش وە یا شۆڕشگێڕ کە ئەو کاروبارانە دوورن لە چوارچێوەی لاپەڕەی ژیانی یەکێکی ترەوە. ئەمانە زیادەشایانی و یا زیادەبریندارییەك لەو سەرۆکەدا پەیدا ئەکەن و ئەمجا ئەویش ئەبێ بە پێشەوای دەستەکەی تر.

وەکوو ئەیزانین هەر گەلێك کە شۆڕشی تێدا هەبووە و شۆڕشی گێڕاوە ڕۆڵەکانی ئەو گەلە هێناویانە شۆڕشەکانیان خستۆتە سەر شریتێك بۆ ئەوە هەم گەلەکە وە هەم گەلانی تریش چاوێکی پیابخشێنن و زانیارییەکیان بۆ دەرکەوێ کە چە کارەسات و قەوماوێك لە ڕابردوودا ڕووی داوە، تا ئەوانیش لەو بەندانە پەند وەرگرن، وە یا تێ بگەن

كە باو باپیرەكانیان بۆ ژیانی كامەرانی ئەم نەتەوەی خۆیانە چۆن سنگیان ناوە بە قەڵای پۆڵایینەوە بۆ ڕووخاندنی؟. وە چۆن گیانی خۆیان كردووە بە گاوگەردوونی ژیانی پڕ سەرفرازی ئەمان.

ئەمانە لە هەموو گەلێكا و لە زمانی هەموو قەومێكا هەبووە و هەیە، قەومی كورد بە هەموو جۆر خوێندوویەتەوە و ئەیخوێنێتەوە، بەڵام ڕەنگبێ ئەوەندە ئاگاداریی نەبووبێ بەسەر شۆڕشەكانی خۆیدا!. دوور نییە ئەم بێئاگادارییەش هەر لەبەر ئەوە بووبێ كە نەنووسراون و هەر وەكوو ستێران چەند ڕۆژێك بەسەر زمانی بەرەی ئەو ڕۆژەوە بووە و پاشان كە ئەو ڕۆژو دەورەیە ڕۆیشتووە ناوی مەفهومی شۆڕشەكەش ڕۆیشتووە!..

هەر ئەم سووچە بوو منی هاندا بۆ ئەوە كە بە پێی توانا بتوانم شۆڕشەكانی كورد لە كون و قوشبن و لە سەر زاری داستانگێڕەكانەوە كۆ بكەمەوە و بە زمانی خۆشەویستی كوردی بیخەمە سەر قاقەز و پێشكەشی كەم بەو نەتەوەیە كە ئەم جۆرە قارەمانیانەی تێدا ڕوووداوە.

مەبەستی من لێرەدا مەبەستی «فەردی و شەخسی» نییە؛ چونكە دوور نییە هەندێ كەس تیایا توورە ببن، وە یا هەندێك پێ كەیف خۆش بن. نە لە پێ خۆشبوونی ئەوان من كەیف خۆش ئەبم، وە نە لە توورەبوونی ئەمان توورە ئەبم. بۆیەش نابم چونكە وەكوو وترا پەردەكە پەردەی لاپەڕەی قەومەكەیە نەوەك هی تاقەكەسێك. كە مادام وابوو حوكم بۆ گەل و قەومە نەوەك بۆ تاك و فەرد.

هەر لەبەر ئەمەیە كە ئەڵێم: داستانی ئەم شۆڕشانە پێشكەش ئەكەم بە قەومی خۆشەویستی كورد.

**عەلائەددین سەججادی**

**بەغدا**

**١٩٥٩/١/٢**

◇◇◇

# مێژوویەکی کورتی کوردی

گێتی هەرچەندە زۆر کۆن بێ مێژووی شارستانی ئادەمیزادەکەی ئەو کۆنیە پڕناکاتەوە، بەڵێ ئاسار و بەڵگە ئێستە وردە وردە دەرئەکەوێ و ئەوەمان پیشان ئەدا کە سەد هەزار ساڵ و زیاتر لە سەد هەزار ساڵ ئادەمیزاد ئەم سەر زەویەی داگیر کردووە و ئیشی تیا کردووە بەڵام وەنەبێ ئەمە ئەوەمان تێگەیەنێ کە ئەو کۆمەڵایەتی و شارستانیەی ئێستە بە چاوی خۆمان ئەیبینین ئەو سەردەمانەش ئەمە هەبووبێ!. بەڵگەکان تەنها ئەوە ئەڵێن کە ئادەمیزاد هەبووە، ئیتر وەنەبێ بتوانن لە هەموو ڕوویەکەوە پایەی شارستانی و کۆمەڵایەتیان دەربڕن، ئەمەشیان بۆیە پێ ناکرێ چونکە یەکێ لە نیشانەی شارستانی کە خوێندەوارییە، ئەوە بۆ ئێمە ڕوون نەبووەتەوە کە ئەو دەورەیە ئەمە هەبووە. کەوابوو پەیکەری بەردێك وە یا سەکوتی دێزەیەك ئەوشتەی کە مەبەستی ئیمڕۆژە ئەوە دەرناخا.

لەبەر ئەمە چە کورد، چە غەیری کورد ناتوانێ لە لایەن پوختی ڕەگەز و نەژادیەوە لە «٣٥٠٠» ساڵ پێش میلاد بەولاترەوە بڕوا. ئەگەر بڕوا تەخمین و بەراوردە، تەخمین و بەراوردیش وەنەبێ بەتەواوی پیاو بگەیەنێ بە ئامانج.

ئەمە هەیە بۆیە ناتوانین لەوە زیاتر بڵێین:

کە ئارییەکان لە «٣٥٠٠» ساڵ پێش میلادەوە لە جنووبی ڕووسیاوە بە سەر شیمالی قەوقاس و دەریای ڕەشدا بەرەو خوار بوونەوە و هاتوون بۆ دەوروبەری ڕۆژاوای ئاسیا و بوون بە دوو بەشەوە؛ بەشێکیان ڕوویان کردە ئاوروپا و قەومەکانی ئەوێیان لێ دروست بوون. بەشێکیان هەر لە دەشتەکانی جنووبی ڕووسیاوە هاتوونەتە ڕۆژاوای ناوەڕاست و ڕۆژاوای نزیکیەوە تا جنووبی هیند چوون. ئەم بەشەیان کە بەرەو ئاسیا بوونەوە لە تورکستانی ئیمڕۆی ڕووسیادا خۆیان گرتەوە و ماوەی هەزار ساڵێك مانەوە و لە پاشان ڕوویان کردە

جنووبی ئێران. لە پاش ماوەیەك ئەمانیش بوون بە دوو ڕێچكەوە؛ ڕێچكەیەكیان بەسەر «هیمالایا»دا چوون بۆ هیند و لە «پەنجاب» گیرسانەوە و نەتەوەی هیندیان دروستكرد، ڕێچكەكەی‌تریان بەناوبانی ئێراندا بڵاوبوونەوە و بە ئێرانی ناویان دەركرد.

ئەم ڕێچكەی دووهەمە پەرەی سەند و زۆر بوون، هەندێكیان لە دەشتەكانی ئێراندا جێگیر بوون و بە «پارسی»ی ناسران، هەندێكیشیان بە ڕەوشتی كۆچەرایەتی كەوتنە شاخەكانی «زاگرۆس» و پەل پەل بوونەوە و «لۆلۆ، گۆتی، كاسی، مانای، كاردۆش، خالدی، كاردوها و ماد»یان لێ پێك هات و ئەمانە هەر یەكە بۆ خۆیان دەورێكیان گێڕا. لەبەرەی پارسی «هەخامەنشی» هەڵكەوت و لە بەرەی زاگرۆسی «ماد». فارسەكان ئەچنەوە سەر هەخامەنشی و پارس، كوردەكانیش ئەچنەو سەر «ماد» و بەرەی زاگرۆس.

مادەكان لە «٧٠٠-٥٥٠» پێش میلاد كیشوەرێكی بەناوبانگی پڕهێزیان هەبووە و بە هەموو مەعنایەكی كیشوەرداری دەوڵەتێكی تیشكداریان هەبووە، وڵاتی زاگرۆس ئاوەدان بووە بە حوكمداری ئەوانەوە، سەرباری ئەمە هەرجارە پەلاماری وڵاتی ئاشوور و پارسیشیان داوە و ئەوانیشیان كز كردووە. ماوەی «١٥٠» ساڵ دەوڵەتی ماد لە جۆشی گەنجی و بەرزیدا بووە، لە پاش ئەوە وردە وردە بە هۆی هەخامەنشیەكانەوە ئەستێرەیان كەوتە كزێ.

ئەم «١٥٠» ساڵی دەوڵەتداری مادانە لاپەڕەیەكی هەرەگەشە لە مێژووی كورد و سەرەتای مێژووی تاریخی لەو وەختەوە دەست پێ ئەكا. لە پاش ئەو دەورە ئیتر بەرە بەرە هەر جارە هاتۆتە سەر دنیای ئەمارەتداری و شۆڕشگێڕی تا ئەم ڕۆژە كە ئێمە قسەی لێوە ئەكەین.

لە پێش ئەوەدا كە بكەوینە سەر باسی ئەمارەت و شۆڕشەكانی كورد پێویستە شتێك لە ئامار و شوێنی كورد و ژیانی كۆمەڵایەتی كوردەوە بزانین:

◈◈◈

# ژمارەی کورد

مەسەلەی سەرژماری کورد یەکێکە لەو مەسەلە هەرەزلانە کە تا ئێستە کەس نەیداوە بە دەستەوە. بە دەستەوە نەدانەکەش لەبەر چەند هۆیەك بووە.

**یەکەم:** ئامار لە هیچ لایەك ڕێکوپێکیەکی وای نەبووە، ئەو شوێنانە کە کوردیان تێکڵاو بووە ئەوان لە ئاماری خۆیان سەریان لێ تێکچووە ئەمجا چۆن ئەپەرژێنە سەر هی کورد؟!. دیسان ئەگەر هاتبێت و جار جار سەرژمارێکیشیان کردبێت؛ یەکەم لەبەر ئەوە کە نەیانویستووە بەتەواوی ژمارەی کورد بدەن بە دەستەوە، ژمارەی ڕاستیان نەکردووە وەیان نەیانوتووە!.

**دووەم:** کوردەکە خۆیشی لە بە دەستەوەنەدانی ژمارەکەی سووچێکی هەیە؛ چونکە ئەم یا، کۆچەری بووە، یا لادێنشین. ئەو سەردەمە کە ئەم دوو ژیانەی ڕابواردووە بێجگە لەوە کە یاسای حوکوومەت بۆ ئامار ڕێکوپێکییەکی نەبووە خۆیشی لەو کەم و کورتە ئەگەر کرابێ دزیوەتەوە. کە ئەڵێم خۆی دزیوەتەوە ئەمە لە دەوری دواییدا بووە، واتە لە سەرەتای ئەم سەدەی بیستەمەدا کە وردە وردە سەربازی ئیجباری لەناو حوکوومەتەکاندا پەیدا بووە، لە ترسی ئەوە کە نەیکەن بە سەرباز خۆی لە نووسین شاردۆتەوە. ئاشکرایە پێش ئەم دەورەیەش ناونووس هەر لە هیچ لایەك نەبووە، واتە لەو حوکوومەتانەدا کە کوردیان تێکڵاو بووە.

سەرباری ئەمانەش هەموو کۆچ‌کردن و تاڵان‌کردن و گرانی و جەوری حوکوومەتەکان ئەوەندەی‌تر کوردی لەناو بردووە و نەیهێشتووە پەرەبسێنێ، دیسان دەربەدەربوونیان و کەوتنە گۆشەی شارانی بێگانە و لە فیکرچوونەوەی زمانەکەی خۆیان، ئەمە لە هەموو زیاتر کاری تێ‌کردوون بۆ کەم‌بوونەوەی سەر ژمارییان.

ئەو شتانە کە پیاو ناچار ئەکەن بە کۆچ‌کردن و دەربەدەربوون دوو شتن؛ یا بێ‌دەرامەتی، وە یا جەور و کارەساتێك کە پاڵ ئەنێ بە کابراوە بۆ ئەوە لە شوێنی خۆی نەمێنێ. وڵاتی کورد وڵاتێکی بەپیتە، لە هەموو جۆرە سەرمایەیەکی ژیانی تێدایە؛ سەرمایەیەکی وەها کە گەلێ زیاترە لە ئەندازەی دانیشتووەکانی. کۆچ کردنی کوردە کە

لە پاش دەورەی دەوارنشینی لەبەر بێ پیتی و بێ ڕۆزیگەری تەبیعی وڵاتەکەی نەبووە، کەوابوو ئەو دەربەدەرییەی کە بەسەریا هاتووە لەبەر جەور و کارەساتەکە بووە. ئەگەر لەبەر بێنانیش بووبێت دیسان ئەوەش هەر جەور و ستەمی داگیرکەر ئەگرێتەوە؛ وڵاتەکەی وڵاتێکی بەپیت بووە، بەڵام داگیرکەر نەیویستووە دەستی ئاوەدانی تیا بخاتەکار، کابرا چار ناچار دەشتی گرتۆتە بەر و ڕووی کردۆتە وڵاتانی بێگانە و لەناو ئەواندا خۆی و نەتەوەکەی تواونەتەوە و زمانی مادەرزادییان گۆڕیوەتەوە بە زمانی ئەو شوێنە!.

ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە حوکوومەتەکانی وەکوو تورکیا و ئێران کە ئەکەوتنە قڕانی کوردەکان و لە پاش ئەوە کە لە شوێنەکانی خۆیان هەڵیان ئەفڕاندن و لە شوێنێکی تر دایان ئەنان ناچاریشیان ئەکردن بەوە کە بە زمانی خۆیان قسە و نووسینیان نەبێ، ئەمەش بۆ ئەوە کە لە پاش ماوەیەك دەنگ بەرز کەنەوە و بڵێن وڵاتەکەمان کوردی تیا نییە و هەر نەبووە!. وەکوو بە تایبەتی لە سەرەتای ئەم سەدەی بیستەمە بەملاوە حوکوومەتی تورك ئەم سیاسەتەی گرتبووە پێش وە ئەینەڕان بە دنیادا کە کورد لە وڵاتی ئێمەدا نییە، وە یا ئەگەر شتێك لە شاخەکان هەبێ ئەوە «تورکی شاخین!» و ناوی کورد لە فەرهەنگی وڵاتی تورکیادا نییە!..

بە هەموو بێشەرمییەکەوە ئەم بانگەی ئەدا و هیچ شەرمی لەوە نەئەکرد کە خوێنی گەشی کوردەکان بە هۆی جەور و ستەمی ئەوەوە ناوی تورکی لە ڕووپەڕەی زەوی و زاری کوردستاندا ئەنووسی و نیشانی عالەمی ئەدا و بەمە کوردەکانی ئەخستە دەرەوە.

یا حوکوومەتی ئێران بە ناوی برایەتییەوە لە هەموو لاپەڕەی مێژوویدا بانگی ئەکرد: «ئێران و ئێرانی و ئەیوت کورد و فارس ئێرانین و ناوی کورد بەجیا لە فەرهەنگی خاکی ئێراندا نییە!»..

ئەم بانگەی ئەداو ئەم برایەتییەی ئەنواند!. بەڵام کە سەیری بەندیخانەکانت ئەکرد هەموویان پڕ بوون لە برا کوردەکان و برایەکی فارسی تیدا نەبوو!. کە سەیری برسییەتی و دەربەدەریت ئەکرد هەموو بەر برا کوردەکان کەوتبوو هیچ بەر برا فارسەکان نەکەوتبوو!. کە سەیری پایەو وەزیفەی حوکوومەتت ئەکرد هەموو بەر برافارسەکان کەوتبوو هیچی بەر برا کوردەکان نەکەوتبوو!.. کە سەیری ڕێگاوبان و کۆشك و سەرا و ئاوەدانی و

شارستانیت ئەکرد هەمووی بەر برا فارسەکان کەوتبوو هیچی بەر برا کوردەکان نەکەوتبوو!. کە سەیری خوێندەواری و قوتابخانەو زمانی نووسینت ئەکرد هەموو بە زمان و خوێندنی برا فارسەکان بوو هیچی بەر برا کوردەکان نەکەوتبوو!. ئەمە بوو برایەتی فارس و کورد کە حوکوومەتی ئێران شەیپووری بۆ لێ ئەدا؟!..

ئەمجا حوکوومەتی دەوری پێشووی عێراق: ئەمیش وەنەبێ کارەساتی لەوان کەمتر بێ بەرانبەر بە کوردەکان؛ لە قانوونە ئەساسییەکەیدا دینابوو «زمانی مەحەلی» ئەبێ لە کوردەواریدا هەبێت و بخوێنرێت و پێی بنووسرێت، کەچی بێجگە لە تۆزێکی شاری سولەیمانی لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا ـ کە ئەمەش تەنها بە هۆی جەربەزەیی خەڵکی شارەکەوەبوو ـ لە شوێنەکانی تری کوردەواریدا تەنها دەنگ نەبێ هیچی تری نەبوو!. بەڵێ پارە خەرج ئەکرا بۆ چاپکردنی کتێبی کوردی بۆ قوتابخانەکان، کاربەدەست و هەڵسوورێنەری ئەو کتێبانە ئەکەوتنە جرت و فرت و کتێبەکانیشیان ئەنارد، بەڵام لە ژێریشەوە ئەیانوت بە مامۆستای قوتابخانەکان کە بڵێن قوتابییەکان نازانن کوردی بخوێننەوە!. بەم بەردەیان دوو چۆلەکەیان ڕاو ئەکرد؛ یەکێ دەنگی نەهێشتنی زمانی کوردی لە قوتابخانەی کوردەواریدا، یەکێ لە ژێر پەردەی کتێب چاپکردنی کوردیدا تۆزێ گیرفان پڕکردنیش!.

هەر لەو قانوونە ئەساسییەدا دینابوو کە زمانی مەحاکم و دادگاکانی کوردەواری ئەبێ زمانی کوردی بێ، کەچی ئەمە تەنها مەرەکەبەکەبوو لەسەر قاقەزەکە و هیچی تر، چونکە هیچ یەك لە دادگاکانی کوردەواری جارێك محاکمەیەکی بە زمانی کوردی بە خۆیەوە نەدی، بە تایبەتی لە پاش ساڵی (١٩٤١) مەگەر کوردێکی خوێندەواری بەرز کوتوپڕی چاوی بە قانوونەکە بکەوتایە و بیزانیایە کورد حەقی ئەوەی هەیە کە زمانی دادگاکانی کوردی بێ، ئەگینا خەڵکەکەی تر ئەوەندە لێی بێگانە بووبوونەوە هەر بە فیکری شەویشیانا نەئەهات کە مافێکی وایان هەیە.

مەسەلەی ناردنی قوتابی کورد بۆ دەرەوەی عێراق وە یا پێگەیاندنی قوتابیەکی کورد بۆ وەرگرتنی «دکتۆرا» یەك لە دەرەوەی «عێراق»دا، وە یا دانانی مودیرعامێکی کورد لە وەزارەتێك لە وەزارەتەکاندا ـ بێجگە لە داخلیەکە ئەویش لەبەر ئیشی تایبەتی خۆیان

بووا! ـ ئەمانە لە فەرهەنگی حوکوومەتی پێشووی عێراقا زۆر دەگمەن بوون، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەگەر بەپێی قانوونە ئەساسیەکەی خۆیان بچوونایە بەڕێوە هەموو ئەم مافانەی تێدا بوو بەرانبەر بە کورد!..

سەیرتریش ئەوە بوو هەرجارە کە تەنگ‌وچەڵەمەیەکی دەرەوە، یا ناوەوە ڕووی ئەکردە حوکوومەتەکەیان نووری سەعید و پیاوەکانی نووری سەعید بە شانووەکانی کەرکووك و سولەیمانیدا ئەسووڕانەوە و خەڵکیان کۆ ئەکردەوە و پێیان ئەوتن ئێوە کوردن و لە قانوونی ئەساسیدا هەموو حەقێکتان هەیە. داوای حەقی خۆتان بکەن و پڕ بە دەم هاوار بکەن و بڵێن ئێمە کوردین و حەقی خۆمانمان ئەوێ. ئەمجا کە تەنگ‌وچەڵەمەکەیان بەسەر ئەچوو ئەو کەسەی بیوتایە من کوردم وە یا داوای حەقێکی کوردی بکردایە ئەیانگرت و لە گۆشەی بەندیخانەکاندا توندیان ئەکرد!..

جا سەرباری ئەم هەموو شەپۆل و تەوژمە تیژانە کە ڕوویان ئەکردە قەومی کورد و وەکوو کرمێ بکەوێتە دارەوە و بیەوێ لە ناوی بەرێ، ئەمانەش بەو جۆرە ڕوویان ئەکردە ئەم و ئەیانویست لە ناوی بەرن. سەرباری ئەمانە هەموو، کورد هەر ئاگاداری خۆی کرد و توانی بە ئەندازەی دەسەڵات خۆی لەو شەپۆلانە بپارێزێت و زیاد لە دەسەڵاتیش زمانەکەی بهێڵێتەوە.

بەڵێ ڕۆژهەلاتی‌ناسەکان هەر کەسەیان لەبەر هەر ئارەزوویەك کە هەبووە هەندێ جار دانیان بە ژمارەی کورد داناوە، وە یا هەندێ لە نووسەرانی کورد ئەوانیش لە کتێبەکانیاندا قسەیان هەر لێوە کردووە، بەڵام هینەکانی کورد زۆرتر شوێن قسەی ڕۆژهەلاتی‌ناسەکان کەوتوون، ڕۆژهەلاتی‌ناسەکانیش شوێن پێ ئەو حوکوومەتانە کەوتوون کە کوردیان لەناوایە. هیچکام لەمانە وەنەبێ بە حەقیقەتێکی واقعی توانیبێتیان بگەنە بنج و بناوانەکەی؛ چونکە وەکوو وترا لە لایەکەوە سەرژمارێکی ڕاست و دروست نەکراوە، لە لایەکی‌تریشەوە حوکوومەتەکان نەیانویستووە ـ لەبەر ئەو هۆیانە کە باسکران بیڵێن. بەم بۆنەوە زانینی ژمارەی کورد بە ڕاستی هەر وەکوو مەتەل ماوەتەوە. یەکێ بە سێ ملیۆن، یەکێ بە شەش، یەکێ بە هەشت و یەکێ بە دە ملیۆنی داناون. ئەم دانانی ئەمانیش کە بەم جۆرە ڕۆیشتوون هەر یەکە لەبەر هۆیەکی تایبەتی شەخسی بووە

وەنەبێ هیچیان لەسەر ئەساسێکی واقعی ڕۆیشتبێتن. ئەگەر یەکێ بیەوێ لەم باسە بەتەواوی تێبگا تەماشای «مێژووی ئەدەبی کوردی» عەلائەددین سەججادی بکا.

مایەوە سەر باوەڕ و مەفکوورەی ئێمە لە لایەن ژمارەی کوردەوە، باوەڕی ئێمە هاتە سەر ئەوە کە ژمارەی کورد بەم جۆرەی خوارەوەیە:

لە تورکیادا٦/٥٠٠/٠٠٠

لە ئێرانا٤/٥٠٠/٠٠٠

لە عێراقا٢/٠٠٠/٠٠٠

لە ڕووسیا، بەلووچستان، هیندوستان و سووریادا٢/٠٠٠/٠٠٠

ئەمە تەنها ئەو کوردانەن کە ئێستە بە زمانی کوردی قسە ئەکەن، خۆ ئەگەر ئەوانەشی بخرێتە سەر کە باوك و باپیریان کورد بوون و بە دەربەدەری و ماڵ وێرانی کەوتوونەتە شار و دەشتەکانی بێگانە و ئێستە ئەمان زمانی کوردی نازانن ئەوە ئەبێ ئەو باوەڕە هەبێ کە ئەمانەش کەمتر لە «٣» ملیۆن نین و بە هەمووانەوە «١٨» ملیۆن پڕ ئەکەنەوە. دیسان ئەبێ عەینی باوەڕیش هەبێ کە ئەم ژمارەیە بەلانی کەمەوە دانراوە و لانی زۆری نەگیراوە.[١]

◈◈◈

[١. ئەم ئامارە هی ساڵی ١٩٤٥ی زایینیە. ـ بڵاوکەرەوە.]

# شوێنی کورد

کوردستان وڵاتێکی شاخاوییە، هەتا بەرەو شیمال و ڕۆژهەڵات بڕوا هەر بەرز ئەبێتەوە تا ئەگاتە کێوی «ئارارات». کە ڕووی کردە جنووب و جنووبی ڕۆژئاوا ئەمجا وردە وردە نزم ئەبێتەوە. کێوەکانی شیمال هەموو جەنگەڵستان و شیو و دۆڵن، پڕیانە لە کانی و ئاو و دێهات، کێوەکانی ڕۆژئاوای ـ زیاتر ئەوانەی بەسەر سنووری ئێران و تورکیادان ـ بێ دارستان و بەردەڵانن، ئینجا هەتا بەرەو کوردستانی ڕۆژهەڵات بڕوا دەست ئەکاتەوە بە دارستان.

کێوەکان بە زستانان هەموو سەرپۆشی بەفر ئەدەن بەسەرا، بەهۆی باران و بەفرەوە زۆرتر ڕووبارەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و خواروو لەو پێك دێن. هەموو وڵاتی کوردستان چە، کێو، چە، دەشت پڕیەتی لە «کان»؛ هی نەوت، ئاسن، زیو، زێڕ، گۆگرد، خەڵووزی بەرد، قەڵایی، چیمەنتۆ، پۆڵا، لەحیم، گەچ، قسڵ، دەرماناوی هەمە جۆرە و گەلێ شتی تریش.

کوردستان لەگەڵ ئەوەش کە شاخ و داخە لە پێش هەموو شتێکدا شوێنی کشتوکاڵ و ماڵاتە، بە تایبەتی ئەو شوێنانەی کە هەواکەی سازگارە باخ و بێستان و هەموو جۆرە داری بە بەری تێدایە.

لە کشتوکاڵا ئەمانەی هەیە:

گەنم، جۆ، برنج، پەڕشە، گەنمەشامی، زوڕات، هەرزن، نۆك، نیسك، ماش، کونجی، فاسۆلیا، لۆبیا، توتن، لۆکە، پەتاتە، چەوەنەر، پیاز، سیر و گەلێ شتی تر.

لە میوەدا ئەمانەی هەیە:

ترێ بە هەموو چەشنەکانیەوە، گوێز، سێو، بەی، هەنجیر، هەنار، هەرمێ، قەیسی، قۆخ، بادام، توو، فنق، زەیتوون، هەڵوژە، گێلاس، بلاڵووك، مەویژ، سرینچك، خورما، پرتەقاڵ، لیموو، نارنج و گەلێ شتی تر.

لەماڵاتا ئەمانە بەخێو ئەکەن:

ئەسپ، ئێستر، کەر، گا، گامێش، مەڕ، بزن.

لـه پەلـەوەرا؛ مریشـك، مراوی، عەلی‌شـیش، قاز بەخێو ئەکەن. بۆ ڕابواردنیش کەو، کۆتر، تاوس، باز، ڕائەگرن.

ئەوشتانە کە ئەینێرنە دەرەوە:

توتن، لۆکـە، خـوری، مەرەز، مازوو، بەڕوو، گـزگل، هەنگوێن، گوێـز، مەویژ، بادام، ڕۆن، پەنیر، هەموو جۆرە پێستێك، کەتیرە، گیاسالم، دۆشاو، مۆم، ناوکە کوولەکە، ماڵات و گەلێ شتی‌تریش.

لە ئیش‌وکارا جۆلایی، قاڵی و بەڕەکردن، بووزو، زەڕنگەری، تفەنگسازی، خنجەرسازی، دارتاشی، زیـن درویتـی، وردەکاری، وێنەگەری، نەقارِی و گەلێ شتی‌تر ئەکەن لەگەڵ جووت و گاوگەللەداریدا.

تێکڕا وڵاتی کوردستان ئەم شوێنانەی داگیر کردووە:

لە ڕۆژهەڵاتەوە پاڵ ئەدا بە ئێرانەوە؛ واتە لە خووزستانەوە دەست پێ‌ئەکا بۆ عێراقی عەجـەم و هەمـەدان و زەنـگان و تەوریـز تا ئەگاتـە ڕووباری «ئاراس» لـە قەوقاسـی جنووبـی. لـە ڕۆژئـاواوە ئەگاتـە ئایەنـە و سـیواس و پاڵ ئـەدا بـە ئانادۆڵـەوە. لـە شـیمالەوە ئەگاتـە قەوقـاس و لیـوای لازستان. لـە جنووبـی شـەرقی و جنووبـەوە ڕێـزە خەتێکـە لـە خووزسـتانەوە دێت ئەگاتە کێوی حەمرین و بۆ کێوی سـەنجار لە دەشـتی شام و لەوێوە بۆ گردداغ تا ئەچێتە سنووری ئەسکەندەروونە.

ئەم کوردستانەی کە بەم جۆرە باسکرا ئەبێ بە سێ بەشی گەورەوە:

١ـ کوردسـتانی ڕۆژهەڵات کە ئازەربایجانی ڕۆژئاوا و وڵاتـی «سـنە» و لوڕسـتانی گەورە و بچووکە.

٢ـ کوردسـتانی شـیمالی کـە وڵاتـی خـەرپـووت، دیاربەکـر، وان، بتلیـس، ئـەرزوروٚم، بەشـێ لە وڵاتی سـیواس و ناوچە شـاخاویەکان لە وڵاتی قارس و ئەردەهان، وە قەرەباغ لە قەوقاسی جنووبی.

٣ـ کوردسـتانی جنووبـی کـە وڵاتـی سـولەیمانی، کەرکـووك، هەولێر، مووسـڵ، لەملاوە خانەقی و مەندەلی و بەدرە.

**شارەکانی کوردستان، لە ئێران:** هەمەدان، کرماشان، سنە، سەڵماس، خۆی، زەنگان،

بیجاڕ، كرند، سونگر، قەسری‌شیرین، ورمێ، میاندوواو، سابڵاخ، سەقز، بانە، سەردەشت، شنۆ، بۆكان.

**لە عێراق:** سولەیمانی، هەڵەبجە، پێنجوێن، كەركووك، هەولێر، كۆیە، ڕواندز، ئامێدی، ئاكرێ، زاخۆ، دهۆك، شەنگار، خانەقی، كفری، مەندەلی، زرباتیە، بەدرە.

**لە توركیا:** ماكۆ، بایەزید، دیاربەكر، قارس، ئەرزورۆم، وان، بتلیس، ئەرزنجان، درسم، جەزیرەی ئیبنوعومەر «العەزیز»، مەرعش، ئورفە، ئەخلات، موش، ماردین، خوزات، معدن، باشقەلا.

لە هەرسێكیاندا بێجگە لەمانەش شوێنی‌تر هەیە.

◈◈◈

# ژیانی کۆمەڵایەتیی کورد

کورد دوو بەشن؛ کۆچەری، دێهاتی و شاری. کۆچەرییەکان بەرەبەرە هەر کەم ئەبنەوە و ئەبن بە نیشتەجێ، زەوی و بەراو هی بەگ و ئاغا بوو، جوتیارەکان مسکێنیان پێ ئەڵێن، خۆیان زەوییان نییە مەگەر لە هەندێ شوێنی کەمانەبێ.

کورد زۆر ئازان بۆ جەنگ کردن، ئارەزووی تەواویان لە تفەنگچێتی و ڕاو و شکار هەیە، لەبەر ئەوە هەوای سافیان پێ خۆشە و حەز بە دەشت و دەر ئەکەن، ڕقیانە لە ژێردەستەیی، تەبیعەتیان سەربەخۆیی ئەوێ، کە قسەیەکیان کرد هەر ئەو قسەیە، تەنانەت مەسەلێك هەیە ئەڵێ: «کورد، کە وتی نەء، هەر ئەو نەئەیە». کۆچەرییەکان گەرمیان و کوێستان ئەکەن.

کورد هەمووی موسوڵمانن هەندێ یەزیدی نەبێ کە لە سەر ئایینی کۆنی کورد ماونەتەوە، «فەلە»ش هەیە ئەوانیش هەر خۆیان بە کورد ئەزانن، موسوڵمانەکان هەموو شافیعی مەزهەبن بێجگە لە بەشێکی لای پشتکۆ و لوڕستان نەبێ کە شێعەن. شێخی تەریقەت باوێکی زۆری هەبووە، ئێستە وەکوو جاران نەماوە، ڕقەبەری «سونی» و «شێعە» هەبووە ئێستە ئەو ڕقەبەرییە زۆر کزبووە و دەماری قەومی لە شوێنی دانیشتووە، تێکڕا کورد پایەی قەومی لە هەموو شت بەلاوە گەورەترە، سەید ئەگەر حسابی بکەیت ئەبێ لە نەتەوەی ڕەسووڵ و عەرەب بێت کەچی عەنعەناتی قەومی هەموو شتێکی لەبیر ئەباتەوە هەر کورد ئەزانێ. کوردایەتی لەناو کورددا لە ڕاستیدا لە پێش هەموو شتێکەوەیە، هەرایەك کە لە بەینی دوو تیرە، یا دوو کەسدا پەیدا ببێ سەرۆکەکان ئەیانبڕیەوە، کە دوژمنی خۆیانیان بە زەبوونی دی ئیتر لێ ئەگەڕێن.

کورد ئیشی سووکی زۆر ڕق لێ ئەبێتەوە، نەفسی بەرزە، بەقنیات و بوردەبارە، بۆ پایەی دنیا زەبوونی وەرناگرێت. تێکڕا کورد زیرەك و بەقابلیەتن، زوو فێری زمان و پێشە ئەبن، وڵاتی خۆی زۆر خۆش ئەوێت، تەنانەت خۆی لە سەری ئەدا بە کوشت، ئەگەر بکەوێتە وڵاتی بێگانەش هەر دڵی لای مەڵبەندەکەیەتی، بڕیارێکی دا لەسەری ئەڕوا، با نەشیبێ هەر حەز بە نان بدەیی و بەخشندەیی ئەکا، خزم دۆستە، چەند بەلایەوە

خۆشە کە ئەڵێ «من کوردم»، عاشقی ئەدەب و شیعر و دەنگە، مۆزیقای زۆر خۆش لێ دێت، کە یەکێکیان لێ مرد ئەیلاوێننەوە، لە وەختی گیانەڵا کەیدا ئەو کەسە ئیشی چی بووبێ شتومەکی ئیشەکەی لەلای سەریەوە دائەنێن.

خوێندەواری لەناو کورددا زۆر کەمە ـ مەگەر تۆزێ لەم دەورەی دواییەدا نەبێ ـ ئەم نەخوێندەوارییە شۆڕەییەکی زلی لێ پەیدا کردوون کە هەندێ جار تاك تاکێکی ئەبن بە خۆخۆر!. لەگەڵ ئەم نەخوێندەوارییەشدا زوو فێری شت ئەبن، زۆریش بە تەنگ شوورەییەوەن. بێگانە پەروەریشن ـ غەریب دۆست ـ سەگ ڕائەگرن.

ژن لەناو کورددا بە تێکڕایی پایەیەکی کۆمەڵایەتی هەیە، خاوەن ماڵە، ماڵ و مناڵ بەخێوکەرە، میوان پەروەرە، کە پیاو لە ماڵا نەبوو بەدەم میوانەوە ئەچێت و خزمەتی ئەکا، ئیش‌کەر و کۆچ و بار بەڕێ‌کەرە، شان بە شانی مێردەکەی کۆشش ئەکا؛ لە کۆچ‌کردن، لە جووت، لە کێشە، لە تووتن، لە باخ و ڕەز بەخێو کردن.

ژنی کۆچەرو لادێیی شۆڕەسوار و تفەنگچیشن. ژن لەناو کورددا داوێن پاکە، ئەگەر ئیشی خراپەی لێ ڕووبدا ئەیکوژن، لە هەندێ شوێندا نەبێ ژن سەربەخۆییەکی تەواوی هەیە لە شوو کردندا، دڵداری ئەکا بۆ ئەوە مێردی پێ بکا، ڕەشبەڵەك ئەکەن، وشەی «زنا» لە زمانی کوردیدا نییە، ئەمە ئەوە پیشان ئەدا کە داوێن پیسی لەناویاندا نییە، ژنان لە مازووکردندا، لەلای ڕانەبێرە و لە دەشتا بە دەنگی چریکەی گۆرانی خرۆشێك ئەدەن بە دەشتەکە، پیاوان لە کۆبوونەوەی مزگەوت و بەربەرۆژکەدا داستانی کۆن ئەگێڕنەوە، پابەندی دوو تەریقەی «نەقشی» و «قادری»ن.

◈◈◈

# شۆڕشەكانی كورد

كورد لە لاپەڕەی مێژوویا هەموو دەمێك كۆششی بۆ سەربەخۆیی خۆی كردووە، ئەوەندە هەیە لە پاش ئەوە كە دەوڵەتە بەناوبانگەكەی «ماد»یان سەری تیاچوو، وە لە پاش ئەوە كە دەوری ئیسلامیەت هاتە ناوەوە لەگەڵ ئەو هەموو كۆششەشدا سەربەخۆییەكی ڕاستی بە مەعنای كەلیمە لە مێژوویاندا نابینرێت.

بەڵێ پیاوانی گەورە و ناوداریان چ لە لایەن سیاسەتەوە، چ لە لایەن [عیلم] و زانیارییەوە زۆر، زۆر لێ هەڵكەوتووە، بەڵام ئەوەی مەبەستە ئەوە دەست نەكەوتووە. ئەمەش چەند هۆیەكی بووە..

یەكەم پارسەنگی ئەو دەوڵەتانە كە كوردەكە كەوتبووە بەینیانەوە، دووهەم هەستێكی دینی كە ئەو سەردەمانە باڵی كێشابوو بەسەر هەموو قەومەكاندا كە نابێ كەس لە ژێر ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیەت بچێتە دەرەوە. ئەمەی دواییان ڕۆحێك بوو گەلێ خراپتر و كوشندەتر لە ڕۆحی «ئیستیعبادی» ـ بە تەعبیری ئێستە. ئەو وەختە ئەم ناوە ـ واتە ناوی ئیستیعبادی ـ لەلای هەموو كەس دروست نەبووبوو، تەنها پیاوانی كۆشكەكانی خەلیفەكانی عەباسی و عوسمانی ئەیانزانی. ناوی ئەو سەردەمە ناوی ئیسلامی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلامیەت بیزی ئەهاتەوە لەو باوەڕەی ئەوان چونكە:

**یەكەم:** ڕۆحی قەومی پێچەوانەی ڕۆحی ئیسلامی نییە و بەڵكوو ئیسلام فەرمانی پێ ئەكاو ناوی ئەبا وە بە دینێكی یەكیەتی و هێمنی و ئاسایشی دائەنێ، فەرمانەكانی لەلای خواوە هاتووە و دوژمنێكی هەرەگەورەیە بۆ زۆر و ستەم و فەرماندەرە بۆ ئازادی تاك و كۆمەڵ، تەعالیمی ئیسلام گەلێ بەرزترە لەو شتانە كە ئەوان بۆیان هەڵئەبەست.

**دووهەم:** نە خەلیفەی بە مەعنای كەلیمە لە ئیسلامدا مابوو وە نە پادشایەتیش ئیسلام بە ناوی ئیسلامەوە فەرمانی پێ دابوو. ئەوەندە هەبوو وا دیار بوو ئەوان حەزیان بەوە نەئەكرد كە قەومەكان هەریەكە بۆ خۆیان سەربەخۆییەكیان بێ و ئەم هەمووەش تێكڕا ئاشنای بەیداخەكەی ئەوان بن. واتە بە تەعبیری ئێستە بەلانی كەمەوە ببن بە «فیدراڵی» بەرانبەر بە بەیداخەكەی ئەوان. بەڵكوو هەر ئەوەیان پێ خۆش بوو كە خەلیفە فەرمانڕەوایەكی بێگیروگرفتی ببێ بەسەر هەموو قەومەكانەوە. قەومی كوردیش

یەکێك بوو لەو قەومانە کە وایان لەگەڵ ئەکرا و بەڵکوو زیاتریش.

ئەمجا پارسەنگی دەوڵەتەکانی ئەملا و ئەولا. ئەمانەش حوکوومەتی ئێران و عوسمانی بوون کە بە تایبەتی لە پاش «سەفەوی»یەکان بە ناوی مەزهەبەوە دەستی خۆیانیان ئەوەشان. ئێران بە ناوی شێعەیەتی و عوسمانی بە ناوی سونیەتییەوە کوردیان لەو بەینەدا کردبوو بە بەردی قۆچەقانێ و هەڵیان ئەسووڕاندن!. لەگەڵ ئەمانەشدا کورد لە هەموو دەورەکانیا بۆ ئەو مەبەستەی خۆی هەر خەریك بووە. لاپەڕەکانی دەوری «صلاح الدین»ی ئەیووبی و «کەریم خانی زەند» و پیاوەکانی تریشیان ئەم ناو و نیشانە هەر ئەدەن. ئەوەندە هەبووە - وەکوو وترا - لەبەر ئەو ڕۆحی ئیسلامییەتە کە باڵی کێشابوو بە سەریانا نەیانئەویست ئەو ناوە لە چوارچێوەکەی ئیسلامیەت جیا بکەنەوە.

* * *

لە سەدەکانی حەڤدەهەم و هەژدەهەمدا لەوانەبوو وردە وردە تووی قەومییەت لە مێشکی هەندێ کەسا چەکەرەی کردبوو وە جۆرە کۆششێك ئەکرا، بەڵام ڕۆحی پێشوو هەر لە ئیش کردنا بوو. لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئەو باوەڕە - باوەڕی قەومییەت - بەتەواوی لە گەلێ لە شوێنەکانی کوردستاندا بڵاو بووبووەوە و کۆشش ئەکرا بۆ سەربەخۆییەکی ڕاستەقینەی کورد. لەم دەورەشدا دیسان چڵێسی و قازانج پەرستی ڕۆژئاواییەکان - هی خۆیان - هەر سەری ڕێ پێ ئەگرتن و نەیئەهێشت بگەن بەو ئامانجە. لەگەڵ ئەم هەموو کۆسپانەشدا کورد هەر کۆڵی نەدا و نایدا.

ئەوا لێرەدا سەرەتا بە جۆرێکی تێکڕایی باسێکی ئەو بزووتنەوانە ئەکەین کە لە ناو کوردا ڕوویان داوە، پاشان یەکە یەکە شۆڕشەکانی ئەم دەورەی دواییە ئەخەینە پێش چاو بۆ ئەوە هەموو کەسێك بزانێت کە ئەم قەومی کوردە چی بەسەر هاتووە و چۆن لە پێناوی وەرگرتنی سەربەخۆیی خۆیدا هەمیشە لە جەنگا بووە؟.

([1] لەو وەختەدا کە ئەمەوی و عەباسی لە ئارادا بوون کوردەکان لە لەشکرەکانیانا

---

١. و. جی ئیلفنستن لە بارەی کوردەوە شتێکی لە گۆڤاری «ئەنتەرناشنال ئەفیزر»ی ژمارە ١٩ ساڵی (١٩٤٧)دا نوسیبوو، ماموستا عەبدولقادر حشمت وەری گێڕابووە سەر کوردی. هەروەها ژمارەکانی گۆڤاری «گەلاوێژ»ی ساڵی (١٩٤٦)یش لە نووسینەکانی دەبلیو.جی. ئیلفنستن لە «ئەنتەرناشنال ئەفیزر»ەوە شتی وەرگرتبوو. ئەم باسە کورتکراوەی ئەو نووسینانەیە.

خزمەتی گەورە گەورەیان پێ ئەکردن، ئەوانەی کەوا لە لەشکرەکەی ئەوانا بوون ئیشیان بۆ ئەکردن، لەم لاشەوە ئەو کوردانەی کە لە خاکی ئێراندا بوون گەلێ جار یاخی ئەبوون و هەرایان ئەنایەوە، لە دەورەی ئیسلامیدا تا ئێستە وەنەبێ پادشایەك لە کوردەکان بینرابێ کە حوکمڕانی هەموو وڵاتی کوردستانی کردبێ، بەڵام گەلێ جاری وابووە کە هەندە خێزانێك هەڵکەوتوون و ناو بە ناو حوکمیان لە هەندێ ناوچەکانی کوردستانا کردووە، وەکوو یەکێ لە حوکمدارەکانی «حەسەناوایی» کە لە «٩٥٩» تا «٩٧٩» میلادی لە جنووبی چیای بیستووندا حوکمی کردووە، هەروەها حوکمدارەکانی «دیاربەکر» و «ئورفە» لە «٩٤٠» تا «١٠٩٦» سەربەخۆییەکی باشیان نواندووە و پاشان سەلجووقییەکان دوایيان پێ هێناون. بەناوبانگترینی کوردەکان ئەیيووبییەکانن کە لە «١١٣٧»دا «صلاح الدين»ی گەورەیان تیا هەڵکەوت و بوو بە پادشایەکی بەناوبانگ.

لە سەدەی شازدە و هەڤدەهەمدا کوردستان مەیدانی سەفەوی و تورکەکان بوو، لەو شەڕەشەقەی ئەوانا خۆراوای وڵاتەکەیان بەر تورك و خۆرهەڵاتی بەر ئێرانیەکان کەوت و تا ئێستە هەروا ماوەتەوە.

ئەو سنوورەی کە لە لایەن سوڵتان مورادی چوارەم و شاعەباسی سەفەویەوە لە «١٦٣٩»دا لە بەینی کوردەکانی ئێران و تورکیادا دانرابوو تا «١٨١٣» مایەوە. لەبەر ئەو خزمەتانە کە کوردەکان لە شەڕ و شۆڕی بەینی تورك و ئێرانا لە لەشکری عوسمانیدا ئەیاننواند ئیمپراتووریەتی عوسمانی ڕێزێکی باشی لێ ئەگرتن. هیچ ناخۆشیەك لە بەینا ڕووی نەدابوو تا سوڵتان مەحموودی دوهەم لە «١٨٣٠»دا دەستی کرد بە پەلاماردانی کوردەکان و ئیتر ئیش وردە وردە تێکچوو.

لەم وەختە بە دواوە کوردەکان لە دوولاوە دەستیان کرد بە جووڵانەوە؛ لە لایەکەوە موحەممەد پاشای ڕواندز لە ڕۆژهەڵاتەوە، لە لایەکەوە بەدرخان پاشای بۆتان لە ڕۆژئاواوە، موحەممەد پاشا هەولێر و مووسڵی داگیر کرد و بەدرخان پاشاش لە دیاربەکر و سعرد ڕەگی خۆی داکوتا، تورکەکان ئەو سەردەمە لەبەر لێشاوی هێزی میسرییەکان لە ژێر فەرماندەیی «ئیبراهیم پاشا»دا هیچ نەیانپەرژایە سەر کوردەکان. لە «١٨٤٧»دا، کە تورکەکان ترسی میسرییەکانیان لە کۆڵ کەوت بایان دایەوە سەر کوردەکان، بەدرخان

پاشا لە پاش شەڕێکی زۆر بەدیل گیراو نێردرایە دوورگەی «گریت» پاشان هەر لەسەر قسەی تورکەکان و لەسەر ڕەزامەندی ئەوان هاتە «شام» لەوێ مایەوە تا لە ساڵی «١٨٦٨»دا کۆچی دوایی کردو ئەو گیانی نیشتمانپەروەرییە کە ئەو لەناو کوردەکانا بڵاوی کردبووەوە هەر مابوو، بۆیە کوردەکان لە «١٨٥٠» تا «١٨٥٣» هەر شەڕ و شۆڕیان بوو بۆ سەندنی سەربەستی خۆیان.

لە پاش شەڕی «قریم» تا جووڵانەوەی شێخ «عبیداللە»ی شەمدینان بەینی تورك و کورد باش بوو، «شێخ عبیداللە» دەوروبەری دەریای «ورمێ» داگیر کرد، هەرچەند لە دەورەی تەورێزدا قونسولی ڕووس و ئینگلیز پێیان وت کە خۆی بکێشێتەوە کەڵکی نەبوو، لە ئاخرا لەشکری ئەویش شکا و خۆیشی گیرا و نێردرایە «مەککە» ئەویش لە «١٨٨٣»دا لەوێ کۆچی دوایی کرد.

لە «١٨٩١»دا سوڵتان عەبدولحەمید بەرانبەر بەهێزی ڕووس لە کوردەکان لەشکرێکی ڕازاوەی دروست کرد و لە ژێر فەرماندەیی «ئیبرایم پاشای» «وێران شاری»دا ناوی نایە «لەشکری حەمیدیە»، ئەم لەشکرە زۆربەی تفەنگچییە ئازاکانی کوردی تیابوو. ئەم لەشکرە لە جەنگێکی گەورەدا کە لەگەڵ شومرەکانا کردیان سەرکەوتن، لە تۆڵەی ئەم سەرکەوتنەدا سوڵتان، ئیبرایم پاشای بە چوارسەد سوارەوە بانگ کردە ئەستەمۆڵ ڕێزێکی تەواوی لێ گرتن و ناوی پاشایەتیشی دا بە «ئیبرایم پاشا»، پاشان گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی. کاتێ کە لە «١٩٠٨»دا تورکەکان لە سوڵتان هەڵگەڕانەوە ئیبرایم پاشا بە «٥٠٠» سوارەوە پەلاماری «شام»ی دا و بە ناوی سوڵتانەوە شامی گرت، پاشان لە لایەن تورکە یاخییەکانەوە لە «شام» دەرکرایەوە، لە گەڕانەوەدا شومرەکان ڕێگەیان پێ گرت و لە پاش شەڕێکی زۆر لەو شەڕەدا کوژرا.

لەپاش کوژانەوەی شەڕی شێخ «عبیداللە»، بەتەواوی سەودای کۆمەڵایەتی و کوردایەتی چووە سەر ئەو گەلە لاوانەی کوردەوە کە لە ئەستەمۆڵ و دەرەوەی پێ‌گەیشتبوون. لە پاش بڵاوکردنەوەی مەشرووتییەت لە «١٩٠٨»دا، کوردە بەناوبانگەکانی دەرەوە ـ کە، بۆ کوردایەتی ئیشیان ئەکرد ـ لە لایەن تورکە گەنجەکانەوە ئیزن دران بۆ ئەوە بگەڕێنەوە بۆ ئەستەمۆڵ، لەوێ کۆمەڵێکی قەومی دروست کرا، کوردەکان بەرانبەر بە

چەند پەیمانێك یارمەتی ئەو کۆمەڵەیان دا، پاشان کە تورکەکان ئیشی خۆیانیان بنج بەست کرد کەوتنە سەر ئەوە کە پەیمانەکانی خۆیان بەجێ نەیەنن و کەوتنە سەر ئەوەش کە کوردەکان لە ناوبەرن، تەنانەت حوکمی خنکاندن درا بە سەر «شەریف پاشا» و «ئەمین عالی بەدرخانا»، بەڵام ئەمان زوو پێیان زانی و خۆیانیان دەرباز کرد. هەرچەندە تورکەکان ویستیان لە «١٩١٢»دا سەرلەنوێ بناغەی دۆستایەتی لەگەڵ کوردەکاندا دامەزرێننەوە بەلام بێسوود بوو، چونکە لە هەرای بۆتانا «سلیمان بەگی بەدرخان» لە لایەن پۆلیسی تورکەوە کوژرا و دۆستایەتی هەڵوەشایەوە.

لە جەنگی «١٩١٤» تا «١٩١٨» کوردەکان گەلێ جار لەناو لەشکری تورکا بۆ سەرکەوتنی تورك شەڕ و کۆششیان ئەکرد، لە ئاخرا کۆمەڵی نیشتمانی کورد لەگەڵ ڕووسەکان ڕێككەوتن و یارمەتی ئەو لەشکرەی ڕووسیان ئەدا کە بەرەو بتلیس و ئەرزنجان ئەهاتن، ئەمەشیان بۆ ئەوە کرد کە گۆیا لە ئاخرا کورد سەربەستی دەست کەوێ، کە ڕووس شکا ئەم پیلانەش تێکچوو.

ئەمجا لە (١٩١٨)دا هەر ئەم کۆمەڵی نیشتمانییە لە ئەستەمۆل لەگەڵ دەوڵەتە یەکگرتووەکانا چاویان کەوت بە یەك و شەریف پاشا هەڵبژێردرا کە بچێت لە کۆنگرەی ئاشتیدا داوای حەقی کورد بکا. لە لایەکیتریشەوە کامیرانبەگ و جەلادەتبەگ کوڕانی ئەمین عالی بەدرخان پاشا و ئەکرەم بەگی کوڕەزای جەمیل پاشای دیاربەکر لەسەر قسەی ئینگلیز نێردران بۆ لای ڕۆژهەلاتی ئەنادۆل بۆ ئەوە فیکری کوردایەتی لە کوردەکانی ئەو ناوەش بگەیەنن. بەلام ئەمانە لە لایەن مستەفا کەماڵەوە بەر پەرچ درانەوە و چوونەکەیان سەری نەگرت، ئەوەندە هەبوو ئەم جووڵانەوەیەیان بوو بە هۆی ئەوە کە بەندەکانی «٦٢، ٦٣، ٦٤» بۆ لایەنگیری کوردەکان بخرێنە ناو پەیمانی «سیڤەر»ەوە. بەلام ئەو هیوایانە کە بەم بەندانەی پەیمانی سیڤەر هەبوو بۆ کوردەکان هەمووی لە پەیمانی «لۆزان»دا بە بادا درا و شتێك نەمایەوە کە کوردەکان دڵیان پێ خۆش بێ.

مستەفا کەماڵ هێشتا خۆی نەگرتبوو، بۆ ئەوە کە کوردەکان تەفرە بدا پێی وتن ئەگەر بێت و جێگیر ببی، ئێوە بە بێگومان سەربەخۆییتیان دەست ئەکەوێ. ئەمانیش لەبەر ئەم قسەیە دەنگێکی وایان نەکرد. بەلام پاش ئەوە کە یوونانیەکانی لە «ئەزمیر»

دەرپەڕان و زانی، ئەوا ئیتر بنجی خۆی داکوتا، کەوتە دوژمنایەتی لەگەڵ کوردەکانا، ئیتر لە (١٩٢٣)وە هەرا لە بەینی کوردو تورکا دیسان دەستی پێ کردەوە.

ئەوە ئەوان لەوێدا، لەم لاشەوە شێخ سەعیدی پیران لە (١٩٢٥)دا بە دەستیاری کوردەکانی سووریە ئاگری شەڕیان هەڵگیرساند، لەشکری تورك لە ڕێگای شەمەندەفەری حەڵەب ـ بەغداوە بۆیان هات، پاش شەڕ و شۆڕێکی زۆر کوردەکان شکان بەڵام نەیانتوانی ڕۆحی کوردایەتی و نیشتمانپەروەری لە ناویاندا نەهێڵن، هەر لەبەر ئەمە بوو کە گەلێ لە کوردە خوێن گەرمەکان هەڵاتن بۆ سووریە و لەوێ هەستی کوردایەتیان ئەوەندەی‌تر بزواند. لە (١٩٢٧)دا لە «بەیروت» کۆبوونەوە و کۆمەڵی «خۆی بوون»یان دامەزراند، ئامانجی کۆمەڵ سەربەستی و ئازادی کورد بوو. هەروەها فیکریشیان وابوو کە لەگەڵ ئەرمەنیەکان بۆ سەربەستی کوردستان پێکەوە کۆشش بکەن و یارمەتی کوردەکانی تورکیا بدەن. جەلادەت بەگ بەدرخانیان کرد بە سەرەکی کۆمەڵ.

ئەم ئامانجە ـ کە ئازاد کردنی کوردستانی گەورە بێ ـ کوردەکان و ئەرمەنیەکان لە (١٩١٢)ەوە کۆششیان بۆ ئەکرد، بەڵام کوشتاری ئەرمەنیەکان و هەڵگیرساندنی جەنگی گەورەی یەکەم تۆزێ دووریانی خستەوە، لە (١٩١٨)دا دیسان یەکیان گرتەوە و کەوتنەوە قسەکردن شەریف پاشای نوێنەری کورد و «بوغوس نەوبار پاشا» سەرکردەی ئەرمەنیەکان لە «ڤەرسای» پێکەوە شان بە شانی یەك دەستیان کردەوە بە ئیش.

لە (١٩٢٧)دا لە شاخەکانی «ئارارات» کوردەکان کەوتنەوە کار، سێ ساڵ جەنگی کورد و تورك درێژەی کێشا، فەرماندەری لەشکری کورد لە ژێر چاودێری «ئیحسان نووری پاشا»دا بوو. لە مارتی (١٩٣٠)دا تورکەکان فیرقەی چوارەم و شەشەمیان بە هێزێکی گەورەی ئاسمانیەوە نارده سەریان، ماوەیەکی باش جەنگ لە بەینیانا درێژەی کێشا، کوردەکان شەڕێکی مەردانە و ئازادی‌یان ئەکرد، لە ئاخرا لەبەر ئەوەکە هێز و چەکی تورکەکان گەلێ زۆرتر بوو، إحسان نووری پاشا بە ناچاری بڵاوەی بە لەشکر کرد و خۆی بە ناوی پەنابەرێکی سیاسیەوە چوو لە «تاران» دانیشت و ئێستەش هەر لەوێیە.

لە کانوونی دووهەمی (١٩٢٧)دا لە تورکیا قانوونێکی تازە بۆ ئاوەکی و بە تورك کردنی کورد دەرچوو، خەڵکی «دەرسیم» کە تا ئەو حەلە بە کش‌وماتی دانیشتبوون لەم قانوونە

شڵەژان، لە گەلێ شوێن کۆبوونەوە، پاشان سێ کەسیان هەڵبژارد و نامەیەکیان دانێ بۆ لای حاکمی عەسکەری کە ئەم قانوونە هەڵبگرن و واز لەو فیکرە بێنن. ئەم سێ کەسە کە ئەگەنە دەرسیم لە لایەن حاکمی عەسکەرییەوە ئەکوژرێن. کوژرانی ئەمانە بە تایبەتی کارێکی زۆری کردە سەر دڵی کوردەکان و ناچار کەوتنە خۆیان، سەرەتا قافلەی ئوتومبیلێکی زۆری پۆلیسی تورکیان گرت، ڕووتیان کردنەوە و کوشتارێکی زۆریشیان لێ کردن. ئەمجا ئیتر شەڕ و شۆڕی «دەرسیم» بەتەواوی دەستی پێ کرد، هێزێکی زۆری تورك لەو ناوە کۆبووەوە و لە مارسی ئەو ساڵەدا بەڕێ کەوت. ئەم هەرایەش زیاتر لە ساڵێك درێژەی کێشا و کوشتارێکی زۆر لە هەر دوولا پەیدا بوو، لە ئەنجامدا کوردەکان شکان و گەلێ دێهاتیان سوتێنرا. لەگەڵ ئەم هەموو کوشتار و دەربەدەرییەشدا کە بەسەر کورددا هاتووە هەستی کوردایەتیان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتری کردووە.

لە پاش ماوەیەك «جەلال بایەر» ئەیوت: ئیتر کورد لە وڵاتی تورکیادا نییە و ئەوەش کە هەبێ تورکی شاخین!. ئەمەیە ئاوێنەی سیاسەتی تورکەکان بەرانبەر بە کوردەکان!.

❋ ❋ ❋

لە ئاخر و ئوخری سەدەی نوزدەهەما ڕووسەکان بە هەموو جۆر خۆیان لە کوردەکانی ئەو ناوە نزیك ئەکردەوە، لە ساڵی (١٨٧٦)دا کوردەکان لە قارس و ئەردەهان شان بە شان لەگەڵ ڕووسەکانا شەڕیان لەگەڵ تورکەکانا ئەکرد، کە جەنگی یەکەم هەڵگیرسا ڕووسەکان لە دەوروپشتی «ورمێ» دەستیان کرد بە جووڵانەوە، «سمکۆ» و «سەید تاها» و گەلێ کەسی تریان کرد بە لایەنگیری «چار».

لە پاش پەیمانی «لۆزان» زیاتر لە بیست هەزار کوردێك کەوتنە بەر «کۆمار»ەکانی سوفیاتی، بە هەموو جۆر بۆ یەکیەتیەکی نیشتمانی چاوێریان ئەکردن، زمانی کوردی لە قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەندیدا ئەخوێنرا، هانە هانەیان ئەدرا بۆ زیندوو کردنەوەی هەموو چەشنە ڕەوشتێکی قەومی. تەنانەت ئەو هەست و شعووری قەومی و کۆمەڵایەتیە کە کوردەکانی ئەوێ بە هۆی ڕووسەکانەوە وەریان گرتبوو پڕیشکیشی پەڕی بۆ ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆل و جەزیرە و بۆتان. تورکەکان بۆ بەربەستی ئەم لێشاوی باوەڕە زۆر کەوتنە پەلەوە، بەڵام هیچ کەڵکێکی نەبوو بۆیان.

لە ساڵی (١٩٤١)دا کە ڕووسەکان چوونە ئێرانەوە گەلێ هەوڵیان دا کە، ڕووی کوردەکانی ئەو ناوە بکەنە خۆیان، وە کوردەکانیش لەو دەرفەتەدا ئێجگار ئومێدی ئازادی و سەربەخۆییان هەبوو، ڕووسەکان ئەوەیان کرد بەڵام لە ئاخردا سەری نەگرت و هەر حوکوومەتی تاران گرەوی بردەوە.

سیاسەتی پاشەڕۆژی ڕووس هێشتا نەزانراوە بەڵام بەبێ پشوو هەموو دەمێك تەقەلای ئەوە ئەدا کە سنووری کۆنی خۆی لەگەڵ تورکیادا بگۆڕێ، لەم گۆڕینی سنوورەدا ئەگەر ڕێككەوێ گەلێ لە خاکی تورکیا ـ کە زۆرتری کوردنشینە ـ ئەکەوێتە ناو ڕووسەوە. هەر جۆرە دەستکارییەك لە سنووری تورکیادا بکرێ و هەر شتێك ئەو سنوورە بگۆڕێ کوردەکان لە ژێر چنگی تورك ڕزگاریان ئەبێ و بۆ سەربەخۆیی و ئازادی ئامادە ئەبن.

هەرچەندە کە سەرۆکی عەشیرەتەکان ترسیان لە بڵاوبوونەوەی شیوعیەت هەیە لە ناو عەشرەتەکەیانا و بڵاوبوونەوەی شتی واش کزبوونی دام و دەزگای ئەوانە، بەڵام مادام تورکەکان هەر لەسەر ئەو لاسارییە ئەڕۆن کە ئەڵێن کورد لەناو ئێمەدا نییە و ئەیانەوێ کوردەکان بکەن بە تورك، سەرۆکی عەشیرەتەکان ئەوەیان هەر پێ خۆشترە کە لەو خەتەرەیە ڕزگاریان ببێ با بکەونە بەردەستی کۆماری سۆڤیاتی، وە یا دام و دەزگای خۆیشیان کەمتر ببێتەوە.

پاشەڕۆژی سیاسەتی کورد پێویستی بە گەلێ شتە، هەرچەندە تورکەکان ئینکاری بوونی کورد ئەکەن لە وڵاتەکەیانا بەڵام ئاشکرایە کە جووڵانەوەیەکی بەهێز بۆ سەربەستی و ئازادی کورد لە کایەدایە. هەڵتووەکانی «سووریە» پێشڕەو و سەردەستەی جووڵانەوەی نیشتمانپەروەرین، زۆرتریش ئەوی کەوا ئەکا بە کوردەکان بۆ ئەم جۆرە بزووتنەوانە کەساسیی کوردەکانی تورکیایە وایان لێ ئەکا کە هانیان بدا، ڕەنگە بەرەبەرە پەیوەندی و ئاشنایەتیش بۆ ئەم ڕزگاربوونە لەگەڵ کوردەکانی عێراق و ئێرانیشا پەیدا ببێ.

❋ ❋ ❋

ئەو کوردانەی کە لە سووریادان بە هۆی حوکمی زۆرداری و قەرەقوشی «فرانگلن ـ بالون» کە لە بەینی فەرەنسە و تورکیادا لە ئەیلوولی (١٩٢٩)دا ڕوویدا و خەتی شەمەندەفەری حەڵەب ـ بەغدای لە سنووری سووریەوە بەست بە تورکیاوە و گەلێ

لە کوردەکان کەوتنە ژێر ئیدارەی سووریا، ئەم پەیمانی ساڵی (١٩٢٩)یە بە پەیمانی «ئەنقەرە» بنج بەست کرا، گەلێك لەو کوردانە کە لە دەوروبەری ئەو ڕێگەیەدا بوون کەوتنە بەر سووریا و بەشە زۆرەکەی لە ژێر ئیدارەی تورکیادا مایەوە، بێجگە لەمەش هەندێکی تر کورد لە شاخەکانی ژوور حەڵەبەوە هەن کە سێ سەد ساڵێك ئەبێ لە شاخەکانی تورکیاوە کۆچیان کردووە و لەوێدا ئەژین. لە پاش ئەوە کە حوکمی فەرەنسە لە سووریەدا دامەزرا ئەو ناوە بوو بە شوێن هەوارێکی حەسانەوە بۆ کوردە هەڵاتووەکانی تورکیا و تەنانەت بوو بە ناوچەیەکی بەکەڵك بۆ کوردپەرستەکان.

دەرچوونی فەرەنسە لە سووریە و لوبنان و سەربەخۆیی عەرەبەکانی ئەو ناوە جۆرە دڵخۆشیەکی لەناو کوردەکانی ئەوێدا پەیدا کرد، هەرچەندە کوردەکان ئەیانتوانی لەو دەرفەتانەدا دەست بکەن بە جووڵانەوە و دراوسێ عەرەبەکانیان بخەنە نارەحەتییەوە بەڵام نەیانکرد و بە پێچەوانەی ئەوە خۆیان لە عەرەبەکان نزیك خستەوە و ناوچەی دۆستایەتیان فراوانتر کردەوە. ئەو کوردانە کە بۆ کۆمەڵی نیشتمانی لە سووریەدا هەڵبژێردران بە پوختی ئیشی خۆیانیان بەجێ ئەهێنا، لەناو ئەو خێزانە عەرەبیانەی کە ئیشی گەورەیان بە دەستەوە بووە و هەیە خێزانی «بەرازی»یەکانن کە لەمانەش «حوسنی بەرازی» سەرەکی حوکوومەتی سووریە بوو.

❋ ❋ ❋

لە پاش ئەوە کە «شێخ سەعیدی سولەیمان [حەفید لە مووسڵ] کوژرا ئاژاوە لە سولەیمانی پەیدا بوو، لە (١٩٠٩)دا ئەو ئاژاوەی کوژرانی ئەوە دوایی هات. کوردستانی عێراق کش ومات بوو، لە (١٩١٨)دا ئینگلیز چوونە سولەیمانیەوە، شێخ مەحموود بۆ سەربەخۆیی کورد ئەم چوونەی پێ خۆش بوو پێشوازی کردن، ئینگلیز لە پاداشی ئەو چاکیەدا کردیان بە حوکمڕانی کوردستانی جنووبی، زۆری پێ نەچوو لەگەڵ ئینگلیز تێکچوو و لە شەڕێکی قارەمانانەدا لە دەربەندی «بازیان» لەبن «بەردە قارەمان»ەدا بە بریندار‌ی بە دیل گیرا و نێرایە هیندوستان. لە (١٩٢٢)دا هێنرایەوە و دیسان بووەوە بە حاکمی وڵاتەکەی، زۆری پێ نەچوو سەر لەنوێ لەگەڵ ئینگلیز تێکچووەوە و کەوتە بزووتنەوە، ئیتر هەموو جار لە لایەن عەسکەری لیوی و هێزی تازەی عێراقەوە ڕاو ئەنرا،

له (١٩٣٢)دا به جارێك هێزی هەوایی و سەرزەوی عێراقی تەنگیان پێ هەڵچنی و بە ناچاری خۆی دا بە دەستەوە و برایە شارەکانی جنووبی عێراق، لە پاش ماوەیەك وازیان لێ هێنا کە بچێتەوە لە لادێکانی خۆی دانیشێ.

کە چووەوە دیسان دەستی کردەوە بە بزووتنەوە و ئەمجارەش گیرایەوە و هێنرایە بەغدا. لە هەرای ڕەشیدعالیدا لە (١٩٤١) لە بەغدا خۆی دەرباز کرد و چووەوە بۆ سولەیمانی، گەلێ خەریك بوو کە ئاغە و عەشایر و پشدەرییەکان بکا بە لاینگری خۆی کەڵکی نەبوو، پاش ئەوە کە ئینگلیز بەغدای گرتەوە دنیا کش‌ومات بوو و پێویست نەبینرا کە کوردەکان بە هیچ بارێکدا بجووڵێنەوە!..

لە (١٩٣٢)دا شێخ ئەحمەدی بەرزانی دەستی کرد بە جووڵانەوە، هەتا ئەهات بە هێزتر ئەبوو، تەنانەت فەوجی عەسکەریی بە جۆرێ ئابڵۆقە دا لەوانەبوو خۆیان بدەن بە دەستەوە، هێزی هەوایی ئینگلیز فریا کەوت و ڕزگاری کردن، پاشان هێزی سەرزەوی عێراقی و هەوایی ئینگلیز بە جارێ پەلاماری بەرزانییەکانیان دا، شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفای برای و گەلێ لە دەست‌وپێوەندیان بە ناچاری خۆیانیان دا بە دەستەوە و ئەمانە نێردرانە سولەیمانی بۆ دانیشتنی ئیجباری. ئەمانە لەبەر لەبەد کردەوەیی حوکوومەت و دەست‌وپێوەندی حوکوومەت بە جارێ بە تەنگ هاتن، لە ئاخردا مەلا زنجیری دیلی پچڕی و گەڕایەوە ناو کەس و کار و عەشرەتەکەی، لەوێوە لەگەڵ حوکوومەت کەوتە قسەکردن و نامە ناردن، هێشتا کە ڕێك نەکەوتبوون شەڕ لە بەینی پۆلیس و دەستەی مەلادا دامەزرا، لەشکرێکی زۆری نێردرایە سەر، پاشان ڕێك‌کەوتنەوە، شێخ ئەحمەدی برای و پیاوەکانی‌تری بەرەڵا کران، قسەیان درایە کە میری ئەمجا باشتر تەماشایان بکا و لە ڕووت و قووتی و برسێتی ڕزگاریان بکا و وەکوو خەڵکەکەی‌تر بەرگ و نان و شەکر و چاییان بەسەردا دابەش بکا، ئەمەش وەختێك بوو کە گرانی جەنگی دووهەم لە (١٩٤٣) بە دواوەدا کەوتبوو، بەڵام ئەمانە هەمووی قسە بوون و هیچیان بە ئەنجام نەگەیاند و دیسان هەرا لە بەینی حوکوومەت و بەرزانا دەستی پێ کردەوە.

لە شەڕی گەورەی ٩١٤-٩١٨ ئێران زۆر کز و لاواز بوو، هەرکە لە لایەکەوە سەری تێ ئەکرد، کوردەکان ویستیان لەم کاتەدا هەلێك وەرگرن، «سمایل ئاغا»ی سمکۆ لە

(١٩١٨) تا (١٩٢٢) لەو وڵاتانەدا پەلوپۆی خۆی بڵاو کردەوە، لەولاشەوە «جافرسان» هەورامان و مەریوانی بۆ خۆی داگیر کرد. ئەمجا لە (١٩٢٢)دا «ڕەزاشا»ی پەهلەوی لە ئێران سەری هەڵدا و دەستی کرد بە وڵات تەخت کردن، سمکۆ تا هشت ساڵ دەوری ئەگێڕا، لە (١٩٣٠)دا لە سەر قسەی ئێرانییەکان و ڕەزاشا بۆ ڕێككەوتن بانگ کرایە «شنۆ» و لەوێدا کوشتیان.

ئەمجا «ڕەزاشا» کەوتە ئەو وڵاتەوە هەموو سەرکردەکانی کوردی گرت و هەریەکەی ناردنە شوێنێك و ماڵ و منالێشیانی تەفر و توونا کرد و ڕێگەی ئۆتۆمۆبیلی بردە وڵاتەکەیانەوە. کاربەدەستە ئێرانیەکان بەرامبەر بە کوردە بێ سەرداره کەساسەکان زۆر دڵڕەقی و ناپیاوەتیان ئەنواند، ئەمەبوو بە هۆی ئەوە کە کوردەکان هەموو هووشیار ببنەوە. کە ڕووس و ئینگلیز لە (١٩٤١)دا چوونە ئێرانەوە دیسان حوکوومەتی ئێران بێدەسەڵات مایەوە، کوردەکان ئەو عەسکەر و پۆلیسانەی ئێران کە کەوتبوونە بەشی ڕووسەوە هەموو تفەنگ و فیشەکەکانیان لێ سەندن و دیسان خۆیانیان بوژاندەوە، سەرکردە گیراوەکان ـ کە لە تاران و شارەکانیتر بوون ـ هەموو گەڕانەوە ناو کەس و کاری خۆیان و ئیش و کاریان گرتەوە دەست. «حەمە ڕشیدخان»ی بانە وڵاتی بانە و سەردەشت و مەریوانی بۆ خۆی داگیر کرد.

هەرچەند حەمە ڕەشیدخان یاخی بوو و سەرهەنگ ئەمینیی لە سەقز کوشتبوو بەڵام حوکوومەتی ئەو وەختەی ئێران لەگەڵ ئەمەشا هەر مانگانەیەکی بۆ بڕییەوە و کردی بە حاکمی وڵاتەکەی، لە پاشا لەگەڵ مەحموودخانی کانیسانان ـ کە ئەویش حاکمی مەریوان بوو ـ تێکچوو، مەحموودخانیش بە لەشکر و سوپای ئێرانەوە هێرشی بردە سەر و لە ئێران دەری پەڕاند و کردی بە دیوی عێراقا. دیسان ئێران هەر بە یارمەتی کوردەکان وڵاتی کوردەکانی داگیر کردەوە ـ کە ئەمەش تەنیا بە هۆی ناکۆکی ناو خۆیانەوە بوو نەوەك بە هۆی هێزی لەشکری ئێرانەوە.[١]).

١. کورتەی هەر دوو باسەکەی «و. جی ئیلفنستن» کە لە گۆڤاری «ئەنتەرناشنال ئەفیرز» و «گەلاوێژ»دا بڵاو کرابووەوە دوایی هات.

## قەومییەت

کاروباری کورد نەوەك لەو ڕۆژەوە کە ڕۆژئاواییەکان پێیان کەوتۆتە ئەم وڵاتە، بەڵکوو گەلێ لە پێش ئەو ڕۆژەشەوە هەر وەکوو گرێ دراوێکی گرێ کوێرە وابووە!. دوور نییە چە خۆیان وە چە غەیری خۆیشیان لەم کەین و بەینە سەریان سڕمابێ؛ غەیری خۆیان سەریان سڕماوە چونکە وڵاتەکەیان و پارسەنگی وڵاتەکەیان لە هەموو دەورێکدا کۆسپی هێناوەتەڕێی دروست بوونی ئیشیان، بە تایبەتی لە پێش ڕۆژئاواییەکانا دەوڵەتەکانی عوسمانی و فارس هەر یەکە لە ترسی یەك، بۆ ئەمە قووت نەدرێ ئەم کۆسپەیان بە بەشکراوی لە بەینا هێشتۆتەوە، کە ویستبێتیان بچن بە گژ یەکدا سەرەتا کوردەکانیان کردووە بە پێشمەرگە و داویانن بە گژ ئەوانیتردا، بەو ماوەیە کە خەریکی کوژران و لەناو بردنی ئەمان بوون ئەوان بۆ خۆیان ڕێك کەوتوونەتەوە و هەر یەکە لە شوێنی خۆیان دانیشتوونەتەوە و ئەمانیان هەر بەو بەشکراویە بۆ جارێکیتر هێشتۆتەوە!.

کە ڕۆژئاواییەکانیش چنگیان کەوتە ئەم وڵاتانەوە ئەوانیش وەکوو پێشینەکان لەبەر پاراستنی کاروباری خۆیان لەو حوکوومەتانەدا ـ کە کوردیان تێکڵاون ـ کوردەکانیان هەروا بەو پارچە پارچەییە هێشتۆتەوە، بۆچی؟. بۆ ئەوە هەر جارە ئەگەر ئەو حوکوومەتە کە ئەو دەستی خستۆتە جەرگیەوە و کوردیش لەوێدا ئەژی هات و ملەپێچیەکی کرد لەبەر، بە ئەنجام گەیاندنی کاروبارەکەی ئەوا، ئەو بە کوردەکان بیانترسێنێ، ئەمجا، کە ئیشی بۆ چووە سەر چەپۆکێ بماڵێ بەسەر کوردەکەدا پێ بڵێ داکەوە بۆ خۆت حەقی ئەوەت نییە بژیت!..

ئەمجا خۆیشیان ـ واتە کورد ـ سەریان لە کاروباری خۆیان سڕماوە چونکە ئەم ئاشە بە تەنوورەیە لە دەورەیانا یاری کردووە و وەکوو توونی بابە عەمرە هەر ئەڕۆن و کەچی گڕ هەر دێنەوە شوێنەکەی خۆیان!. ئەگینا وەنەبێ ئەمانیش فیکری ئەو ڕزگار بوونەیان نەکردبێ.

ئەو دەورانە کە وا سەربەخۆیی و ئازادی بۆ قەومەکان دروست ئەکەن سەرەتا دەورەیەکن پێچەوانەی ئەو ڕێگە و شوێنە کە بۆیان دائەنرێ، باوەڕی ئازادی بۆ قەومێك وەنەبێ لە مێژووی سەرەتاو ناوەڕاستی قەومەکەدا وەکوو یەك وابێ، بەڵکوو

سەرەتا لە حوکمێکی فەردیەوە بۆ خۆشویستنی فەردی هەڵئەقوڵێ و پاشان وردە وردە ئەو خۆشویستنی فەردیە ئەتەنێتەوە بۆ هەموو قەومەکە.

سەرەتا سەر زنجیرەی ئازادکەری قەومێك بۆ ئەوە تاقەنەفسی خۆی ببێ بە حوکمڕەوا و بەگەورەیەکی وا کە لە وڵاتا لەو گەورەتر نەبێ کۆشش ئەکا و ئەکەوێتە مەیدانی گیانبازییەوە تا سەر ئەکەوێ و ئەگا بەو پایەیە کە خۆی ئارەزووی بۆ کردووە، ئەم حوکمدارییە لەوا و لە نەتەوەی ئەوا و لەناو قەومەکەی ئەوا ماوەیەك ئەمێنێتەوە، لەم مانەوەیە نەتەوەکە بۆ قەومەکەی بەرە بەرە لەززەتی سەربەخۆیی و ئازادی ئەچێژن تا ئەگەنە شوێنێك کە هەموو تاکێکی ئەو قەومە ئەو هەستەی بۆ پەیدا ئەبێ و ئەکەوێتە سەر ئەو باوەڕە کە ئەبێ ئەویش لە عاستی خۆی چاك بکا بەلادا بۆمانەوەی ئەو لەززەتە، کە، لەبەری سەربەخۆیی و ئازادیەکەوە ئەیچێژێ و چێشتوویەتی، ئەمجا ئەگەر خراپە و خراپەکاری لە دەست و دایەرەی دەستەی حوکمدارەکانەوە زۆر بو ئەفرادی قەومەکە بە عەشقی ئەو لەززەتەوە ئەکەونە سەر ئەو فیکرە کە ئەو دەورەیە وا لەززەتەکەی لەوان داگیر کردووە تێکی بدەن و بکەونەوە دەورەیەکی‌تر کە بتوانن بەو لەززەتە بگەنەوە.

ئەم ورد بوونەوەیە کە بەم جۆرە باسی کرا بۆ ئەو قەومانە بوو کە لە بناغەی تاریخیانەوە چۆن ئەکەونە ناو کۆڕی ئازادی و لە ناوەڕاستی زەمانی کۆڕەکەدا لەززەتی ئەچێژن و پاشان کە زانیان ئەو لەززەتە وا خەریکە نەمێنێ ئەکەونە دەوری شۆڕشەوە و ئەو دەستەیە کە وا لەززەتەکەی لێ زەوت کردوون لایائەبەن.

ئەمجا ئەگەر هات و ئەو قەومە کەوا دەورەیەك لەززەتی سەربەخۆیی و ئازادی چێشت و گەیشتە پایەیەك کە خۆی بە خۆی و بۆ خۆی بژیت کوتوپڕ ڕۆژگار پشتی تێ کرد و قەومێکی‌تر هاتن داگیریان کرد و کردیان بە ژێردەستە، ئەوە ئەو قەومە نابێ پیاو وابزانێ کە مردن و ئیتر بەسەرچوون، ئەو قەومە مادام تاریخ و عەنعەناتێکیان هەبووە و نەتەوەکەیان ئەو تاریخ و عەنعەناتە ئەخوێنێتەوە و ئەیهێنێتەوە بەرچاو مردن بۆ ئەو قەومە نابێت، ئەگەر ئەو ڕۆژەش مردبێتن ڕۆژێك هەر ئەبێ کە سەر هەڵبدەنەوە و ئەو سەربەخۆیی و ئازادی خۆیانە بگێڕنەوە. بەم جۆرە قەومە ئەوترێ قەومی زیندوو، ئەمەیە کە ئەڵێن قەومی زیندوو نامرێ، نەمردنەکەی ئەمەیە.

دیسان دەستە قەومێکی تریش هەن کە ئەمانە پێشەکی سەربەخۆیی و ئازادیان بە خۆیانەوە نەدیوە، زۆرتر ژیانیان بە ژێردەستەیی و بە چەوسانەوەوە ڕابواردووە، ئەمانە بەرە بەرە بەم جۆرە دێنە خوارەوە تا تووشیان ئەبێ بە تووشی ڕۆژێکەوە کە قەومەکانی تری غەیری ئەمان هەموو سەربەست و ئازادن ئەمان نەبێ کە هیچیان نیە. ئەم تەماشا کردنە لە لایەکەوە و سەیر کردنی چەوسانەوەشیان لە لایەکی ترەوە ئەیانخاتە سەر ئەو هەستە کە ئەمانیش کۆتێ دیلی بپچڕن و ئەو سەربەخۆیی و ئازادیە بخەنە دەست خۆیان، ئەم هەستە بەم جۆرە باڵ ئەکێشێ بەسەر هەموو تاکێکی قەومەکەدا و هەموو یەکێکیان لەم ڕووەوە بۆ وەرگرتنی ئەو لەززەتی سەربەخۆییە وەکوو دامەزرێنەری بناغەی سەربەخۆیی قەومە خاوەن کەیانەکەی لێ دێت، بەڵکوو هێزی ئەمان زیاتر ئەبێ و ئەمان زووتر ئەگەن بە ئامانج؛ چونکە قەومە خاوەن کەیانەکە سەرەتا یەکێك جەنگی بۆ کردووە ـ ئەویش لەبەر لەززەتی خۆی و گەورەیی خۆی ـ وەکوو باسکرا ـ بەڵام ئەمان هەموو تاکێکیان ئەو جەنگەی بۆ ئەکەن بۆ ئەوە بگەن بەو لەززەتە کە ئامانجی هەموو لایەکیانە، ئەم قەومەش دیسان وەکوو قەومە کۆنە خاوەن کەیانەکە نامرێ و ئەبێ هەر بژیت.

* * *

ئەمە «تەحلیل»و وردبوونەوەیەکی عیلمی بوو بەرانبەر بە دروست بوون و پێگەیشتنی قەومەکان کە چۆن دروست ئەبن و ئەکەونە مەیدانەوە. لەوەوە بۆمان دەرکەوت کە لە بەرز بوونەوە و نزم بوونەوەی قەومەکانا یەکێ لە سێ جۆرە باوەڕەکان ئیشی تیا ئەکەن.

قەومی کورد ئەگەر زۆر بە وردی لێ بکۆڵینەوە دوور نییە هەر سێ جۆرە باوەڕەکە بە جارێ ئیشیان تیا کردبێ.

یەکەم ئەوە کە دەوری هەرەپێشوویان گەورەیی و عەنعەناتی بنەماڵەی «ماد»یان هەبووە و ئەڵهای ئەو کەیانە بەرزەی لە دەست چووە لە مێشکی نەتەوەکەدا لە جونبوجۆشا بێت.

دووهەم دەوری ئەمارەتەکان؛ کە ئەو دەورە دامەزرێنەری ئەمارەت تەنها بۆ گەورەییەکی فەردی و شەخسی دەستی پێ کردووە و نیمچە سەربەخۆییەکە ئەوەندە نەماوەتەوە کە

لەزەتی ئازادی تێکڕایی بچێتە بن دانی هەموو تاکێکی قەومەکەوە بۆ ئەوە هەموویان لە عاستی خۆیان ئەو هەستەیان بۆ پەیدا بێ، کە ئازادی تەواو ناز و نیعمەتێکی زۆر گەورەیە و پێویستە هەموویان بۆی بجەنگین بۆ ئەوە بەتەواوی وەری بگرن.

سێهەم دەوری کەساسی و چەوسانەوە؛ ئەو دەورە کە ژێردەستەیی بە جارێ پەلوپۆی برین و حوکمی بێگانە بەتەواوی بیناقاقەی گرتن و هەناسەی لێ برین. ئەمەش لە وەختێکا بوو کە دەنگی ئازادی و سەربەخۆیی قەومەکانی‌تر لە هەموو گۆشەیەکەوە دەنگی ئەدایەوە، دەردی چەوسانەوەی خۆیان و دەنگی ئازادی قەومەکانی‌تر هەردووکیان پاڵیان پێوەنان کە بکەونە کۆڕی جەنگ و مەیدانی شۆڕشەوە بۆ وەرگرتنی ئەو ئازادی و سەربەستیە. جا ئێمە ئەمانەوێ یەکە یەکە ئەم سێ دەورەیە لێرەدا ـ بۆ ئەوە مێژوو شت ون نەکا ـ باس بکەین.

دەوری «ماد»ەکان دەورێك بوو کە لە «٧٠٠ـ٥٥٠»ی پێش میلاد دەستی پێ کرد، ماوەی ئەم «١٥٠» ساڵە دەورێکی هەرە درخشانە لە لاپەڕەی تاریخی کورددا. بە هەموو مەعنایەك ئەو دەورە دەورێکی سەربەستی و کەیانێکی ڕاستەقینە بووە چونکە لەناو حوکوومەتە گەورەکانی «ئاشوور و بابل»دا هەڵکەوتووە و تەنگی بەوان هەڵچنیوە و کەیانێکی ڕاستی بێ دەستکاری غەیر هەبووە. ژیاوە بە خۆی نەوەك بە غەیر، لەسەر قسەی کەس بەند نەبووە و بەڵکوو قسەی ئەم لە دیواخانی کەیانی قەومەکانی‌ترا جێ باوەڕ بووە. لە پاش «١٥٠» ساڵە بە دەست هەخامەنشیەکانەوە دواییان هات و زەمان ئەو، لێ‌گۆڕینە کە لە کوردی گۆڕی هەر گۆڕی!.

دەوری ئەمارەتداری؛ ئەم دەورەش ڕۆژێك بوو کە ئەمارەتەکانی «ئەردەڵان» و «بابان» لە وڵاتەکانی ئەردەڵان و موکریدا دەنگیان ئەدایەوە.

بەڵێ دەورەی ئەمارەت‌داری وەنەبێ تەنها هەر ئەو دوو دەورەیە بووبێت، گەلێکی‌تر هەبوون وەکوو: ئەمیرەکانی پاڵنگان، مایدەشت، بانە، زەنگەنە، دونبوولی، شیروانە، میافارقین. وە وەکوو حاکمەکانی برادۆست، جەزیرە، بادینانی، لوڕ، شارەزوور و دینەوەر، دیاربەکر و گەلێکی‌تریش.

ئەمانە هەبوون و هەر دەستە و بەرەبابێك لە وڵاتی خۆیدا ناوێکی دەرکردوە،

تەنانەت هەندێك لەمانەش خوتبەیان بە ناوی خۆیانەوە خوێندۆتەوە بەڵام ماوەی درێژبوونەوەی دەسەڵاتیان وەنەبێ ئەوەندە زۆر بووبێت کە بتوانرێ بە درێژی دەسەڵاتەکەیان باس بکرێن. ئەمە و دیسان حوکم و ئەمارەتەکانیشیان زیاتر بەسترابوو بە حوکوومەتە گەورەکانی تری وەختەوە؛ وەکوو حوکوومەتی «سەفەوی» و حوکوومەتی «عوسمانی». هەست و شعووری ئەو دەورەش وای پیشان ئەدا کە مایەی شانازیە ئەگەر یەکێك خۆی ببەستێ بە یەکێ لەو دوو حوکوومەتەوە. ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە دەسەڵاتی فەردی مەبەست بوو لەو ڕۆژەدا نەوەك دەسەڵاتی ئیجماعی و کۆمەڵی. ئەمیر تەنها ئەوەی لە دڵا بوو کە ناوی [ئەمیر]ی هەبێ و ئەمیر بێ بەسەر هەندێکەوە، ئەمە بۆ ئەو ڕۆژەی ئەو، لای وابوو پڕ بە پێستیەتی!.

❁ ❁ ❁

هەروەها لە سەدەی شانزەهەما، لەو سەردەمەدا کە دوو بەرەکییەکی ناخۆش لەبەینی سەفەوییەکان و عوسمانییەکاندا پەیدا بوو، کوردەکان لەو بەینەدا لە ژێر پێدا ڕۆیشتبوون، «حەکیمی بتلیسی ـ مەلا ئیدریسی بتلیسی» کەوتە مەیدانی سیاسەتی ئەو ناوەوە، سەرەتا لە لای شائیسماعیلی سەفەویبوو، پاشان گەیشتە لای «بایەزیدی دووهەم ـ شای عوسمانی». کە کەوتە دەوری «سوڵتان سەلیمی یاوز»، مەلا، بۆ یەكگرتنی کوردەکان بەتەواوی کەوتە کۆڕی سیاسەتەوە.

ئەو کارەساتانە کە لە بەینی سەفەوی و عوسمانیەکاندا ڕووی ئەدا لەوانە بوو بەتەواوی کوردەکان تیابەرێ و ئەو ئەمارەتانەی کە لە وڵاتەکانا هەیانبوو وردە وردە کەوتنە دەوری پووکاندنەوە. بەتایبەتی کە یاوز سوڵتان سەلیم لە شەڕی «چالدێران»دا سەرکەوت و حوکوومەتی سەفەوی شکاند پارسەنگ بەرانبەر بە کوردەکان لە بەینا هەڵگیرا و ئیتر کەوتە سەر ئەوە کە کوردەکانیش بەتەواوی لەناو بەرێ.

«مەلا ئیدریس» بە زانایی خۆی بۆ ئەوە لەو ڕۆژەدا ئەو ئەمارەتانەی کوردی بمێننەوە هێنای لە «١٥١٤»دا هەر «٢٣» ئەمارەتەکانی کوردی ـ واتە لە دیاربەکرەوە تا مووسڵ ـ کردنی بە وێنەیەکی «فیدرالی» و پاڵی‌دان بە حوکوومەتی عوسمانییەوە.

ئەم کردەوەی مەلا ئیدریسە بۆ ئەو ڕۆژە گەورەتر خزمەتێك بوو کە بە قەومییەتی

کوردی کردی، یەکەم کەسێك بوو کە ئیدارەیەکی ناوخۆیی بۆ کورد دروست کرد؛ ئیدارەیەکی وا کە بتوانن بە هەموو جۆر کاروباری خۆیان بەبێ گیروگرفتێ ببەن بەڕێوە و لە لایەن حوکوومەتێکی گەورەی ئەو ڕۆژەی وەکوو عوسمانییەوە دانیان پیابنرێ.

گومانی تێدا نییە کە ئەم ئیشەی «مەلا ئیدریس» ئیشێکی زل بوو، چونکە ئەگەر ئەو ئەوەی نەکردایە حوکوومەتی «یاوز» بەتەواوی ئەمارەتەکانی قووت ئەدا و ناوێکی بۆ نەئەهێشتنەوە، ئەوەندە هەبوو گەورەکانی کوردی ئەو ڕۆژە ـ واتە سەرۆکی ئەمارەتەکان نەیانتوانی ئەرکی ئەو فرمانە گەورەیە بەرن بەڕێوە، چونکە لە پاش مردنی مەلا ادریس لە (١٥٢٠)دا ئەوان لە بەینی یەکا تێکچوون و هەر یەکە بە جیا بۆ خۆی بەیداخێکی یاخی گەری لەویتر هەڵکرد و ئەو بناغە قایمەیان تێکدا.

شك لەوەدا نەبوو ئەگەر ئەو گەورانە بەو جۆرە لە بەینی یەکدا تێك نەچوونایە و بیانتوانیایە ئەرکی ئەو یەك بوون و فیدراڵییەیان بەڕێوە ببردایە پاشەڕۆژێکی سەربەخۆیی زۆر گەورە لەو ئیشەدا بۆ کورد دروست ئەبوو. ئەوان یەك بوون و فیدراڵییەتەکەیان تێکدا و ئەمارەتە پێشووەکەشیان لە دەست دەرچوو و نەیانتوانی بناغەی شتێکی‌تر دروست بکەنەوە.

ئەوانەی کە لۆمەی ئیدریسی بتلیسی ئەکەن بۆ کردنی ئەو ئیشەی گزیەك لەگەڵ «واقع» و لەگەڵ تاریخ ئەکەن، بەڵکوو دوور نییە لە حەقیقەت ورد نەبنەوە. بە پێچەوانەی ئەوە تاریخ ئەو گەواهییە ئەدا ئەگەر چەند کەسێکی‌تر زانا و دانای وەکوو مەلا ئیدریسی بتلیسی هەڵبکەوتایەتەوە ئیشی کورد غەیری ئەم ئیشە ئەبوو کە بەم ئاڵۆزاوییە ئێمە ئەیبینین. مەلا ئیدریس بناغەیەکی باشی دامەزراند، بەڵام چڵێس و تینەگەیشتووەکان تێکیان دا و نەیانهێشت بەتەواوی بێتەبەر.

❋ ❋ ❋

بە پێچەوانەی ئەمیر و پاشاکانی ئەردەڵان و بابان، ئەمانیش هەرچەندە نەگەیشتبوونە ئەو دەورەی سێهەمە کە باسمان کرد بەڵام لالغاوەی فیکریان تۆزێ فراوانتربوو لە ئەمیر و حاکمەکانی‌تری دەورەی دووهەم، ئەمەو دیسان ئەمانە هەم ماوەی دەسەڵاتیان و هەم درێژی زەمانی حوکمەکەیان کارێکی‌تری کردە سەر هەستی تێکڕای مەردمە کە بۆ ئەوە گەلاڵەیان بکەن بۆ هەستێکی قەومی تێکڕایی پاشەڕۆژ و دەوری سێهەم. وەکوو ئەوە کە:

سەرەتا ئەمارەتی ئەردەڵان لە حەسەناوا و پاشان لە «سنە» لە (١٢٠٧)ی میلادی لە «کلۆڵ» بەگەوە دامەزرا. ئەم ئەمارەتە لە بڵاوبوونەوە و کارکردنابوو، پەلی هاویشت بۆ وڵاتەکانی هەمەدان و کرماشان، لەملاوە وڵاتی شارەزوور و هەولێر و مووسڵ و تەنگی بە وڵاتی بادینان هەڵچنی، ماوەی دەسەڵاتی ئەمانە زۆر بوو، لە ڕاستیدا لە گەلێ ڕووەوە لە شێوەی حوکوومەتێکی سەربەخۆ ئەچوو، ئەوەندە هەبوو لەگەڵ ئەوەشا کە ئەمارەتی ئەردەڵانی پێ‌ئەوترا وەنەبێ لەسەر هەست و شعووری حوکوومەتێکی کوردی بڕۆیشتایە، واتە ئەمارەتەکە هەبوو بەڵام هەستی کوردییەکە نەبوو. ئەم ئەمارەتە بەم جۆرە و بەو تیشکە، درێژەی کێشاو وردە ئەمارەتەکانی وڵاتی کوردستان ـ کە لەو سەردەمەدا هەبوون ـ هەمووی لەناو بردن و بە تایبەتی لە دەورەی «أمان اللّەخانی والی»دا گەلێ کاری گەورە گەورە و ئیسلاحات لە هەموو لایەك لە قەڵەمڕەوی مەملەکەتا کراو دەست پێ‌کرا. تا گەیشتە دەورەی «غوڵامشاخان» لە (١٨٦٧)دا، لێرەدا ئەمارەتی (٦٦٠) ساڵەی ئەردەڵان دوایی هات و لە دەست ئەوان و لە دەست کوردیش دەرچوو.

ئەمارەتی دووهەم ئەمارەتی «بابان» بوو، ئەم ئەمارەتەش لە «قەڵاچوالان» و سولەیمانیەوە لە (١٦٧٧)ی میلادی لە باباسلیمانی کوڕی فەقێ «ئەحمەد»ەوە دەست پێ ئەکا و لە «عبداللّە پاشا»ی کوڕی «سلیمان پاشا»ی سێهەمەوە لە (١٨١٥)دا ئەمارەتی نزیکەی (١٥٠) ساڵەی بابان دوایی دێت.

لە دەورەی ئەمارەتی بابانیشا گەلێ ئیش کراوە، دەزگای دەسەڵاتیان گەلێ جار وڵاتی بلْباس و لەولاوە موکری و ئەردەڵانی ئەگرتەوە. بە تایبەتی لە دەورەی «عبدالرحمان» پاشادا کە سلیمان پاشای والی بەغدا لە حوکوومەتی عوسمانی یاخی بوو، ئەم چوو بەغدای گرت و سلیمان پاشای کوشت و لە شوێنی ئەو «عبداللّە» پاشای کرد بە والی. ئەوڕەحمان پاشا بە خوێنی شەهیدەکان بەغدای گرت و بە هیچ داینا!.

کولۆڵی هەرەگەورەی کورد لە دەورەی ئەو دوو ئەمارەتەدا ئەوەبوو کە ئەم ئەمارەت بۆ ڕازی کردنی ئەو حوکوومەتەی کە دەستی کێشابوو بە سەریا ئەچوو بەگژ ئەمارەتەکەی‌تردا، هەروەها بەتایبەتی بابانەکان بەر ئەبوونەیەك؛ برا، برای ئەکوشت و مام، برازای سەر ئەبڕی!. ئەمەش بۆ ئەوە کە خۆی بنیشێتە شوێنەکەی؛ ئەو شوێنەی کە حوکوومەتی

عوسمانی هەرکە تۆزی بیزانیایە ئەوا خەریکە دەست بە خۆیا دێنێ خزمێکی‌تری لێ ڕاست ئەکردەوە ئەوی پێ‌ئەدا بە کوشت و ئەیوت خۆت لە شوێنەکەی دانیشە!.

هەروەها لەولاشەوە حوکوومەتی ئێران بۆ ئەوە لە دەسەلات و نفووزی حوکوومەتی عوسمانی کەم بکاتەوە لە ژێرەوە هانی ئەمیری ئەردەلانی ئەدا بۆ بەگژاچوونی ئەمیری بابان. میللەتی هەژاری کوردیش لە پێناوی شەڕەقۆچی دوو ئەمیرا ئەبوون بە گاوگەردوون!. دوو حکوومەتی ئێران و تورکیش دەستیان ئەهێنا بە سمێڵیانا و سەیری ئەقڵی ئەوانە و دیمەنی ڕژانی خوێنی کوردیان ئەکرد!.

ئەمەبوو دەوری دوو ئەمارەتە بەرزەکانی کورد!.

ئەگەر خۆ ئاوڕێکی‌تر بەولاترەوە بدەینەوە؛ بەلای «صلاح‌الدین»ی ئەییووبی و نادرشای هەوشاری ١٦٨٨-١٧٤٨ و کەریم خانی زەندەوە. کە ئیسلامیەتی «صلاح‌الدین» و هەیبەتی نادر و داد و عەدلی «کەریم‌خانی» لەگەڵ هەموو جۆرە دەسەلاتێکیانا لەگەڵ هەموو چەشنە حوکمدارییێکیانا کەس ناتوانێ ئینکاریان بکا، هیچ دۆست و دوژمنێك نییە کە دان بە گەورەیی ئەمانەدا نەنێ.

بەڵێ خیانەت لە تاریخ ئەکەن وە خیانەت لە کورد ئەکەن وەکوو ئەوە هەندێکی وەکوو «سالح جەبەر»ی کۆنە سەرۆکی حوکوومەتە بۆگەنەکەی دەوری پێشووی عێراق لە پارلەمانە دەستکردەکەی خۆیا بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵك ناوی «صلاح‌الدین»ی ئەهێنا کە چە خزمەتێکی بە ئیسلام کردووە و چۆن لە جەنگی «خاج»دا لە سەر فەلەستین گاورەکانی ئوورووپای شلەژاند، بەلام دڵی بڕوایی نەئەدا کە بڵێ ئەم پیاوە ناودارە کورد بووە!. ئەمەی ئەکرد بە ژێر لێوەوە، لای وابوو کە ئەو بیکا بە ژێر لێوەوە تاریخیش ئەیکا بە ژێر لێوەوە!.

هەروەها حوکوومەتەکانی ئێران کە لە پارلەمانەکانیاندا و لە دیواخانەسیاسییەکانیاندا و لە لاپەڕەی کتێبە دەست‌هەڵبەستەکانی ئەم دەورەی دواییەیاندا بۆ خۆ هەڵکێشان و بۆ شانازی، ناوی «نادری هەوشار» و کەریم‌خانی «وکیل الرعایا» دێ بەسەر زمانیانا و بەسەر لاپەڕەی کتێبەکانیانا، بەلام دڵیان بڕوایی نادا کە دان بەوەدا بنێن بڵێن ئەمان کورد بوون، لایان وایە ئەگەر وتیان کوردن لە گەورەیی کۆشکەکانیان کەم ئەبێتەوە، وە یا زیانێك بە برایەتی کورد و فارسیەتەکەیان ئەگا؛ ئەو برایەتیە کە لە وەختی تەنگانەدا

بانگی بۆ ئەدەن و لە وەختەکانی‌ترا شیری بۆ ئەسوون!. ئەمە ئەڵێن و شەرمێکیش لە تاریخ ناکرێ. بێ‌گومان کاسە، کە پڕ بوو ئەڕژێ.

ڕاستە لە ڕۆژگارەکانی کورددا ئەم پیاوانە هەڵکەوتن و بە هەموو مەعنایەکی گەورەیی هاتنە کایەوە، جا لە لایەن کورد بوون و نەبوونیانەوە دانیان پیا بنرێن یا نەنرێن، خۆ دەورەیەکی باشیان هەڵسووڕان بەڵام خزمەتێکیان کە بۆ کورد بگەڕێتەوە ئەو خزمەتە ناکەوێتە بەرچاو، تەنها هەر ناوەکەیە و هیچی‌تر. ئەوەندە هەیە ئەو ئیش و کردەوانە کە ئەیانکرد لە ڕووی دڵێکی سافەوە بوو، جیاییەکیان نەئەخست لە بەینی کورد و غەیری کورددا، بەڵام ئەوانەی کە دان بە کوردایەتی ئەوانا نانێن وەنەبێ لەبەر دڵسافیان بێ، بەڵکوو لەبەر ئەو مەبەستەیە کە خۆیان ئەیزانن و لایان وایە کەسی‌تر نایزانێ، کەچی خەڵکەکەی‌تر لە خۆیان گەلێ چاکتر لە مەبەستەکەیان تێ‌ئەگەن!.

❋ ❋ ❋

زەمان وردە وردە ئەهاتە پێشەوە، هەست و شعوور بەرە بەرە بڵاو ئەبووەوە، لە هەموو گۆشەیەکی دنیاوە جۆرە باوەڕێك پەیدا ئەبوو، باوەڕ و فیکری قەومی لە هەموو سووچێکەوە بڵێسەی ئەسەند. سەیرت ئەکرد بە تایبەتی لە پاش دوایی هاتنی جەنگی گەورەی یەکەم هەر دەستە خەڵکێك هەستیان بکردایە بەوە کە لە ڕەگەزا و لە قسەکردنا و لە ئەدەب و بیر و باوەڕ و لە تاریخ و ڕەوشت و عادەتا یەکن ناوی خۆیان ئەنایە قەومێکی سەربەخۆ، با سیاسەت و پیلانی زەمان سنووری خاکیشیانی لێك جیا کردبێتەوە و هەر بڕێکیان کەوتبێتنە شوێنێك.

لەمەوە مەفاهیمی قەومی بە مەعنای کەلیمە پەیدا بوو. کورد با خوێندەواریشی تێدا نەبووبێ و با ئەوەندە لەو دەورانەدا سەربەدەرەوە نەبووبێ بە فیترەت و لە کانگای دڵیەوە زۆر لە ئەفرادەکانی بە بێ ئەوە باوەڕێکی عیلمی پاڵیان پێوەبنێ کەوتنە سەر ئەو باوەڕی قەومییەتە. چیش ئەمانەی خستە سەر ئەو باوەڕە؟. ئەوە خستنی کە هەریەکەیان تەماشای ئەویتری ئەکرد. سەیری ئەکرد لەم دەردەدارتر و لەم کوناوەجەرگ‌ترە، وەکوو مەڕێکی بێ‌شوان ڕەوە گورگێك ئەیانداتە پێش و بە ئارەزووی خۆی یاری و گاڵتە بە هەموو موقەدەراتێکیان ئەکات.

هەروەها سەیریان ئەکرد لە زمانا یەکن، لە بیروباوەڕدا یەکن، لە شایی و شیوەنا یەکن، لە زەوی و زارا یەکن، لە ستێر و چیرۆك و مێژوودا یەکن. کەچی هەر کەسەیان کەوتوونەتە بنەبەردێك و هەر کەسەیان یەکێك گاڵتەی پێ ئەکا!. ئەم هەستە هەتا ئەهات زۆرتر ئەبوو، هەتا ئەهات ڕەمەکی مەردم زیاتر لێ تێ ئەگەیشتن. نەوەك هەر ئەوەندە بەڵکوو زۆرتر لە ئەفرادەکەیان لەوە تێگەیشتن کە هەست و شعووری قەومییەت وەختێك پوختە ئەبێ کە شەخسیەت و گیان و ماڵ و منداڵ بکا بە گاو گەردوونی ئەو قەومییەتە. وەکوو چۆن لە لای عولەمای «تصوف» «وەحدەتی وجود» وەختێك دروست ئەبێ کە کابرا بە جۆرێ تێکڵاو ببێ لەگەڵ ئەو نوورەدا کە هیچی‌تر نەبینێ، لەبارەی زانینی قەومییەتیشدا لەوانەیە کە عەینی سەمەرەی هەبێ، ئەبێ پیاو هەموو شتێکی‌تری لە بیر بچێتەوە و وابزانێ هیچی‌تر لە ژێر ئەم ئاسمانەدا نییە تەنها قەومییەت و باوەڕی قەومییەت نەبێ. ئەمەش بۆچی؟. بۆ ئەوە کە بە هۆی ئەم باوەڕەوە بتوانێ خۆی لە هەموو کۆت و زنجیرێك ڕزگار بکا.

بەڵێ ئەم باوەڕە باوەڕێکی زۆر گران و زۆر قورسە هەموو کەس پێ ناکرێ و لە وزەی هەموو کەسێکدا نیە، بەلام ئەگەر هات و لە قەومێکدا بکەوێتە مێشکی یەکێکەوە مەعنای وایە کە ئەو قەومە هەموو دەرگایەکی ڕزگار بوونەوەیان بۆ کەوتۆتە سەر گازی پشت؛ چونکە گومانی تێدا نابێ کە باوەڕەکە وەکوو ئاگر ئەتەنێتەوە و هەموو تاکی کۆمەڵەکە ئەگرێتەوە وە یان وەکوو:

چۆن ئەگەر ڕەوە ئاسکێك بگیرێن و بخرێنە ژوورێکەوە و دەرگایان لەسەر داخرێ، هەر دانەیەك لەم ڕەوەیە لە پەل‌وپۆی ئەوەدایە کە ڕزگار ببێ و کۆشش ئەکا بۆ ئەو ڕزگاربوونە، لەم کۆششە تێکڕاییەدا کوتوپڕ یەکێکیان کونێك ئەدۆزێتەوە و لە کونەکەوە دەرباز ئەبێ، ئەوانیتر کە سەیریان کرد وا ئەوەیان لەو کونەوە خۆی ڕزگار کرد هەموو، یەکە یەکە شوێنی ئەکەون و لە دەرەوە وەختێك چاو ئەکەنەوە کە هەموویان ڕزگار بوون.

مەسەلەی قەومێکیش کە دیل بێ عەینی سەمەرەی هەیە، بە تەبیعەت هەستێك بۆ هەموو پەیدا ئەبێ، کە یەکێکیان ڕێگەیەکی دۆزیەوە بۆ ڕزگار بوون ئەوانیتر هەموو شوێنی ئەکەون.

جا ئەم هۆیانە بوو کە کوردی لە دەورەکانی پێشووەوە خستە ئەم دەورەی دوایيە، خستيە دەورەی شۆڕشی قەومیەوە. لە نەتیجەی ئەو شۆڕشانەوە ئەو فیکرەی کە کەوتبووە سەر شۆڕشگێڕەکە کەوتە مێشکی هەموو ئەفرادی بە شوێن شۆڕش کەوتووەکەوە.

بۆ ئەوە مێژوو شتەکانی خۆی بە پوختی بهێڵێتەوە ئێمە لەم دەورەی سێهەمەدا کارەساتی ئەو شۆڕشانە کە لەناو کورددا بۆ ئازادی و سەربەستی ڕوویان داوە لە لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا ئەیانخەینە بەرچاو. ئەو ئومێد و تکایەشم هەیە بە قەومی خۆشەویستی کورد ئەگەر چەوتی وە یا نارێکییەکیان تیایا بەرچاوکەوت بە چاوی لێ بووردنەوە لێم ببوورن، چونکە غەیری خوا نەبێ کەسی‌تر خاڵی نییە لە هەڵە و لە ناتەواوی.

◈◈◈

# شۆڕشی بەدرخانییەکان

لە دەورەی عوسمانیا دەردەدڵ زۆر ئەکرا هەرکە لە عاستی خۆی دلگران بوو لەو کردەوانە، کە حوکوومەتی دیکتاتۆری ئەینواند، ئەو قەومانە کە کەوتبوونە ژێر ئاڵای خەلافەتەوە، یەك لە یەك بێزارتر بوون، هەتا مەیدانی حوکمی خەلافەت پان و فراوانتر ئەبووەوە خراپە و خراپەکاری زۆرتر بڵاو ئەبووەوە، عەدڵی ئیجتماعی بێجگە لەناوەکەی هیچی تری نەمابوو، پیاوەکانی «بابی عالی» هەر یەکە بەلایەکا ڕایان ئەکێشا، هەر یەکە بووبوون بە گورگێك و کەوتبوونە ناو خەڵکەوە.

ئەم جۆرە کردەوانە دڵی قەومەکانی ژێر سێبەری ئاڵای کون کون کردبوو، بێجگە لە سەردانەواندنیش هیچ دەسەڵاتێکی‌تر نەبوو، هەتا وای لێ‌هات هەرکەسە لە عاستی خۆی بێزار بوو لەو ژیانە کە تیایەتی. بەرەبەرە قەومەکانی ژێر ئاڵا لە کون و قوشبنەکانی وڵاتەوە کەوتنە تەقەکردن لە سیاسەتی حوکوومەت و هەر ڕۆژە لە لایەکەوە بۆ ئازادی، یەکێ سەری هەڵئەدا. نارەوایی فەرمانەکانی حوکوومەت وا دیاربوو زیاتر کاری کردە کورد بۆیە:

لە ساڵانی «١٨٠٢-١٨٦٧»م بەدرخان پاشای کوڕی عبدالخان بەگ لە وڵاتی «جزیرە»دا بە نیازی ئەوە کە کیشوەرێکی سەربەخۆی کورد دروست بکا چاکی لێ کرد بە لادا، چاکی لێ کرد بە لادا و بەرە بەرە ناوبانگی دەرکرد و خوێن‌گەرمەکانی کورد لە دەوری کۆبوونەوە. زۆری نەخایان وەکوو ئاگرێك بکەوێتە پووشەوە بەو جۆرە کەوتە لەشی حوکوومەتی تورك و پاشان ئێرانەوە، وڵاتەکانی «وان، باشقەلا، سیوەرۆك، مووسڵ، ڕواندز، سابلاخ و وێران شاری» داگیر کرد و لەم لاوە چووە سەر قاپی «دیاربەکر»، لە (١٨٤٢)دا ناوی خۆی نایە «ئەمیری بۆتان» و قەڵەمڕەو هەموو دانیان بە ئەمارەتەکەیاندا، شاری «جزیرە»ی کرد بە پایتەخت و پارەیەکی بەناوی خۆیەوە دەرکرد کە لە دیوێکیەوە نووسرابوو «ئەمیری بۆتان بەدرخان» لە دیوەکەی‌تریەوە نووسرابوو «ساڵی ١٢٥٨ای هیجری»، هەروەها کارخانەیەکی چەك و bارووت دروستکردنیشی هەر لە شاری جەزیرەدا دانا و بەیداخی حوکوومەتی کوردی هەڵکرد.

کوردەکانی هەموو هێنایە ژێر ئاڵایەکی کوردییەوە، هەموو گەورە و سەرەك عەشرەتەکانی

کورد سوێن خواربوون بۆی کە تێکڕا خزمەتی حوکوومەتی کوردی و دامەزراندن و قایمکردنی حوکوومەتی کوردی بکەن. دوو شت بوو، کە ئەو، ئەو دووەی بە هۆی پاشکەوتنی کورد ئەزانی هەردووکی لابردن؛ یەکێ ئەوە کە هەموو کوردەکان بکەونە سەر باوەڕی نیشتمانی و ڕزگارکردنی کوردستانی گەورە، یەکێ جێ بەجێکردنی کارخانە و کارگەی چەك و ئازۆخە، لە ڕاستیدا هەر دوو فیکرەکەی هێنایە ئەنجام، ناو و دەنگی حوکوومەتی کوردی ئیتر ڕۆژ بە ڕۆژ بەرزتر ئەبووەوە و ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتر ئەبوو.

بێگومان ئەمە بۆ «بابی عالی» و حوکوومەتی عوسمانی دەستی نەئەدا، دەستی نەئەدا لە گەلێ لاوە؛ لە لایەکەوە دامەزراندنی حوکوومەتێکی کوردی لە خاکی حوکوومەتی پێنجسەد ساڵەی عوسمانیا ئەمە کوفرێك بوو بۆ ئەو ڕۆژە!. لە لایەکیترەوە حوکوومەتی ئەستەمۆڵ باڵی کێشابوو بەسەر گەلێ قەومدا، ئەگەر ئیمڕۆ ماوەی ئەم حوکوومەتە تازە پێگەیشتووەی کوردیە بدرێ سبەینێ قەومەکانیتریش ڕاست ئەبنەوە و هەر کە داوای حەقی خۆیان ئەکەن، داواکردنی حەقیش لە ئاخر دەورەکان حوکوومەتی عوسمانیدا کوفر و کوفر و کوفر بوو!..

سەرەتا بەناوی پیلان و سیاسەتکاریەوە لەگەڵی هاتە پێشەوە، بە هۆی «مشير حافظ پاشا»وە ئەیەویست ئەمیر بچێ بۆ ئەستەمۆڵ، ئەمیر ئەم قسەیە نەچوو بە گوێچکەدا، ئەم بە گوێ نەچوونەی ئەوەندەیتر ڕقی خەلیفە و حوکوومەتی هەستان. ئەمەش بەرێکەوت لە وەختێکا بوو کە ئەمیر لە کرد و کۆشی ئەوەدا بوو هەموو کوردەکان ئەوەندەیتر بخاتە ناو جغزی یەکیەتی کوردەوە، لەو کاتەشدا «فەلە»کانی بۆتان سەرپێچییان کرد لەوە کە ڕسووماتی خۆیان بدەن بەم حوکوومەتە کوردییە، ناچار ئەمیر لەشکرێکی دە هەزار کەسی نارده سەریان و تەمێی کردن، ئەم کردەوەیە داری دایە دەست ئینگلیز و فەرەنسەوە، ئەوان داوایان کرد لە «بابی عالی» کە گۆیا حوکوومەتی کورد جەوری لەفەلە و گاورەکان کردووە ئەبێ هەقیان بسەنرێ!. لەگەڵ ئەوەشا بە جۆرێکی تێکڕایی داد و عەدڵ لە قەڵەمڕەوی «بەدرخان پاشا»دا لە بەینی ئیسلام و غەیری ئیسلاما وەکوو یەك ئەڕۆیشت و بەناهەق جەور لەکەس نەئەکرا.

کە حوکوومەتی عوسمانی زانی وا ئینگلیز و فەرەنسەش پشتیوانی ئەکەن لەشکرێکی

هەتا بلّێت زۆری ڕێکخست و لەژێر فەرماندەیی «عوسمان پاشا»دا ناردییە سەر «ئەمیر بەدرخان». لەو وەختەدا بەدرخان پاشا لەگەڵ لەشکری خۆیدا لە فتووحاتابوو لە دەورو بەری «ورمێ»، دوو لەشکر لەوێدا یەکیان گرت، سەرکەوتنی شەڕ هەتا ئەهات بەلای کورددا ئەچوو.

لەو دەمەدا کە ئەمیر ئالابوو بە جەنگی عوسمانیەوە «عزالدین» شێر هەبوو ـ کە خزمی خۆی بوو لەگەڵ ئەمیرا ناکۆکی لە بەینیانا هەبوو ـ ئەم وەختەی بە هەل زانی خۆی دایە پاڵ لەشکری تورك، تورکەکان بە یارمەتی و شارەزایی ئەو لەولاوە چوون شاری «جەزیرە»یان داگیر کرد. ئەم کردەوەیە «بەدرخان پاشا»ی شڵەژان، دەستی لە هەموو شت هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ جەزیرە، لە پاش شەڕێکی زۆر جەزیرەی وەرگرتەوە، ئەوەندە هەبوو ئەم ناپیاوەتیەی «عزالدین» شێر ئیشێکی وای کرد کە لەشکری ئەمیر بێ هێزییەکی زۆری بەسەرا هات، ناچار لە ئاخرا جەزیرەشی بەجێ هێشت و ڕووی کردە قەڵای «ئەروخ» لەوێدا هەشت مانگێك بەشەڕی چەتەیەتی مایەوە، لە ئاخرا هەر کەڵکی نەبوو ئەو شکەستەی کە بەسەریاهات هەرهات و خۆی نەگرتەوە، پاش ماوەیەکیتر بە دیل گیرا و لەگەڵ کوڕەکانیا نێران بۆ ئەستەمۆڵ.

لە پاش مانەوەی ماوەیەك لە ئەستەمۆڵ وردە وردە خۆی لە «بابی عالی» نزیك خستەوە، شەڕی «کرید» بەسەردا هات لەو شەڕەدا ئەویش خۆی بەشدار کرد و پاڵەوانیەکی باشی نواند و خزمەتێکی زۆری بە حوکوومەت کرد، ئەم خزمەتە بوو بە هۆی زیاتر نزیك بوونەوەی لە بابی عالی، بابی عالی لەبەر ئەو خزمەتانەی لەقەبی «میری میران»ی دایە و پاشان چوو بۆ شام، «دە» ساڵێك لەوێ مایەوە، لە (١٢٨٤هـ - ١٨٦٧ م) کۆچی دوایی کرد و لە گەڕەکی «صالحیە»دا نێژرا.

* * *

لە (١٨٧٧)دا جەنگێك لە بەینی تورك و ڕووسا هەڵگیرسا، حوکوومەتی تورك کەوتە ڕەشبگیر کردن، سەرە، هاتەسەر کوردەواری، لەشکرێکیشی لە کورد پێکەوە نا و سەرداری لەشکری دایە دەست «حسەین کەنعان پاشا» و «عوسمان پاشا»ی کوڕانی بەدرخان پاشا. حسەین و عوسمان ئەمەیان بە هەلێکی باش زانی، لەگەڵ ئەو زابت و

سەرۆکانەی کورددا ـ کە کەوتبوونە بەر لەشکرەکەی ئەمان ـ قسەیان کرد بە یەك و هاتنە سەر ئەوە کە لەم وەختەدا بەڵکوو ئیشێکی وا بکەن کوردستانی گەورە ڕزگار بکەن.

لەشکر هەموو ئامادە بوو، لەسەر ئەم نیازە بە بیانووی ئەوەوە کە ئەچن هەر بۆ شەڕی ڕووس بەرەو وڵاتی کوردەواریی بوونەوە و وڵاتی «جزیرە»یان داگیر کرد و بەبێ گیروگرفتی سەربەخۆیی کوردستانیان بڵاو کردەوە. هەر چەندە هەر جارە لە لایەن تورکەکانەوە لەشکریان ئەکرایە سەر لەگەڵ ئەوەشا وڵاتەکانی «جوولەمێرگ، ماردین، زاخۆ و ئامێدی»یان هەر داگیر کرد و بەتەواوی بنجیان داکوتا و حوکوومەتەکەیان ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتر ئەبوو، ئەمیر عوسمان لە خوتبەی هەینیدا ناوی سوڵتانی عوسمانی هەڵگرت و ناوی خۆی خستە شوێنی.

ئەمە ترسێکی خستە بەر حوکوومەتی ئەستەمۆڵ، هەرچەندە کە لەشکری ئەناردە سەریان هەر بە ناهومێدی ئەگەڕایەوە، ئەمجا کەوتە باری پیلان و ناردیە لایان کە با، ڕێ کەون. ئەمانیش لەسەر ئەو مەرجە کە کاروباری کوردستان وەکوو خۆیان ئەیڵێن ئەبێ وا بڕوا ـ واتە حوکوومەتێکی لامەرکەزی هەبێ ـ قسەیان دا بە سوڵتان. حوکوومەتیش پەیمانی دا و بڕیار لەسەر ئەوە بڕایەوە کە بەو جۆرەی ئەمان ئەیڵێن حوکوومەت ئەو داخوازانە بەجێ بێنێ، ئیتر بە ئیمڕۆ سبەی ئیشەکەی هەر دواخست، لە ئاخرا حوکوومەتی عوسمانی شوێنێکی بۆ قۆمیتە تیاگرتن دیاری کرد کە لەو شوێنەدا هەر دوولا قسە لە کاروباری کوردەوە بکەن و ئاخر بڕیار دەرچێ بۆ داخوازەکانیان. لەم ماوەیەدا بەدرخانیەکان پشتئەستوور بەو پەیمانە کە حوکوومەت پێ‌دابوون ئەوەندە گوێیان بەسازکردن و ڕێکوپێك‌کردنی لەشکر نەئەدا بۆ وەختی تەنگانە. هەتا سەرەهاتە سەر قۆمیتە گرتنەکە، لێرەدا لووس و باریك دەورەیان‌دان، هەردوو ئەمیر گیران و نێرران بۆ ئەستەمۆڵ و ئیتر شۆڕش و ئاژاوە کوژایەوە!.

وەکوو سەیر ئەکەین لەم شۆڕشی بەدرخانیانەشدا هەر کوردەکان بە زمانی لووس هەڵخەڵەتان و هەلیان لە دەست چوو، بەڵام ئەوەندە هەبوو شۆڕشی فیکری بۆ ڕزگاربوونی کورد لە کۆت و دیلی و بۆ سەربەخۆیی کورد هەر نەکوژایەوە.

❀ ❀ ❀

لە «١٨١٥» کوردەکانی «بایەزید» و «وان» لە ژێر باری جەوری تورکا ئەتلانەوە، لە ناکاو جۆشێکیان دا و ئاڵای لە ژێر فەرمان دەرچوونی حوکوومەتی تورکیایان هەڵکرد، ئاگری شۆڕش بەرە بەرە تەنیەوە و پاڵیدا بە کوردەکانی وڵاتی ئێرانەوە، حوکوومەتی تورکیا کەوتە خۆی و لەگەڵ حوکوومەتی ئێراندا کەوتنە سرکەسرك کردن!. ئەم شۆڕشە تا (١٨١٨) درێژەی کێشا، لەولاوە «عەباس میرزا»ی ولیعەهدی قاجاری لە تەوریز و لەملاوە حاکمی ئەرزورۆم دەستیان کردە ملی‌یەك و شۆڕشگێڕەکانیان خستە بەینی خۆیانەوە! ئەو دوو حوکوومەتە بۆ کوژاندنەوە و لەناوبردنی ئەو شۆڕشە ماوەی ساڵێك خەریك بوون و پاشان بە گوللەی جەور و ستەم شۆڕشەکەیان دامرکاندەوە و کوردەکانیش لەوێدا هیچیان بۆ نەکرا.

هەرچەندە ئەم شۆڕشە کوژایەوە بەڵام لە ڕاستیدا «١٨٢٥» هەر درێژەی کێشا و بە هەموو مەعنایەك ئەو دوو حوکوومەتەیان خستبووە عەزیەتەوە، وەکوو ئەوان درێغیان لەمان نەئەکرد، ئەمانیش هیچ چاویان لەوان نەئەپۆشی!.

❁ ❁ ❁

لە «١٨٥٣»دا لە کاتی جەنگی ڕووس و تورکا، لە وڵاتی بۆتان و حەکاری پزیسکەی شۆڕشێکی‌تر سەری هەڵدا و لە پزیسکەوە بوو بە کڵپە. ئەم شۆڕشەش لە ژێر سەرۆکی «یەزدان پەنا»دا بوو، شەعبی کوردی بە هەموو دڵێکیانەوە لە دەوری کۆبوونەوە، بەرە بەرە پێش‌کەوتن، «بتلیس» و «مووسڵ»یان داگیر کرد، ناوچەی حوکمی شۆڕش لە «وان»ەوە ئیشی ئەکرد تا «بەغدا». نەستووری و فەڵەکان هەموو بە گیانێکی پاکەوە چوونە ژێر ئاڵای ئەم شۆڕشە و شان بە شانی کوردەکان ئەجەنگین.

لێرەدا ئینگلیز کەوتە خۆی و بڵاوبوونەوەی ناوچەی نفووزی کوردی بۆ خۆی بە زیان هاتە بەرچاو!. «نەمروود ڕەسام»ی ئاسووری بانگ کرد بۆ لای خۆی و هەندێ پەیمانی دایە بۆ ئەوە کە ئیشێکی وابکا کۆسپێك بخاتە ڕێی «یەزدان پەنا»وە!.

نەمروود بە ناوی دۆستایەتیەوە خۆی گەیاند بە یەزدان پەنا و پێی‌وت کە حوکوومەتی تورکیا زۆر بەهێزە و لە ئاخردا ئەم ناتوانێ چاری بکا، چاکەی کوردەکان ئێستە لەوەدایە کە لەگەڵ حوکوومەتی تورکیادا ڕێ‌بکەون بۆ ئەوە ئەم نفووزەی کە ئێستا هەیانە بە دەستیانەوە بمێنێتەوە!.

یەزدان پەنا قسەکانی نەمروودی بە ئامۆژگاریەکی دڵسۆزانە وەرگرت و لە پاش دوو ساڵ وازی لە شەڕ هێنا، لەگەڵ ئەوەشا وانەبوو. حوکوومەتی تورکیا ئەو شەڕە لە لایەکەوە و لە لایەکی ترەوە شەڕی رووس بە جاری شپرزەیان کردبوو، ئەگەر یەزدان ئەو بێنە کە بێنی پێوە نابوو هەر لە سەری بڕۆیشتایە حوکوومەتی تورك هیچی پێ نەئەکرا.

لە پاشان یەزدان پەناش بانگ کرایە ئەستەمۆڵ، لەوێدا ئەو لەناوبرا و شۆڕشیش لەم لاوە کوژایەوە!.

❋ ❋ ❋

لە (١٨٨١)دا شێخ «عُبیداللّه»ی شەمدینان بۆ ئازادکردن و سەربەخۆیی کوردستان بەیداخی هەڵکرد و شۆڕشی هەڵگیرسان، بەڵام بەو مەرجە کە وەکوو لامەرکەزی لەژێر چاوێری حوکوومەتی تورکا بێت. ئەم باوەڕە پەرەی سەند و ڕۆژ بە ڕۆژ بڵێسەی سەربەخۆیی زیاتر زمانەی ئەکێشا.

لێرەدا حوکوومەتی ئێران خەبەری بووەوە، ئەمەی بە زیانێکی گەورە زانی بۆ خۆی، لەگەڵ ئەو هەموو دوژمنایەتیەشدا کە لەگەڵ حوکوومەتی تورکدا هەیبوو هەر قۆڵی کرد بە قۆڵیا بۆ کوژاندنەوەی ئەم ئاگرە. ئەمجا بە لەشکرێکی بێ‌دادەوە ئەم، ئەم‌لای لێ گرت و حوکوومەتی تورکیش ئەولای لێ گرت. لە ئاخرا لەم بەینەدا شێخ گیرا و نێررا بۆ «مەدینە»، لەوێدا بە دوور خراوەیی مایەوە تا مردن و لەم لاشەوە لەشکر پەرت و بڵاو بووەوە.

❋ ❋ ❋

لە «١٨٢٠»دا کوردەکانی زازا بۆ وەرگرتنی حەقی داگیرکراوی کورد شۆڕشێکیان هەڵگیرساند، بڵێسەی ئەم شۆڕشە تا وڵاتی «سیواس» ڕۆیشت، پاشان ئەمەش سەری نەگرت و ئازۆخە تەواو بوو.

❋ ❋ ❋

لە (١٨٢٩) تا (١٨٣٩) لە حەکاری و تورعابدین هەر بۆ سەندنەوەی مافی داگیرکراوی کورد گەلێ شۆڕشی تر کرا، گەلێ خوێنی گەش ڕژێنرا بەڵام هەمووی لە ئاخرا بە هۆی زۆری ستەمدارانەوە بە هیچ دەرچوو.

❋ ❋ ❋

لە (١٨٨٩)دا ئەمین عالی و مەدحەت بەگ کوڕانی بەدرخان پاشا ـ کە لە ئەستەمۆڵە و دەستبەسەر بوون ـ بەبێ‌دەنگ هەڵاتن و خۆیان گەیاندە «تەرابەزوون» بەو نیازە کە دیسان شۆڕشی کوردی هەڵگیرسێننەوە، هەر لەوێدا بانگی باوەڕیان بڵاو کردەوە و گەلێ کەسیان لێ کۆبووەوە، هێشتا بەتەواوی نەگەیشتبوونەوە وڵات «بابی عالی» ئەستەمۆڵ پێ‌زانین و لەشکری نارده سەر ڕێگایان، ئەوانیش هیچ ئاگایان لەم ئیشە نەبوو، هەر ئەوەندەیان ئاگا لێ بوو کە دەورەدران، لە پاش شەڕێکی کەم گیران و نێررانەوە بۆ ئەستەمۆڵ، ئەم کۆششەی ئەوانیش دیسان هەر بە هیچ دەرچوو.

❋ ❋ ❋

لە (١٩١٣) لە «بتلیس» شۆڕشێکی‌تری کوردی بە سەرکردەیی «مەلا سەلیم، شەهابەدین و عەلی» بۆ ئازاد کردنی کوردستان دەستی پێ‌کرد، لە ناوشاری «بتلیس»دا ئاگری شەڕ هەڵگیرسا، لەبەر زۆری هێزی تورك ئەمان کشانەوە دواوە، «مەلا سەلیم» خۆی هاویشتە قونسوولخانەی ڕووس ـ کە ئەو سەردەمە قونسوولی ڕووس لە ناوشاری بتلیس هەبوو ـ هەر لەوێ مایەوە تا ئەو ڕۆژە کە حوکوومەتی تورکیا ئیعلان شەڕی لەسەر ڕووس کرد. لەو ڕۆژەدا تورکەکان پەلاماری قونسوولخانەی ڕووسیان دا لە ناوشار، تاڵانیان کرد و ئاڵاکەیان هێنایە خوارەوە. لە ناو زەلامەکانیاندا [مەلا سەلیم]یان بەردەست کەوت هێنایان لە سەر شەقامەکانی ناوشاری «بتلیس» لە داریان‌دا و خنکاندیان!.

❋ ❋ ❋

پەیمانی «لۆزان» لە ٢٤ی کانوونی دووهەمی ١٩٢٣دا ئیمزا کرا، حوکوومەتی تورکی شڵەژا، چونکە تەنها کورد بوو لە وڵاتەکەی ئەوا کە بتوانێ بەربەرەکانێ بکا و لە هەموو وەختێکا ئاژاوە و هەرا بنێتەوە تا ئەگا بە هەقی خۆی و سەربەخۆیی خۆی وەرئەگرێ. لێرەدا تورکە کەمالییەکان خۆیان کۆ کردەوە و کەوتنە سەر ئەو باوەڕە کە ئیشێکی وا بکەن لەو وڵاتە پان و فراوانەی تورکیادا هەرکەس بە «ئەکمەك» بڵێ «نان» دەماری دەرێنن و بە ڕیشەیا بچنە خوارەوە!. ئەمەش بۆ ئەوە کە نەوەك ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم کوردە سەر هەڵبداتەوە و داوای حەقە زەوتکراوەکەی خۆی بکا!.

لەسەر ئەم نیازە لە دیواخانە ڕەسمی و سیاسییەکانیانا کۆبوونەوە و بڕیاری ئەوەیان

دا کە کورد بەخۆی و بە زمانییەوە لە ناوی بەرن و ناوی لە فەرهەنگدا نەیەڵن! ئەوانەشیان کە گوللەی تفەنگ و دەمی شیر نایانگاتێ هەڵیانفڕێنن یا بۆ وڵاتی تەورێز و ئێران لەوێدا ببن بە تورکمان وە یا بە جۆرێکی زۆر توند و تیژ هەر لە تورکیادا لە سەر زمانەکەی خۆیان نەیانهێڵن!.

دیارە ئەوەشیان ئەزانی کە ئەگەر ئەمان دەست بدەن بەم ئیشەوە کوردەکان تا ئاخر هەناسەیان بەرەنگاریان ئەبن و شەڕ ئەکەن، لێرەدا دوور نییە حوکوومەتەکانی‌تر- ئەوانەی کە وا سەرکەوتووی کوورەی شەڕی (٩١٤-٩١٨) بوون و پەیمانەکانی سیڤەر و لۆزانیان هێنابووە کایەوە- داڵدەی کوردەکان بدەن وە یا لە سەریان بکەنەوە. بێ‌گومان ئەگەر ئەمە ڕووی‌دا ئیش لە «تورکیا» تێك ئەچێ وە یا درێژە ئەکێشێ.

هێنای- واتە تورکیا- لە پێشا پەیمانێکی دۆستایەتی و دراوسێتی لەگەڵ فەرەنسەدا بەست کە ئەو- واتە فەرەنسە- لە قۆڵی سووریەوە هیچ دەنگ نەکا و خۆی تێکڵاوی قسەکردن و لە سەرکردنەوە نەکا.

مایەوە سەر ئینگلیز؛ ئینگلیزیش لە پاش ئەوە کە تورکیا مەسەلەی «مووسڵ»ی لەگەڵ بڕاندەوە و مووسڵی‌دایە، ئەویشی بەمە دەم کوت کرد کە ئەگەر هەر شتێك بکا ئیتر ئەو دەنگ نەکا!. بەم ئیشەی تۆپەڵێ قوڕی دا بەدەم «لورد کرزۆن» وەزیری دەرەوەی ئینگلیزا- کە وەختی خۆی ئەم کابرایە سەرۆکی «قۆمیتەی لۆزان» بوو داوای هەقی کوردی کردبوو لەو قۆمیتەیەدا!- ئەمیش ئەوەی لە فیکر چووەوە.

کە «تورکیا» کەری خۆی لە هەر دوولاوە بەستەوە و زانی هیچ بەرهەڵستێکی بۆ نابێ لەبەر بە ئەنجام‌گەیاندنی مەرامەکەیا، هێنای کەوتە ئیشەوە هەر هێزێکی ئاگرین و ئاسنینی هەبوو هەمووی خستە کار، لەپێشا زمانی کوردی لە هەموو قوتابخانە و کۆڵانی شارەکان و دیواخانەکانا هەڵگرت کە نابێ کەس بە کوردی قسە بکا، تەنانەت لە چایخانەکانیشا وە بەڵکوو هەرکەس لە ماڵی خۆیشیا!. پیاوە گەورەکانی کوردی بەرەبەرە گرت بە دوور خراوەیی ناردنی بۆ وڵاتە دوورەکانی «تورکیا».

کە ئیش گەیشتە ئەم شوێنە و کوردەکان بەتەواوی لە هەموو ڕاز و نیازێکی تورکیای کەماڵی تێگەیشتن تەکانیان دایە خۆیان و ئیتر لە وزەیانا نەما ڕاوەستان و دەنگ

نەکردن. سەرەتای شۆڕش لە شێخ «سەعید»ی کلدار و میراڵای خالدبەگی جوبرانلی وە لە دێ «کلدار» دەستی پێ کرد.

شێخ سەعید کوڕی شێخ مەحموودی کلدار و لە (١٢٨٥)ی هیجری هەر لە دێ «کلدار» هاتۆتە دنیاوە، ئەم شێخە لە تەریقەی نەقشبەندی و (١٢) هەزار موریدی هەبوو. خالدبەگی جوبرانلیش میراڵای بوو لە لەشکری تورك و لەبەر هەوای نیشتمان و جەوری تورکەکان هەڵات و کەوتە کۆڕی ئازادکردنی کوردستانی گەورەوە و لە پاشان بە هۆی تورکەکانەوە کوژرا.

کە دەست درا بە شۆڕشەوە «خالد بەگ» سەروکاری شۆڕشی گرتە دەست، پیاوی نارد بەملا و بەولادا و لە هەموو جۆرە چەکێکی بڵاو کردەوە بەسەر ئەو کەسانەدا کە لە دەرەوەی «کلدار» بوون و هەموو قسەی لەگەڵ کردن بە یەك کە لە ڕۆژی (٢١)ی مارتی (١٩٢٥)دا بە جارێ تێکڕا لە هەموو لایەکەوە هێرش بکەن. کە ئەم، ئەم خەبەرەی نارد بۆ دەستە و فیرقەکانی لەشکری کورد کوتوپڕ لەشکرێکی تورك لە ڕۆژی (٧)ی مارتدا چوونە «کلدار»ەوە، لە بەینی ئەم لەشکرەدا و لەشکری «شێخ سەعید»دا ئاژاوە پەیدا بوو، ئەم ئاژاوەیە بوو بە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ، ئەم دەنگە لە هەموو لایەك بڵاو بووەوە، گەیشتە ئەو زابت و سەربازانەی کورد کە بڕیار وابوو لە (٢١)ی مارتدا بگەنە ئەوێ. ئەوانیش هەرچەندە بەتەواوی ڕێك نەکەوتبوون لەگەڵ ئەوەش بە ناچاری و بە نیوە تفاق هاتن بە دەنگی شەڕەوە. بەڵام لەبەر ئەوە کە بەرنامە بۆ (٢١)ی مارت دانرابوو بە پانزە ڕۆژ پێش وەخت دەستی درایە تا گەیشتنە سەرکوانگی شەڕ زۆریان لە لایەن تورکەکانەوە گیران و بەبێ پرس و جواب نرانە نیشانەوە.

ئەم پێش وادەییە زیانێکی گەورەی دا لە شۆڕشەکە، بە تایبەتی زۆر کەس لە زانا و پسپۆڕەکانی شەڕ لەم پێش وادەییەدا تێدا چوون ـ خالد بەگیش یەکێك بوو لەوانە ـ لەگەڵ ئەمەشا ئاگری شۆڕش هەر تەنییەوە زۆری پێ نەچوو زۆرتر لە خاکی کوردەواری تورکیای گرتەوە.

کۆششی کوردەکان بۆ ئەوەبوو کە شارە گەورەکان بگرن، لایان وابوو ئیش هەر لە گرتنی ئەو شوێنە گەورانەدایە، کەچی لەشکری تورك گوێ بەوە نەئەدا، لە سیواس و

ئەرزەڕۆم و بناری دەریای ڕەشەوە وەکوو لافاو هەڵئەقوڵی و ئەهات، بێجگە لەمەش (٢٥) هەزار شەڕکەری‌تری بە هەموو هێزێکەوە لە ڕێگەی شەمەندەفەری سووریەوە بە خەتی «حەڵەب»دا هەر نارده سەریان.

بە کورتی لە هەموو لایەکەوە تورك بە هەموو هێزێکیەوە هێرشی هێنایە سەر کورد و ئەمانیش بە هەموو هێزێکیانەوە بەرەنگارییان ئەکردن لە ئاخردا لە پاش زیانێکی زۆر لە تورك «شێخ سەعید» و «یووسف زیا پاشا» و (٥١) کەسی‌تر لە گەورەکانی کورد گیران و فەرمانی خنکاندنیان درا، ئەمەش لە سەرچی؟. لەسەر ئەوە کە داوای حەقی شەرعی خۆیانیان ئەکرد، لە (١٥ مارسی ١٩٢٥)دا شێخی شەهید بە ڕیشی سپیەوە ملی کرا بە پەتەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئێستەش «شێخ سەعید» خوێنەکەی لەسەر ڕیشە سپیەکەی هەر داوای ئازادی کوردستان ئەکا.

پاش ئەم هەرایە و پاش خنکاندنی گەورەکان، تورك بەوەش وازی نەهێنا کەوتە جەستەی ئەوانە کە مابوون؛ دانیشتوانی شاری بایەزیدی نارده ڕۆژهەڵاتی تورکیا. لەم تاریخە بە دواوە تا (١٩٣٠) لە دوور خستنەوە، لە ماڵ سووتان، لە تاڵان کردن، لە بەردەباران کردن، لە هیچ خراپەیەك کە بشێ و نەشێ تورکەکان درێغیان نەکرد بەرانبەر بە کوردەکان لە تورکیادا، ئەمەش هەموو بەو نیازە کە تووی کورد لە وڵاتی «تورکیا»دا نەیەڵن!. بەڵام بەو نیازە هەر نەگەیشتن و هەر ناگەن، نەگەیشتن بەو نیازە چونکە:

کوردە نیشتمانپەروەرەکان لە پاش ئەوە کە ئەو کارەساتی (١٩٢٥)یان بە چاوی خۆیان چاوپێ‌کەوت، سەرلەنوێ لە (١٩٢٦)دا چاکیان لێ کردەوە بەلادا و کەوتنە قسەکردن، لە (١٩٢٧)دا قۆمیتەیەکیان لە شوێنێ لە وڵاتی کوردەواری تورکیادا بەست و دەستیان کرد بە قسەکردن و پیلان ڕێك‌خستن. ئەم دەستەیەش لە خوێن‌گەرمەکانی کۆمەڵی «خۆیی‌بوون» بوون، قسەیان هاتە سەر ئەم بڕیارانەی خوارەوە:

١ـ لابردنی هەموو کۆمەڵەکانی کوردی و دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی گەورە کە ئەوانیتر هەموو بێنە ناو ئەم کۆمەڵەوە.

٢ـ جەنگ‌کردن لەگەڵ تورکا، تا لە وڵاتی کوردەواری پاکیان ئەکەنەوە.

٣ـ لە پێش ئەوەدا کە دەست بدەن بە شۆڕشەوە ئەمانە بەجێ‌بێنن:

أ ـ دانانی سەردارێکی گشتی بۆ هەموو هێزەکانی کورد.

ب ـ هێزی شۆڕش بە هەموو جۆرە چەکێکی تازە بڕازێننەوە و فێری مەشقی سەربازی ڕێکوپێکیان بکەن.

ج ـ شوێنێکی گشتی و تایبەتی بۆ شۆڕش لە یەکێ لە کێوەکانی کوردستان دیاری بکەن.

٤ـ دۆستایەتی و ئاشنایەتی لەگەڵ حوکوومەتی ئێران و [شەعبی فارس]دا پەیدا بکەن.

٥ـ دۆستایەتی و ئاشنایەتی لەگەڵ دوو حوکوومەتەی عێراق و سووریادا دابمەزرێنن.

ئەمانەیان هەموو لە ماوەیەکی کەمدا جێبەجێ کرد و لق و پۆپیان لە هەموو لایە بڵاو کردەوە تەنانەت لە ئاورووپاشدا. فەرماندەیی گشتی لەشکر درایە دەست «ئیحسان نووری پاشا» و کێوی «ئاگری داغ» بوو بە مەرکەزی گشتی. ئیحسان نووری پاشا بە هەموو زانایییەوە ماوەیەکی باش کەوتە ئیش‌کردن. ماوەی ئەو چەند ساڵە لە ڕێك‌خستنا بوو، تا لە مارتی (١٩٣٠)دا یەکەم شۆڕشی بەینی تورك و کورد بۆ ئازادی بە هەموو لایەکدا تەقییەوە.

تورکەکان لە پاش شۆڕشی «شێخ سەعید» ئەیانزانی کە شتێك لە ئاگری داغ هەیە و بزووتنەوەیەك لەو ناوەدا دەست پێ کراوە، بەڵام نەیان‌ئەزانی بەو جۆرە بەهێزە، هەر جارە پەلاماریان ئەدا و لێی ئەگەڕانەوە، کەوتنە سەر ئەو فیکرە کە بەڵکوو بە فڕوفێڵ ئەو چەند کەسەی لە ئاگری داغان بیان‌گرن، لە ساڵی (١٣٢٨)دا بڵاویان کردەوە کەوا حوکوومەت لە هەموو یاخییەکان خۆش‌بوو، کەواتە ئەوانەی کە یاخی بوون و بە تایبەتی لە کێوی ئاگرێ داغا خۆیان شاردۆتەوە بێن چەکەکانیان بدەن بە دەستەوە و حوکوومەت ئیتر هیچ لاقەیان ناکا!.

ئەم قسانە بە گوێ «ئیحسان نووری پاشا» و لەشکرەکەیدا هیچ ئاشنا نەبوو، ئەمجا کە، تورك زانی مەسەلە وایە لە هەموو لایەکەوە پەلاماری ئاگرێ داغی دا، کوردەکان خۆپاراستنیان بەلاوە لە هێرش کردن باشتر بوو. تورك بە هێرشی لەسەریەکی چەند جارەش هیچی نەبردەوە. ئەمجا بە هەموو هێزێکی ئاسمانی و سەرزەوییەوە لە قۆڵی وان و بتلیس و کێوی سوبحانەوە پەلاماریان‌دان، لەشکری شۆڕش هیچ دەنگی نەکرد،

کە دوژمن گەیشتە پەلی شاخەکان، شۆڕشگێڕەکان بۆیان دەرپەڕین، تورك لە هێرشەوە کەوتە خۆپاراستن. لەم ئیشەیا گەلێ زیانی لێکەوت. وەکوو ئەو حیسابەی کە لە وەختی خۆیدا کراوە لە (١٣)ی حوزەیران تا (١٣)ی تەمووز:

کوژراو و بریندارى گەیشتە چەند هەزارێك، ١٢ فڕۆکە، شەست تۆپ، پەنجا مەترەلۆز، ١٥٠ چادر، ٣ هەزار تفەنگ، «٦٠» هەزار فیشەك، چل بار ئازۆخە. ئەمانەی سەری تێداچوو، ئەوانەش کە هەلاتن لە لەشکرەکەی زیاتر بوون لە «٤» هەزار سەرباز. تەنها فیرقەی حەوت و هەشت و چەند سەرو دەست شکاوێکی فیرقەکانی‌تر نەبێ لەشکرێکی وا نەمایەوە بۆ خۆپاراستن. کە ئیش گەیشتە ئەم شوێنە ناچار حوکوومەتی کەمالی کەوتە گرتنی سەربازی ئیجباری پێنج ساڵ لەسەر یەك.

تا ئەو وەختە حوکوومەت دانی پیا نەئەنا کە شۆڕشێکی وا لە لایەن کوردەکانەوە هەلگیرساوە، ئەمەش بۆ ئەوە کە گۆیا کەس نەزانێ کورد لە تورکیادا هەیە!. ئەمجا کە زانی ئیش شڕە، دانی پیانا و بلاوی کردەوە.

لە پاش ئەمە هەچ هێزێکی هەبوو بە جارێ ناردی و کەوتە پەلاماردان و بەتەواوی ئابلۆقەی ئاگری داغیان دا، دیسان هەر شەڕ دەوامی کرد. لە ئاخرا شۆڕشگێڕەکان لەبەر ئەوە هەموولایەکیان لێ گیرابوو، وە چەك و ئازۆخەیان دوایی هاتبوو، بە ناچاری لە تشرینی یەکەمی (١٩٣٠)دا وازیان هێنا و ئاگری داغیان بەجێ هێشت و بلاوەیان لێ کرد، «ئیحسان نووری پاشا» لەو وەختەوە ئیتر چوو لە «تاران» دانیشت و ئاگری شۆڕش نیشتەوە.

سەیرتر ئەوەبوو لەو سەردەمەدا کە تورکەکان پەلاماری ئاگری‌داغیان ئەدا و شۆڕشگێڕەکان ئەیانگێڕاننەوە دواوە، بەوان نەئەوێران ئەچوونە گیانی ئەو دێهات و شوێنە کوردانەی کە بێ‌چەك و شەڕنەکەر بوون، داخی دڵی خۆیانیان بەوان ئەڕشت!.

❋ ❋ ❋

«موستەفا کەمال» لە پاش ئەوە کە ئیشی خۆی بەرانبەر بە سیاسەتی دەرەوە و حوکوومەتەکان بەستەوە و پەیمانەکانی خستە پشت گوێ ئەمجا هات پشتی مەتاڵەکەی کردە کورد و بەبێ ڕەحمانە تێیان کەوت. هەرای «ئارارات» دوایی هات بەوە وازی

نەهێنا، فەرمانێکی تێکڕایی دەرکرد بۆ کوشتنی کوردەکان و واشی پێشانی خەڵك ئەدا کە، کورد لە وڵاتی «تورکیا»دا نییە، لەبەر ئەوە ئەم جارەی ئەدا ئەیویست بە لەناوبردنی تووی کورد لە وڵاتی «تورکیا»دا قسەکەی خۆی بەرێتە سەر!.

کارەساتی دڕندانەی «موستەفا کەمال» بەرانبەر بە کوردەکانی وڵاتی تورکیا نەوەك ئینسانیەت، بەڵکوو ڕەوشتی هەموو دڕندەیەکی کێویش بێزی لێ دێتەوە!. بۆ وێنە لێرەدا شتێك باس ئەکەین بزانین شارستانی پەروەرەکان بەرانبەر بەم کارەساتە چی ئەڵێن؟! لە زمانی ئەفسەرێکی کوردەوە کە لە لەشکری «موستەفا کەمال»دا بووە و نایەوێ ناوی ببرێ ئەیگێڕێتەوە و ئەڵێ:

«ئەتاتورك» فەرمانی لەناوبردنی کوردەکانی وڵاتی تورکیای لە پاش هەرای ئارارات دەرکرد. هەر لە وڵاتی «وان»ەوە تا دیاربەکر و بتلیس ئەمانە هەموو کەوتنە ژێر ڕەحمەتی گوللەی مەترەلۆز و بۆمبای فڕۆکەوە!. یەکێك لە نموونەی ئەوانە ئەڵێ:

لە دەورو بەری «وان» سەربازی ئەتاتورك بە ئەندازەی دوو هەزار کەس لەژن و منداڵ و پیاوی بێ چەکی کوردیان کردە دۆڵێکەوە و مۆڵیان دان، سەرلووتکەی کێو و تەپۆڵکەکانی هەر چوار دەوری دۆڵەکەیان لێ گرتن. ئەمانەش نازانن بۆچ وا لەو شوێنەدا مۆڵ دراون و ئاگایان لە هیچ نییە تەنها لە برسێتی و زاق و زووقی کۆرپە و ئاه وناڵەی ئافرەتی کەساس نەبێ!.

سەرۆکی ئەو سەربازانە فەرمانی لە لایەن موستەفا کەمالەوە وەرگرتووە کە لە کات و ساتێکی دیاریدا ئەم کەسانە بداتە بەر بارانی گوللەی مەترەلۆز!. کات و ساتە دیارەکەش ئەوەیە، وەکوو لەم قۆڵەدا ئەم مۆڵەدراوە لەگەڵی لای تریشەوە عەینی چەشن کراوە، مەبەست ئەوەیە کە شلیکی گوللەی هەموو لایەك لە یەك کاتدا بێت!..

لەو کاتەدا کە ئەم تەگبیرە کراوە تا هەشتا سەرباز و ئەفسەری کورد لە خزم و کەس و کاری ئەو کەسانە لەناو ئەو سەربازانەدان کە فەرمانی ئەم شلیکەیان پێ ئەکرێ، ئەمەش بۆ ئەوە ئەمان خۆیان ئەم کارەساتە خوێناویە بە چاوی خۆیان ببینن و پاشان ئەمانەش بنرێن بە نیشانەوە!.

فەرماندەی لەشکر، یەکێ لە ئەفسەرە کوردەکان بانگ ئەکا و ئەمرێ پێ ئەکا کە لە پاش پێنج دەقیقەی تر بۆڕیەی نیشانەی شلیك لێبدا. ئەو ئەفسەرە خۆی لە چە

وەختێکا چاو پێ‌کەوت؟. لە وەختێکا خۆی چاو پێ‌کەوت کە ئەبێ فەرمان بدا بە کوشتنی دوو هەزار ژن و پیاو و منداڵی کوردی بێ گوناح!. ئەفسەرەکە دەستی نەچووە خۆی خۆی بکوژێ، دەستی چووە بۆڕیەکەو فووی پیا کرد، لەگەڵ فوو پیاکردنی ئەوا لێزمەی گوللە دەستی کرد بە بارین بەسەر ئەو کەسانەدا، مێشکی منداڵی بێ‌گوناحی کورد لەو ناوەدا بەدەم گوللەکانەوە گریانی ناو بێشکەیانی ئەگێڕایەوە!. ئای لەو کاتە و لەو ڕۆژە!..

ئەفسەرەکە، کە خۆی ئەم کارەساتە ئەگێڕێتەوە ئەڵێ بە چاوپێ‌کەوتنی ئەو دیمەنە پەردەیەکی بێ‌هۆشی کشا بە سەرما. ئەڵێ پاش ئەوە ئەو ئەفسەر و سەربازە کوردانەی کە لەو لەشکرەدا بوون ئەوانیش هەموو گیران و ڕەوانەی شوێنێکی‌تر کران بۆ ئەوە بنرێن بە نیشانەوە!.

لەو دەمە دەمەدا «فەوزی قاوقچی» ـ کە فەرماندەی هەرەزلی ئەو وڵاتانەبوو ـ گەیشت و ئەو دیمەنە خوێناویەی چاو پێ‌کەوت حەبەسا، لە پاش تێ‌گەیشتن لەوە کە ئەمە «موستەفا کەمال» فەرمانی لە ڕیشە دەرهێنانی هەموو کوردەکانی دەرکردووە، بە تەلگراف و تەلسز خۆی گەیاندە موستەفا کەمال و پێی‌وت ئەگەر واز لەم فیکرە دێنیت باشە ئەگینە لەم شوێنەدا من خۆم ئەکوژم. لە ڕاستیدا «ئەتاتورك»ی پەشیمان کردەوە. بەڵام ئەمە وەختێك بوو کە بە قسەی هەموو ئەفسەر و سەربازەکانی ئەو دەورە لە کارەساتی ئەو جۆرە کوشتن و شێلیکانەدا لە بەینی هەشتا هەزار تا سەد و بیست هەزار ژن و پیاو و منداڵی بێ‌گوناحی کورد بەو جۆرە لە هەموو لایەکەوە و لە کارەساتی ئاراراتا بوون بە گاوگەردوونی ئارەزووی «موستەفا کەمالی ئەتاتورك»!. ئەمانەش هەموو لەسەر ئەوە بوو کە داوای مافێکی زەوتکراوی خۆیانیان کردبوو.

ئەمە تەنها نموونەیەك بوو لە سەدها نموونەی وا کە حوکومەتی تورکیای کەمالی بەرانبەر بە کورد نواندبووی، ئایا ئەوانەی کە چاودێری حقۆقی ئادەمیزاد ئەکەن چە حوکمێك ئەدەن بەرانبەر بەم کردەوەیە؟. ئایا چی ئەڵێن بەرانبەر بە ئینسانیەت و عاتفەی ئینسانیەت؟!..

❋ ❋ ❋

لە (١٩٣٧)دا کارەساتی دڵسووتێنەری موستەفا کەمال و حوکوومەتەکەی موستەفا کەمال بەرانبەر بە کوردەکان گەیشتە شوێنێك کە بە ئاشکرا تینوو بوون بە خوێنی کورد!.. لەگەڵ ئەمانەشا بەوە وازی نەهێنا، هێنای پارلەمانە بۆگەنەکەی بڕیاری کۆچ کردن و هەڵفڕاندنی کوردەکانی وڵاتی «دەرسیم»ی دا بۆ وڵاتی ئەنادۆڵ و وڵاتەکانی ڕۆژئاوا، بڕیارێکی وا کە بە هێزی قامچی و شەلاخ بیاندەنە پێش و لەو وڵاتانەدا هەر بە زیندوویەتی بیانخەنە چاڵەوە!.

لێرەدا «سەید ڕەزای دەرسیمی» بۆ بەربەستکردنی ئەم جەورە بێئامانە چاکی مەردانەی لێ کرد بەلادا و ئاگری شۆڕشێکی هەڵگیرساند، کوردەکانی ئەو وڵاتەی لەدەورە کۆبوونەوە و ناوچەی شۆڕش پەرەی سەند، حوکوومەتی کەمالی دیسان کەوتەوە خۆی بۆیان، هێشتا بەتەواوی هێزی شۆڕش نەگەیشتبووە هەموولایەك بە هەموو هێزێکی ئاسمانی و سەر زەویەوە چوار دەوری لێ تەنگ کردنەوە، لە ئاخرا «سەید ڕەزا» گیرا و برایە بەر سێدارە!.

ئەو کارەساتانەی کە حوکوومەتی کەمالی لە شۆڕشی (١٩٣٧)دا بەسەر کوردەکانیا هێنا، دیسان ئینسانیەت و عاتفە بێزی دێتەوە کە باسیان بکا، چونکە ئەو کوشتن و بڕین و ماڵ وێرانیەی کە لەو ساڵەدا بەسەر ئەو کوردانەدا هێنرا و ئەو گوللەبارانە بێڕەحمانە کە ئەبارێنرا بەسەریانا مەگەر هەر پرزۆڵە گۆشتی منالی ناوبێشکەی بەدەم گوللەوە ڕۆیشتوو بزانێ چی کراوە؟!. ئەگینا نە زمان و نە قەڵەمی یەکێکیتر ناتوانێ باسی بکا!.. کورد بێ خاوەنە، بێکەسە، بێدەرەتانە، ئایا بۆنی کرووزەی جەرگی هەڵقرچاوی حەقی ئەستێنێ؟. یا حوکوومەتە ئیستیعمارییەکان هەر بۆ پێشکەوتنی کاروباری خۆیان ئەم پەردانە هەموو ڕۆژێك تازە ئەکەنەوە؟!.

حوکوومەتی کەمالی تورکیا ئەمانەی بەلاوە کەم بوو هێنای لە (١٩٣٨)دا بە سێ قۆڵی لەگەڵ حوکوومەتی ئێران و حوکوومەتی پێشووی عێراقا بە هاندانی حوکوومەتە ئیستیعمارییەکان پەیمانی «سەعداباد»یان بۆ بەتەواوی لەناوبردنی کورد دامەزراند و دنیای کوردیان ئەوەندەیتر تەنگ کردەوە!. ئەو پەیمانە هەر لە ئیش کردنا بوو تا کەوتە ساڵی (١٩٥٥). لێرەدا بە ئازایەتی «نووری سەعید»ی خوێنمژ ئەو پەیمانە گۆڕایەوە

بە «پەیمانی بەغدا» و بە تێکڵاوبوونی ئینگلیز و ئەمریکا و پاکستان بە زائد لەسەر تورکیا و ئێران و حوکومەتی بۆگەنی پێشووی عێراق ئەوەندەی‌تر کوردیان خستە ژێر ئەشکەنجەوە و ویستیان بەم ئیشەیان ناو و خاکی کورد لە فەرهەنگدا هەڵبگرن!.

ئەم جرت و فرتانە ئەکرا تا شۆڕشی (١٤)ی تەمووزی (١٩٥٨)ی عێراق لە ژێر فەرماندەیی سەرۆکی خۆشەویستی شۆڕش «عەبدولکەریم قاسم»دا ڕوویدا، ئەو پەیمانەی ڕووخاند و ئەو تەونانە کە ئەوان بۆ لە ناوبردنی کورد دایانتابوو، ئەم دار و پەردووی تێك‌دا.

❋ ❋ ❋

شەرەفخان هەر لە بنەچەدا ئەمیرزادە بوو، لە ١٢ ساڵیدا خۆیشی بوو بە ئەمیری کورد، سەردەمێك لە لایەن شا ئیسماعیلی سەفەوییەوە والیەتی «نەخجەوان»ی درایە و لەوێدا حوکمی ئەکرد، پاشان لە (٩٨٦)ی هجری کەوتە لای «سوڵتان موراد»ی سێهەمی عوسمانی و فەرمانی والیەتی بتلیسی بۆ دەرچوو، بەرە بەرە وڵاتەکانی «وان» و «موش»یش کەوتنە ژێر حوکمیەوە. لەمەوە هەوای حوکومەتێکی سەربەخۆی کورد کەوتە سەری و لەم ڕێگەیەوە گەلێ کۆششی کرد. کە تەماشای کرد ئەو ئامانجەی ئەو هەیەتی تیا سەرناکەوێ والیەتی بۆ «شمس الدین»ی کوڕی بەجێ هێشت و خۆی خەریك بوو بە تەواوکردنی کتێبە نایابەکەیەوە «شەرەفنامە».

لەم کتێبەدا باسی حوکومەتەکانی کورد ئەکا لەگەڵ ئەو حوکومەتانەدا کە بە میراتی بۆ کورد ماونەتەوە، ئەمجا بەتەواوی قسە لە حوکومەتی بتلیسەوە ئەکا ـ کە ئەمە لە ژێر دەستی بنەماڵەی خۆیانا بووە و ئەوان بە ئەمیرەکانی «بتلیس» ناسراون.

ئەمجا باسی ئەوە ئەکا کە ئەمارەتەکانی کوردی لە چاو ئەمارەتەوە هەموو سەربەخۆ بوون بەڵام ئەگەر بهاتنایە لەم لاپەڕەی تاریخەدا هەموویان یەکیان بگرتایە و قسەیان بکردایە بە یەك حوکومەتێکی زۆر گەورەی دائیمی کورد دروست ئەبوو و ئیتر لەو دەوری دەرەبەگیەتییە ئەچوونە دەرەوە و وایان بەسەر نەئەهات کە وەکوو ئاردی ناو دڕکانیان لێ بێت!.

◈◈◈

# شۆڕشی حەمە پاشا

حەمە پاشای میری ڕواندز-کە بە «پاشای کوێرە» بەناوبانگە-کوڕی مستەفابەگی ڕواندزە، لە ساڵی «١٧٨٣»م هەر لە ڕواندز هاتۆتە دنیاوە. هەرچەندە [مستەفا بەگ]ی باوکی میری وڵات بوو بەڵام لەبەر ناکۆکی و ناخۆشی بەینی ئەو و برا و خزمەکانی، وڵات ئاسایشێکی وای نەبوو. لە لایەکی‌تریشەوە حوکوومەتی عوسمانی ئەوەندەی‌تر سەری لێ‌تێك دابوون. «موحەممەد پاشا» هەموو ئەم ئاژاوانەی ناوەوە و دەرەوەی بە چاوی خۆی ئەبینی و ئەیخواردەوە، بە بینینی ئەم دیمەنانە گەلێ شت لە دڵیا پەنگی خواردەوە. تا لە ساڵی (١٨١٤) لە تەمەنی (٣١) ساڵیدا بوو بە میری وڵات و جڵەوی ئیش و کاری وڵاتی ڕواندز و سۆرانی گرتە دەست.

لە پێش هەموو شتێکا بەرەی مام و خزمەکانی تەمێ کرد و وڵاتی لە ئاشووبی ئەوان پاك کردەوە، ئەمجا پەلی هاویشت بۆ دەرەوەی ڕواندز، وڵاتەکانی بڵباسەتی و کۆیە و ڕانیە و دزەیی و هەولێری داگیر کرد. لە هەموو ئەم وڵاتانەدا قولە و قەڵای بۆ پاراستنیان دروست کرد، بە تایبەتی نرخێکی زۆری لە شاری ڕواندز نا، هێنای شوورەی بەدەورا بەست، قەڵای تێدا دروست کرد، لە دەرەوەی هەر لە ماوەی بەینێکا قولە و قەڵاتی‌تری دروست کرد. پاش ئەمانە کەوتە سەر ئەوەوە کە ئەو ئامانجەی ئەو هەیەتی بەبێ چەك و جبەخانەیەکی ناوخۆی بۆی جێ‌بەجێ نابێت، پیاوی خستە قەڵەمڕەوی خۆی بۆ دۆزینەوەی «کان»ی ئاسن و قەڵایی و شتە بۆ بەرهەم هێنانی ئەو چەك و جبەخانەیە. لە ڕاستیا ئەو ئارەزووەی کە هەیبوو بۆی هاتەدی، هەر لە چیاکانی ڕواندز ئەو کانانەی دەست کەوت. ئەمجا ناردیە «تەورێز» وەستایەکی چەخماخسازیان بۆ هێنا.

وەستا بە فەرمانی میر کەوتە دروستکردنی چەك و جبەخانە، هەر لە ناو شاری «ڕواندز»دا کارگەی چەك دانرا، تفەنگ و دەمانچە و شیر و خنجەر لە کارگە دەرئەچوو. لەو ماوەیەدا نزیکەی «٢٢٢» لوولە تۆپ دروستکرا کە ئێستەش سێ‌دانە لەو لوولە تۆپە خۆ وڵاتیانە هەر لەبەر دەرکی قشڵەی ڕواندزدا بۆ یادگاری میری سۆران ماوەتەوە، چەند دانەیەکیشیان برانە مووزەخانەی بەغدا کە ئێستە ئەوانەش لە مووزەخانەی

«باب الوسطانی» لە بەغدا گەورەیی ئەمارەتی پاشا کۆڕەی ڕواندز پیشان ئەدەن. ئەمە بێجگە لەو تۆپانە کە لە لەشکرەکەی «عەباس میرزا»ی وەلیعەهد لە تەورێز بەجێ‌ما لە کاتێکا کە پەلاماری میری ڕواندزیاندا.

لە پاش ئەوە کە هەموو قولە و قەڵاتەکانی بە سەرباز قایم کرد و لە پاش ئەوە کە لەشکرێکی ڕێکوپێکی پێکەوەنا ـ کە ژمارەی لەشکر بە پیادە و سوارەوە ئەگەیشتە «٥٠» هەزار ـ بە هەوای ئەمارەت و حوکوومەتێکی گەورەوە پەلاماری وڵاتەکانی «مووسڵ» و بادینانی دا، لە پاش جەنگێکی کەم وڵاتی ئاکرێ و ئامێدی و ماردین و جەزیرەی «ابن عمر»یشی داگیر کرد و سنووری خۆی گەیاندە سەر سنووری «سوریە»، لەم لاشەوە بوو بە هاوسنووری «ئێران»، لە ناوەڕاستەوە تەنگی بە «بەغدا» هەڵچنی.

لێرەدا واتە لە (١٨٢٠)دا بانگی ئازادی و سەربەخۆی بۆ حوکوومەتی کوردستان بەرز کردەوە، حوکوومەتی ئێران ـ کە ئەو سەردەمە حوکوومەتی قاجار بوو ـ دانی بە حوکوومەتەکەیانا، لەم لاشەوە «عەلی ڕەزا پاشا»ی والی بەغدا هەردانی پیانا. حوکوومەتی کوردستانی دەورەی میری ڕواندز بوو بە حوکوومەتێکی سەربەخۆ، پارەی لێ‌دا و لە خوتبەی هەینی‌دا ناوی ئەخوێنرایەوە. هەر لەم وەختەدا لە عولەما و زاناکانی کۆ کردەوە و لە دەشتی «حەریر»دا کۆنگرەیەکی پێ‌گرتن بۆ دروستکردنی دەزگایەکی وا کە بە هۆی ئەو دەزگایەوە بتوانێ هاڵوهەواڵی هەموو قەڵەمڕەوی حوکوومەتی کوردستان وەربگرێ، لە ڕاستیا زاناکان کەوتنە ئیش و دەزگایەکی وایان دروستکرد. مێژوونووسی دانا بۆ نووسینەوەی کارەسات و «فتوحات»ی دەوری خۆی، دۆسیە و دەفتەری ڕێکوپێکی بۆ دایرەکانی حوکوومەتی خۆی دروستکرد، لە کاروباری ئاوەدانی و شارستانیدا وڵاتی دەوڵەمەند کرد، سەرباز و لەشکری لەسەر جۆری حوکوومەتێکی ڕێکوپێك دامەزراند و مووچە و مانگانە بە شێوەیەکی دەوڵەتی ئەدرا.

هەر لەم کاتەدا لەگەڵ موحەممەد عەلی گەورە ـ خدێوی میسر ـ کە لەشکری ئەو بەسەرکردەیی «ئیبراهیم پاشا»ی کوڕی هاتبووە سوریا ـ بە نامە کەوتنە قسەکردن بۆ ئەوە هەر دووکیان قۆڵ بکەن بە قۆڵی یەکا و پەلاماری حوکوومەتی ئەستەمۆڵ بدەن. ئەم دەنگ‌وباسە و ئەم ئاوازەی حوکوومەتی «موحەممەد پاشا»ی ڕواندزە بەتەواوی

لە دیواخانەکانی سوڵتان مەحموو ـ شای عوسمانیدا ـ دەنگی دایەوە و سوڵتان لەم ئیشە ترسێکی زۆری لێ نشت، «موحەممەد ڕەشید پاشا»ی سەدری ئەعزەمی ناچار کرد بەوە کە بەربەستی پەرەسەندنی ئەم حوکمی پاشای کۆرەیە بکات. هەروەها فەرمانیشی دەرکرد بۆ «عەلی ڕەزا پاشا»ی والی بەغدا و «مەحموو پاشا»ی والی مووسڵ ـ کە هێشتا ناوشاری مووسڵ هەر بە دەست حوکوومەتی عوسمانیەوە بوو ـ ئەمانیش لەشکر بکەن و لەگەڵ «موحەممەد ڕەشید پاشا»دا ئەم ئاگرە بکوژێننەوە.

«موحەممەد پاشا» کە بەمەی زانی وای بە چاك زانی وڵاتی ئاکرێ بەجێ بێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ ڕواندز و لەوێدا قایمکاری خۆی بکا. سەدری ئەعزەم و [والی مووسڵ] لە قۆڵی مووسڵەوە هاتن و والی بەغداش لەملاوە. موحەممەد پاشا «گەلی عەلی بەگ»ی لێ گرتن و پەکی پێشکەوتنیانی خست. لەشکری سەدری ئەعزەم و والی گەلێ مانەوە هیچیان بە هیچ نەکرد، لە ئاخرا «سەدری ئەعزەم» و والی قاپی قسەی ڕێکەوتنیان لەگەڵ «موحەممەد پاشا»دا کردەوە و بەو ناوەوە هاتنە مەیدانەوە کە جەنگکردن لەگەڵ خەلیفەی ئیسلاما پێچەوانەی دینە و نابێ لە ڕووی پادشای ئیسلاما شیر ڕابکێشرێ و هەرکە وا بکا بە کافر دەرئەچێ!.

ئەم پڕو پاگاندەیە لەناو لەشکری «موحەممەد پاشا»دا بڵاوبووەوە، لەشکریش هەموو کورد و موسوڵمانن، کارێکی گەورەی کردە سەر بڵاوبوونەوەی لەشکرەکە و کزبوونی موحەممەد پاشا. مەلا موحەممەدی «خەتێ» ـ کە وەزیری موحەممەد پاشا بوو ـ میر، لەم ڕووەوە پرسی پێ کرد و ئەویش هەر بەو جۆرە فتوای دا[1].

پادشا، کە وای زانی بە ناچاری خۆی دا بە دەستەوەو سەدری ئەعزەم ناردی بۆ ئەستەمۆڵ، سوڵتانی عوسمانی چوونی میری «ڕواندز»ی بە سەرکەوتنێکی گەورە زانی، ڕێزی لێ گرت و لە پاش ماوەیەك پێی وت کە بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی. لەم کاتەدا «عەلی ڕەزا پاشا»ی والی بەغدا کەوتە قسەکردن و بردیە دڵی شای عوسمانییەوە کە گەڕانەوەی

١. ئەوەندە هەیە داستانەکانیتری [مەلا موحەممەدی]ی خەتێ لەگەڵ میری ڕواندزا ئەم ریوایەتە ئەخەنە درۆوە، بەڵکوو هەموو دەمێك مەلا بە قسە و بە کردەوە پشتیوانی میری کردووە و لەم ڕووەوە وەنەبێ [فتوای] بۆ بەکژا نەچوونی خەلیفە دەرکردبێ. هەڵبەستنی ئەم قسەیە بۆ مەلای خەتێ من بە دوژمنایەتیەکی شەخسی ئەزانم کە ناحەزەکانی بۆیان هەڵبەستبوو.

«موحەممەد پاشا» بۆ ڕواندز مەعنای وایە ئاو لە وڵاتی بەغدا و بەڵکوو لە هەموو وڵاتی عوسمانی لێڵ ئەکا!. سەرلەنوێ دڵی خەڵیفەی لێ ڕەنجاندەوە و دەست بەجێ پیاوی نارد بە شوێنیا لە وڵاتی «تەرابەزوون» تووشی بوون لەوێدا بە نامەردی لە ساڵی(١٨٤٦)دا کوشتیان. هەر چەند ئەمارەتی سۆران پاش ئەویش هەرمایەوە بەڵام ئەو تیشك و ڕووناکییەی نەما.

❋ ❋ ❋

وەکوو لەم قسانەوە بۆمان دەرکەوت «موحەممەد پاشا»ی ڕواندز لە ڕۆژی منالییەوە تا ڕۆژی لە ناوچوونی هەر لە سەر ئەو ئەڵهایە بووە کە وڵاتی کوردەواری لە ژێر چنگی ئەم و ئەو ڕزگار بکا و بیکا بە وڵاتێکی سەربەخۆ، بەڵام لێرەدا نوختەی دینی پشتی شکان و دای بە زەویا.

لەم ڕووەشەوە نە لۆمەی ئەو ئەکرێ، نە هی «مەلا موحەممەد»ی خەتی ـ ئەگەر مەلا فتوای وای دابێ ـ ، چونکە ئەم کوردە لە بەرەبەیانی تەئریخیەوە لەبەر دڵسافی بە دەست دوو شتەوە گیری خواردووە؛ یەکەم لەبەر پڕدیانەتی و دیانەت زۆری لەلایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە لەبەر نەخوێندەواری لەناویانا، بە ناوی دینەوە گەلێ فەلاکەتیان بەسەردا هێناوە.

بەڵێ ئەمە ڕاستە کە لە نیزامی ئایینی ئیسلاما پیاو نابێ لە ڕووی خەڵیفە وەربگەڕێتەوە، ئەمەش ئەبێ وابێ چونکە ئەگەر ئەم نیزام و یاسایە لە دینا نەبێ هەرچی و پەرچی و دەرەبەگی پەیدا ئەبێ و کاروبار وەکوو ئەو دینە ئیسلامییە کە ئەیەوێ بەو جۆرە ناڕوا، لە ئاخرا وای لێ دێ هیچ کەس لە ماڵ و گیانی خۆی ئەمین نابێ، ئامانجی دینش ڕێکوپێکی کۆمەڵایەتی و ناسینی خوای تاقانەیە.

بەڵام لێرەدا چەن مەرجێك هەیە، یەکەم ئەبێ خەڵیفە لەسەر ڕێ و شوێنی چوار خەڵیفە بەرزەکەی ئیسلام بڕوا، ڕەوشتی ڕەوشتی ئەوان بێ، کردەوەی لە کردەوەی ئەوان بچێ، بە لای پادشایەتی و ملووکییەتەوە ڕای نەکێشێ، چونکە ملووکییەت لە ئیسلاما نییە. ئەوەی قانوونی ئیسلام و فیقهی ئیسلام ئەیلێ لەبارەی عیبادەت و قەزاوەت و دەعوا و بەیناتەوە بەو جۆرە بڕوا بەڕێوە، حەقی زۆر لێ کراو لە ستەمکار بسێنێ، بەرانبەر بە داد و عەدل گەورە و بچووك جیا نەکاتەوە.

ئەبێ ئەمانەی تیابێ نەوەك هەر تەنها ناوەکە بێ و هیچی‌تر، ئەگەر هات و هەر ناوەکە بوو ئەوە هەر لە بناغەدا خەڵیفە و حوکوومەتە ئیسلامیەکە نەبوو تا، لە ڕوو وەرگەڕانەوەکەی ببێ بە بێ‌دینی و بە تەڵاق کەوتن.

لە ساڵەکانی (١٩٤٣-١٩٤٧) کە بەرزانیەکان لە عێراقا داوای نان و عەدلی ئیجتیماعی و ڕێکوپێکی ئیشیان ئەکرد لە حوکوومەت، هەندێ لە ڕۆژنامە بۆگەنەکانی ئەو سەردەمەی «بەغدا» بە ناوی دینەوە ئەهاتنە مەیدانەوە و ئەیانگوت: «ئەمانە بە شەرع و بە دیانەتی ئیسلامی ئەبێ بکوژرێن چونکە لە ڕووی حوکوومەتی ئیسلامیدا وەستاون و فەرمانی حوکوومەتی ئیسلامیان شکاندووە!.».

ئەوەندە هەیە کام حوکوومەت؟. ئەو حوکوومەتە کە شەو و ڕۆژ خوێنی میللەتی ئەمژی و بە تەعبیری ئیسلامی هەموو وەختیان لە «فسق و فجور» و نافەرمانی خوا و زۆر و ستەمدا ئەبردەسەر!. دەی ئەمە کەی حوکوومەتی ئیسلامی بە مەعنای ئیسلام هەبوو؟. تا لە ڕوو وەرگەڕانەوەیان ببێ بە خیانەتێکی دینی و ببێ بە لە دین لادان؟؟. بەڵام باشچاوشەکانی حوکوومەتی وەخت و پڕوپاگەندەچی پارە وەرگرەکانی بە ناوی دینەوە هەموو قسەیان کردبوو بە یەك، کێ ئەیتوانی لەو سەردەمەدا حەقیقەتێکی وا دەربڕێ و بە یەکێك بڵێ لای چاوت کلی پێوەیە؟!.

وترا کورد بە دەست دوو شتەوە گیری خواردووە، یەکەم بە دەست ئەوەوە کە باسمان کرد، دووهەم بە دەست دڵسافییەوە؛ بە دەست دڵ‌سافیەوە گیری خواردووە چونکە تا ئێستە بە هەزاران جار زۆر و ستەمی لێ کراوە و بە سەدها جار لێ نراوە بە نیشانەوە، کەچی لەگەڵ ناحەز و خوێنەخوێکەی لێ قەومابێت و ئیشی بەم بووبێت خێرا هاتووە مەرحەبایەکی ڕووتی لێ کردووە، ئەم بەو مەرحەبایە هەڵخەڵەتاوە و قاپی دڵی خۆی بۆ خستۆتە سەر گازی پشت و هەمووشتێکی لەبیرچووەتەوە، هەر لەگەڵ کابرا بەسەر ئیشی خۆیا سواربوو و کەری خۆی بەستەوە ئیتر بە هیچ کلووجێك ئەم هەر ناناسێ و بەڵکوو بۆی ئەچێتەوە پارێز و ئەوی بشێ و نەشێ لەگەڵی دائەمەزرێنێتەوە!.

کوردە هەژارەکەش وەنەبێ تەمێ خواردوو ببێ و هۆشی ئەوەی بێتەوە بە بەرا کە جارێکی‌کە وا هەڵنەخەڵەتێتەوە، هەر لەگەڵ کابرای‌تر هاتەوە و مەرحەبایەکی‌تری لێ

کردەوە ئیتر ئەم وەك نە بای دیبێ و نە بۆران، با ئەداتەوە سەربای بەرە بۆر بۆی!.

ئەم دەردە لە هەموو شت زیاتر کاری کردۆتە کورد و لە هەموو مەیدانێکا پەکی خستووە، تەنانەت پەندی پێشینانەکەی خۆیشی ناگرێتە گوێ کە ئەڵێ: «جاری یەکەم کە خەڵەتانمت خوابتگرێ، جاری دووهەم کە خەڵەتانمت خوابمگرێ!.».

ئەگەر رۆژێ لە رۆژان کورد هات و لە دەست ئەم دەردە رزگاری بوو و پشتیان دا بە پشتی یەکەوە و لەگەڵ ئەمەشا بە ئاوی خوێندەواریەکی ڕاست و دروستی بێ خەوش ئاو درا، ئەو وەختە مەعنای وایە هەر دوو دەروازەی کامەرانی بۆ کراوەتەوە و ئەتوانێ بە ژیانێکی ئازادانەی وەکوو ئەو ژیانەی کە قەومەکانیتر هەیانە ئەمیش بژیت.

◈◈◈

# شۆڕشی سەردار ڕەشی

عەبباس‌خانی سەردار ڕەشید کوڕی عەلی‌خانی کوڕی موحەممەد سادق‌خانی کوڕی ئەمانوڵڵاخانی والی ئەردەڵانە. لە «١٨٦٦»دا کە غوڵام‌شاخانی والی مرد و ئەمارەتی ئەردەڵانی دوایی هات، ناسرەددین شا ـ شای ئێران ـ مەیدانی بە چۆڵ زانی فەرا میرزای «معتمد الدولە»ی بە ناوی حوکوومەتییەوە لە زیلقەعدەی (١٢٨٤)ی هیجریدا ناردە «سنە»و دەوری ئەمارەتی ئەردەڵان بەتەواوی پێچرایەوە. حوکوومەتەکانی تاران لە شوێن ئاگردانی بنەماڵەی ئەردەڵان دەستیان کرد بە حوکمداری لە وڵاتی «سنە» و حەسەناوادا!.

لە پاش ئەوە کە گرانی و شەڕی (١٩١٤-١٩١٨) بە خۆی و ئەویش بە گرانییەکەیەوە هێرشی هێناو بە تایبەتی گرانیەکەی، وڵاتی ئەردەڵانی دارزان و پاشان بە سەر چوون، دنیا لە هەموو گۆشەیەکیەوە بوو بە پشێوە و ئاژاوە، قەومە دەربەدەرەکان چاوە چاوی ئەوەیان بوو کە دەروویەکیان لێ ببێتەوە و ئەوانەی کە ئاوی سەربەستیان لێ بڕیون بەڵکوو ئیشێکی وا بکەن تۆزێ خۆیان پاراو بکەنەوە. ڕووس و ئەڵمان و ئینگلیز و حوکوومەتی عوسمانی هەر یەکە لە لایەکەوە ئاژاوەیان خستبووە وڵاتی کوردستانەوە. بێ‌کارەیی حوکوومەتی ئێران و هەر کە بۆ خۆیی عەشایرەکانی ئەو ناوە ئەمانیش ئەوەندەی‌تر هەشتیان خستبووە سەر نۆ!.

لەم وەختەدا عەبباس‌خانی سەردار ڕەشید، واتە لە (١٣٣٦ه.ق ـ ١٩١٧ م) ـ دیارە بە گەلێ پێش ئەم مێژووەش ئەو هەر خەریك بووە ـ بەنیازی ئەوە کە لە نەتەوەی ئەردەڵانەکانە و هەقی میراتگری هەیە، لە «ڕەوانسەر»ەوە دەستی کرد بە بزووتنەوە و شۆڕش نانەوە بۆ سەندنەوەی حوکوومەتی زەوتکراوی ئەردەڵان. لە ژێرەوە و بە ئاشکرا لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتەکانی ئەو وڵاتەدا قسەیان کرد بە یەك. ئەوانیش لەبەر ئەوە کە «سەردار ڕەشید» لە بنەماڵەیەکی ئەمارەتی کوردییە و خۆیشی پیاوێکی لێ هاتووی بە دەسەڵاتە هەموو قسەیان دایە. بەرە بەرە لە وەکیلی جوانڕۆ، لە حسێن‌خانی ڕەزاو جافرسانی لهۆن و مەحمووخان کانی‌سانان و مەحمووخانی دزڵی و حەمەخانی بانەوە،

لەولاشەوە سنجەرخانی میاوەران و حوسەین قولی خانی کولیایی ئەمانە هەموو لە سەر قسەی «سەردار ڕەشید» و بۆ یارییەدانی ئەو بە ڕێکەوتن بۆ وڵاتی «سنە» و حەسەناوا ـکە شوێن ئاگردانی ئەمارەتی باوباپیری «سەردار ڕەشید» بوون.

لەو مێژووەدا چووە سنەوە بە ناوی ئەوەوە کە حوکوومەتێکی کوردی سەرلەنوێ دروست بکاتەوە دەستی دایە و ماوەیەکی باش دەورێکی گێڕا، ڕووسەکانیش لە ژێرەوە قسەیان دایە، بە تایبەتی «جەنەڕاڵ فسینکو، جەنەڕاڵ باراتۆف» ـکە لە ئەفسەرانی ڕووس بوون و ئەو وڵاتەیان لەو دەوری هەرچی و پەرچییەدا داگیر کردبوو ـ پەیمانیان دایە کە بە هەموو جۆر بۆ دامەزراندنی ئەم حوکوومەتە درێغی بۆ نەکەن. ئەو لەوێوە لە دروستکردنی ئەم کار و فرمانەدا بوو، لەم لاشەوە لە وڵاتی سولەیمانی و شوێن هەواری بابانەکان هەر لەو سەردەمانەدا «شێخ مەحمووی شێخ سەعید»یش خەریکی گێڕانی دەوری کوردایەتی بوو.

«عەباس خان» لەو سەردەمانەدا کە هێشتا بە ناوی حوکمدارییەوە نەهاتبووەوە «سنە» هەر جارە لە «ڕەوانسەر»ەوە دەستدرێژی بۆ کرماشان و دەور و بەری کرماشان ئەکرد، دەنگ و ئاوازی «سالار الدوله»ش لەو وەختانەدا لەو ناوەدا باوێکی باشی هەبوو، ئەویش بۆ سەندنەوەی تەختی ئێران ـکە گۆیا لێی زەوت کرابوو ـ لەبەر ئەوە هەر دووکیان شەرێکی یەك دەردبوون، «سەردار ڕەشید» لەگەڵ ئەویشا قسەی کردبوو. جا لەو دەورانەدا پەلامارێکی مەردانەی دایەسەر کرماشان، موحەممەدخانی کرماشانی ـکە ئەویش کرماشانی داگیر کردبوو ـ گرتی و کوشتی و وڵاتی کرماشانی بەتەواوی داگیر کرد، دیارە لەو سەردەمەدا کە حوکمڕانی وڵاتی «سنە» و ئەردەڵان بۆ حوکمداری کرماشانیشی هەر دەنگی ئەدایەوە، لەم ماوەیەدا کە لە «سنە» بوو عەلی ئەکبەرخانی سنجاوی ـکە ئەویش پیاوێکی ناودار و بەدەسەڵاتی عەشایری بوو ـ هاتە «سنە» ئەویش فەرمانداری «سەردار ڕەشید»ی گرتە دڵ.

«سەردار ڕەشید» ماوەیەك بەم جۆرە بە ناوی حوکمدارییەوە لە سنە ڕایبوارد و حوکمی لەو ناوەدا ڕەوا بوو. پاشان وردە وردە شەڕی (١٩١٤ـ١٩١٨) بەسەر چوو و هەر پاشەلەقەکەی مایەوە، حوکوومەتی ئێران تۆزی بووژایەوە، لەم لاشەوە ئەعیان و سەرمایەدارەکانی

«سنە» لەبەر ئەوە کە زۆرتر حوکوومەتی بێگانەپەرەست و ئاژاوەچی بوون، «سەردار ڕەشید» سەیری کرد مانەوەی لە «سنە»دا وەنەبێ قازانجێکی تیابێ، وای بە باش زانی ئەو شوێنی حوکمڕانییەی لە سنەوە بگوێزێتەوە بۆ «ڕەوانسەر».

شەو لە ناوێك عەلی نەقیخانی «آصف الدیوان» ـ کە یەکێك بوو لە پیاوە هەرە بە دەسەڵات و خاوەن مڵکەکانی سنە، وە لەبەر ئەوە کە ئەم پیاوە هەموو دەورێك هەر ئاگری بن کا بوو بۆ «سەردار ڕەشید» ـ بە ناوی فڕاندنەوە فڕاندی و گەڕایەوە بۆ ڕەوانسەر. پاش ماوەیەك بە تکا و پاڕانەوەیەکی زۆری پیاوماقووڵەکانیتری سنە بەرانبەر بە پارەیەکی زۆر «ئاسەف»ی بەرەڵا کرد.

کە سەردار لە سنەدا نەما حوکوومەتی تاران بە ناوی حوکمدارییەوە «عەلی موحەممەدخانی «شریف الدوله»ی نارد بۆ سنە. «شریف‌الدوله» لە (١٣٣٧ی هیجری) چووە سنەوە و دەستی کرد بە توند و تیژی و سیاسەت بەکارهێنان. لەو لاوە سەردار ڕەشیدیش هەر داوای سنە و وڵاتی ئەردەڵان ئەکا و هەر جارە ئەیەوێ هێرش بکا بۆ دەرپەڕاندنی «شریف‌الدوله» لە ناوشار!.

«شەریف‌الدوله» پیاوێکی فێڵباز و پیلان گێڕ بوو؛ لە وەختی تیژیدا توندی ئەنواند و لە وەختی کولیدا نەرمی! سەیری کرد مانەوەی سەردار ڕەشید بەو جۆرە بۆ ئەو دەست نادا، وە بەشەڕ و شۆڕیش چاری ناکا، هێنای کەوتە پیلان بازییەوە لە گەڵیدا، خەبەری بۆ نارد کە:

«لەبەر ئەوە لەمسەردەمانەدا و لەمناوەدا «سالارالدوله» دەنگ و ناوی هەیە و بە تەمای ئەوەیە کە بە پشتیوانی کوردەکان تەختی ئێران و حوکوومەتی تاران وەربگرێتەوە، حوکوومەتی تاران لەبەر ئەمە کەوتۆتە پەرۆشەوە، ئێستە حوکوومەتی شاهەنشاهی «ئەحمەدشا» بڕیاری لەسەر ئەوەدا کە حوکوومەتی ئەردەڵان بۆ تۆ بێت، بۆیەش ئەم بڕیارەی دا چونکە ئەگەر حوکوومەتی ئەردەڵان بۆ تۆ بێت تۆ هەر ئەوەت ئەوێ و ئەوا دەستت کەوت و ئەشبیت بە پشتیوانی حوکوومەتی تاران، بەڵام ئەگەر «سالارالدوله» بێت ئەو وەختە ئەو داوای حوکوومەتی تارانیش ئەکا و بۆی ئەکەوێتە تەلاشەوە، وە منیش ناتوانم ئێستە سنە بەجێ بێڵم و بێم بۆ لای تۆ، چونکە هەرکە بەجێم هێشت

«سالارالدوله» دێتە ناوشارەوە، لەبەر ئەوەکە لە (١٣٢٣)دا لە لایەن شابابایەوە (مظفرالدین شا) حاکمی سنە بووە و لەگەڵ هەموو پیاوماقووڵ و کاربەدەستەکانا ئاشنایەتی هەیە، ئەهلی شار مەیلی ئەو ئەکەن و ئیتر دەرچوونی لە ناوشار جارێکیکە نابێتەوە.

لەبەر ئەم شتانە کە بۆم باس کردیت تۆ وەرە بۆ «سنە» حوکوومەتەکەت تەسلیم ئەکەم و من بە ناوی حوکمەوە ئەچم بۆ وڵاتی شیراز و ئەسفەهان!)».

ئەم قسە خۆشە کوێستانییانە کارێکی باشیان کردە سەر دڵی سەردار ڕەشید و دڵیان فێنك کردەوە! بەبێ گیروگرفتی لە [٢٣ی جمادی‌الاولی ١٣٣٨]دا بە چەند کەسێکەوە بە تەمای بنج بەستکردنی ئەمارەتی لە دەستچووی ئەردەڵانەوە گەڕایەوە ناوشاری سنە و شوێنی میوانداری لە لایەن «شریف‌الدوله»وە بۆ چاك کرابوو چووە ئەوێ، چەند ڕۆژێك خزمەتێکی شاهانە کرا؛ خزمەتێکی وا کە مەگەر هەر «شریف‌الدوله» بۆ سەردار ڕەشیدی کردبێ!.

لە ئاخرا لە ڕۆژی (١١ی جمادی‌الثانی)ا بانگێشتنێکی تایبەتی بۆ کرد لە سەرای حوکوومەتیدا «دەرماڵ» بۆ ئەوە ئەو ڕۆژە لەوێ کاروباری ئەمارەتی ئەردەڵانی تەسلیم بکا!. سەردار هەڵسا و چوو، لە پاش هەندێ قسەکردنی کەم «شریف الدوله» گرتی و لە پاش (١٥) ڕۆژ ناردی بۆ تاران!.

سەردار ماوەیەك لە تاران بە بەندی مایەوە، لە ئاخر و ئۆخری ساڵی (١٣٣٩)دا «سید ضیاءالدین»ی تەباتەبایی وەزارەتی ئێرانی گرتە دەست و لە دەورەی ئەودا سەردار ڕەشید بەرەڵا بوو گەڕایەوە بۆ وڵاتی ڕەوانسەر، پاش بەینێك دیسان کەوتەوە کۆکردنەوەی خۆی و لە (١٣٤٠)دا کەوتەوە قسەکردن لەگەڵ عەشایرەکاندا هەر بۆ سەندنەوەی ئەمارەتی ئەردەڵان، دەستەیەکی باش لە ڕەوانسەری و جوانڕۆیی و سنجاوی پێکەوە نا و دیسان ناو و دەنگی بڵاو بووەوە.

لەم دەورانەدا «ڕەزاخان» وەزیری جەنگ بوو، سەرلەشکرێك هەبوو «ئەمیر ئەحمەدی»یان پێ ئەوت و لە کرماشان بوو، ڕەزاخان فەرمانی چارکردنی سەردار ڕەشیدی کردە سەر ئەم ئەمیر ئەحمەدییە. ئەمیر ئەحمەدی لە پێشا هات جافرسان و مەحموودخانی دزڵی و حسێن خانی ڕەزاو و گەلێ گەورەی‌تری کۆ کردەوە و سوێندی

پێ خواردن کە بە پشتیوانی حوکوومەتی ئێران سەردار ڕەشید لەناو بەرن!. ئەوانیش بۆ لەناوبردنی کوردێکی وەکوو سەردار ڕەشید هیچ درێغیان نەکرد و سوێن خوار بوون!.

سەردار ڕەشید ئەم خەبەرەی وەرگرت، بە (٤٥٠٠) سوارێکەوە پەلاماری هێزی عەشایر و جافرسانی، لە کێوەکانی «شمشێر» جەنگ هەڵگیرسا، هێزی جافرسانیش زیاتر لە (٤) هەزارێك بوو. لەبەر سەختی شوێنەکە و بەفر و سەرما سەردار ڕەشید هیچی پێ نەکراو گەڕایەوە بۆ وڵاتی ڕەوانسەر. پاش ئەوە ئەمیر ئەحمەدی دیسان ئەچێتەوە سەری و ڕەوانسەریشی پێ بەجێ دێڵێ. سەردار کە زانی هیچی بۆ ناکرێ و بە هەر لایەکدا کە ئەڕوا کوردە بێگانەپەرستەکان هەر پەلاماری ئەدەن یەکسەر ئەچێ بۆ هەمەدان و لەوێ خۆی ئەدا بە دەستەوە و لەوێشەوە ئەینێرن بۆ «تاران» و لەوێ ئەمێنێتەوە بە ناوی بەندییەوە.

پاش مانەوەی ماوەیەك ئاژاوەیەك لە تاران دەستی پێ کرد، سەردار ڕەشید ئەمەی بە هەل زانی خۆی گۆڕی و هەڵات، هاتەوە بۆ ڕەوانسەر و دیسان کەوتەوە ئیش کردن، ئەمجارەش دیسان کوردەکان عێل جارێکی تریان لێ کردەوە، ناچار لە پاش چەند شەڕێکی تر سەرلەنوێ وڵاتی بەجێ هێشتەوە و چوو بۆلای «شێخ مەحمووی شێخ سەعید»، لەوێش هیچی بۆ نەکرا، چوو بۆ «محمرە» بۆلای «شێخ خەزعەل» لەوێش هەر هیچ، چوو بۆ بەغدا. لەو وەختەدا «ڕەزاشا» لە بەغدابوو بۆ «نەجەف» ئەچوو، چووەلای و داوای لێبووردنی لێ کرد، ئەمجا گەڕایەوە بۆ کوردەواری بەهۆی شێخ «حسام‌الدین»ەوە لە ساڵی (١٣٤٢)ی هیجریدا چوو بۆ سنە، ئەو سەردەمە «مزەفەرخانی سەردار ئینتیسار» حاکمی سنە ئەبێ، تەلگرافێکی زۆر لەبارەی سەردار ڕەشیدەوە ئەکرێ بۆ تاران. لە ئاخرا حاکم، سەردار ئەنێرێ بۆ تاران و دیسان ئەکەوێتەگیری دەست بەسەری، تا ساڵی (١٩٤١) کە کاروباری ئێران تێکچووەوە قەسری قەجەر شکێنرا، سەردار ڕەشیدیش ڕزگاری ئەبێ، بەڵام ئیتر بە ئارەزووی خۆی هەر لە «تاران» دەرنەچوو ئێستەش هەر لەوێیە.

وەکوو تەماشامان کرد «سەردار ڕەشید» هەر لەدەورەی گەنجیەوە تا کەوتە ئەو ڕۆژی پیری و چاوکزبوونە لە ئەڵهای ئەمارەتی کوردی و حوکوومەتێکی کوردیدا بوو، هەموو جار کۆششەکانی بە هۆی چەند کەسێکی چڵێسی بێگانە پەرستەوە ئەدرا بەبادا.

سەیرتر ئەوە بوو ئەو کوردانە کە وەختی خۆی بە قسەی سەردارەکانی ئێرانی هەڵئەخەڵتان و ئەچوون بە گژ سەردار ڕەشیددا و نەیان ئەهێشت حوکوومەتی سەردار ڕەشید سەربگرێ، ئەو کوردانە لە پاش ئەوە کە ڕەزاشا شوێنی خۆی لە تەختی ئێرانا قایم کرد بەرە بەرە تێیان کەوت و بە هۆی سەرلەشکر ئەمیر «عبداللّەخانی طهماسبی»ەوە، یەکە یەکە گرتنی و لە تاران لە «قەسری قەجەر»ی توند کردن!. ئەگەر ساڵی (١٩٤١) نەبوایە و قەسری قەجەر نەڕووخێنرایە ئەوانە جارێکی کە شوێن هەواری خۆیانیان نەئەدییەوە. خۆ ئەوانەشیان کە دەربەدەر بوون وەکوو: جافرسان و مەحمووخانی دزلی ئەوە بە کەساسی لە گۆشەی شارانا سەریان نایەوە.

جا ئەمەیە ئاخری هەموو بێگانەپەرستیەك و هاوخوێن نەویستنێك!.

◈◈◈

# شۆڕشی شێخ مەحموود

لە ئاخر و ئۆخری دەورەی عوسمانییەکاندا لە هەموو لایەکەوە لە وڵاتە ئیمپراتوورییەکەیانا هەر ساتە نەساتێك ئاژاوە و هەرایەك پەیدا ئەبوو. وادیارە ئەمە لەبەر ئەوە بوو کە ئاو، ئەگەر زۆر مایەوە بۆگەن ئەبێ!. ئەمە و دیسان ئاورووپاییەکانیش هەر زۆر دەمێك بوو کە بە جۆرێکی «غەیرە موباشر» دەستیان خستبووە ناو حوکوومەتەکەوە، بەڵکوو لەوانە بوو چنگیان هاویشتبووە ناو کۆشکی پادشاکانیشەوە!. ئێجگار کە شەڕی ١٩١٤ـ١٩١٨ هەڵگیرسا ئەوەندەی‌تر بزووتنەوە و ئاژاوە لە هەموو لایەك زیاتر پەرەی سەند.

لە وڵاتی سولەیمانی «کاکە ئەحمەدی شێخ» و بەرەی کاکە ئەحمەد هەبوون. کاکە ئەحمەدی کوڕی شێخ مارفی نۆدیی، بە ناوی پیاوێکی زانای لە خواترسەوە ناوبانگی بۆ هەموو لایەك دەرکردبوو. ناوبانگی عیلمە فراوانەکەی شێخ مارفی نۆدیی باوکی و لەخواترسییەکەی خۆی ئەم دوانە پاڵیان پێوەنابوو بۆ ئەوە کە شایەکانی ـ ئیمپراتووریەتی عوسمان و شاهەنشاهی ئێران ـ وەکوو یەك بیناسن و یەك لە یەك زیاتر ڕێزی لێ بگرن.

وڵاتی سولەیمانی ئەو دەورە ـ وەکوو ئێستە ـ سەر سنووری بەینی بەشەخاکی شای عوسمانی و شای ئێران بوو، هەر لە دیوی سولەیمانی ئاوابوویتایە ئەچوویتە خاکی ئێرانەوە. هەرچەند سنوور بەناو هەبوو لە بەینی ئەم دوو حوکوومەتەدا بەڵام هاتوچووکردن ئەوەندە بە سانایی بوو وەکوو لە گەڕەکی شارێکەوە پیاو بچێت بۆ گەڕەکەکەی‌تری وابوو.

لەبەر ئەم تێکڵاوی هاتوچووە، وە لەبەر ئەوە کە سەر سنوورەکان هەموو کورد بوون و سنوور بە سیاسەت لە بەینیانا دانرابوو هەر دوو لەشایەکانی ئێران و عوسمانی ئەیانویست پیاوە گەورەکانی ئەو سنوورانە ڕاکێشن بۆلای خۆیان. بە تایبەتی پیاوێکی وەکوو «کاکە ئەحمەدی شێخ» پیاوێکی وا لە خواترس و زانا ـ کە مەرکەزێکی زلی هەبوو لەبەر چاوی مەردمەکە ـ ئەوە هەر زۆرتر ئەیانویست خۆیانی لێ نزیك خەنەوە. هەرچەندە ئەو لەبەر مەرکەزە دینیەکەی ـ کە داوای ئەوەی لێ ئەکرد شایەك و گەدایەك وەکوو یەك بزانێ ـ بەڵام شای عوسمانی لەبەر ئەوە کە لە وڵاتەکەیا بوو زیاتر حەزی ئەکرد بە نزیك بوونەوەی. ئەمانە هەموو کردبوویانە کارێ کە «کاکە ئەحمەد»ی سولەیمانی پایەیەکی

گەورەی هەبێ لە لای هەموو کەسێکەوە.

ڕۆژگار ڕۆژەکانی خۆی پەڕە پەڕە ئەدایە لاوە، دەنگی زەنگی قەومییەت وردە وردە لە وڵاتەکانا دەنگی ئەدایەوە وە یا ئەزرینگایەوە.

لە «١٩٠٨»دا بە ئیعتیباری ڕێزی بنەماڵەیی، شای عوسمانی ـ عەبدولحەمید ـ شێخ سەعیدی کوڕی سەید موحەممەدی کوڕی کاکە ئەحمەدی لە وڵاتی ئەستەمۆڵەوە بانگێشتن کرد بۆ ئەوە بچێت بۆ ئەوێ و بە چوونەکەی ئەوەندەی‌تر لەبەر ناوبانگەکەی «کاکە ئەحمەد» بنەماڵە لە خۆی نزیکتر خاتەوە. «شێخ سەعید» بە خۆی و هەندێ لە خزمەکانی و دوو کوڕەکەی ـ شێخ ئەحمەد و شێخ مەحموود ـ چوون و بە تایبەتی شێخ مەحموود چاوی بە کۆشکی پادشاهی کەوت و هەموو جۆرە پیاوانێکی وڵاتی عوسمانی لە پایتەختا ـ بینی و گوێچکەی زرینگایەوە لە دەنگی ئەو قەومییەتانە کە لە وڵاتەکانی عوسمانیدا ڕوویان ئەدا، بێجگە لەمەش باسی کوردایەتی بەرەی بەدرخانیەکانی لە گەلێ لە دیوەخانەکانی ئەستەمۆڵا ئەکەوتە بەر گوێ.

کارەساتی مووسڵ هەر لەو ساڵادا کە بوو بە هۆی کوژرانی شێخ سەعید و شێخ ئەحمەدی کوڕی، کارێکی گەورەی کردە سەر دڵی هەموو کەسێك. کە پاشماوەی کوژراو گەیشتەوە وڵاتی سولەیمانی دەستێکی‌تری خستە ناو دڵی خەڵکەوە. وەکوو ئەمەی کرد ئەوەشی بڵاو کردەوە کە بەدرخانیەکان لە وڵاتی خۆیان کۆششی دروستکردنی کێشوەرێکی کوردی ئەکەن. بوونی کێشوەرێکی کوردی بەرە بەرە لە مێشکی هەموو کوردێکا دەنگی ئەدایەوە.

شێخ مەحموود لەو دەورەدا نرخێکی بەرزی هەبوو؛ نرخی مەرکەزی دینی باوباپیری، نرخی بیروباوەڕی خۆی کە وڵاتانی دیبوو و چاوی کردبووەوە، نرخی گۆشەی پیلان و شەڕ و شۆڕ کە گەلێ جار لە وڵاتەکەی خۆیا جەنگ و هەرای ئەکرد. ئەمانە هەموو «شێخ مەحموود»یان گەلاڵە کرد بۆ ئەوە کە دەست بدا بە، نانەوەی شۆڕشێکی گەورەوە بۆ سەندنی سەربەخۆیی و ئازادی کورد.

وردە وردە تاپۆی جەنگی (١٩١٤ـ١٩١٨) نزیك بووەوە، لە تاپۆ دەرچوو و فەساڵە ناشیرینەکەی هێرشی کردە سەر هەموو سووچێکی دنیا و هەموو لایەکی شڵەژان،

خوێنی ڕژاوی مەیدانە جەنگەکانی ئەو شەڕە لە هەموو گۆشەیەکەوە لافاوی هەستان!.
ولاّتی سولەیمانی ولاّتی عوسمانی بوو، لە لایەکەوە ئینگلیز پەلاماری بۆ ئەدا، لە لایەکەوە ڕووس. لە هەر دوولاوە شێخ مەحموود کەوتە کوڕی شەڕەوە؛ لە (١٩١٧) لە «کوت و عمارە» لەگەڵ ئینگلیز شەڕی کرد ناوێکی دەرکرد، هەر لە ئاخری ئەو ساڵەشدا لە ولاّتی پێنجوێن لەگەڵ ڕووسیش شەڕی کرد ناوێکی‌تری دەرکرد.

لە [٣٠ تشرینی یەکەمی ١٩١٨] کە وەستانی شەڕی «موندوس» بڵاو کرایەوە «عەلی ئیحسان پاشا»ی سەرلەشکری بەناوبانگی تورك لە مووسڵەوە تەلگرافێکی بۆ شێخ مەحموود نارد کە بە ناوی حوکوومەتی عوسمانییەوە حوکمداری ولاّتی سولەیمانی بکات، وە ئەوی پێویستیش بێ لە پارە و ئازۆخە بیداتێ، تەنانەت پێنج هەزار لیرەیەکیشی بۆ نارد چ شێخ مەحموود، چ ولاّتی سولەیمانی ئەوەندەیان جەور و زوڵم لە دەستە و دایەرەی تورکەکان چاوپێ کەوتبوو هەموو لێی داخ بەدڵ بوون، «شێخ مەحموود» نرخێکی وای لە قسەکەی «عەلی ئیحسان پاشا» نەنا. بە پێچەوانەی ئەوە کە هاتەوە ناوشاری سولەیمانی تابوورێکی عەسکەری تورك لەوێ بوو، ئەم عەسکەرانە ڕێگەی گەڕانەوەیان بڕابوو چونکە ئینگلیزەکان کەرکووکیان لێ گرتبوون، بۆ ئەوە خۆی لە ئۆباڵی ئەو تورکانە ڕزگار بکا دایاننی بە ئینگلیزەکانی کەرکووك و خۆی بە نیازی بناغەدانانێك بۆ حکوومەتێکی کوردی لە تشرینی دووهەمی (١٩١٨) هاتەوە ناوشاری سولەیمانی.

ولاّتی سولەیمانی بەتەواوی لە ژێر چنگی عوسمانی دەرچوو. «مێجەر نۆئیل» حاکمی سیاسی ئینگلیز، ئەو سەردەمە لە سولەیمانی بوو، «ویلسن» حاکمی گشتی عێراق بوو لە بەغدا. سیاسەتی ئەو ڕۆژەی وای پێویست بوو کە حکوومەتێکی کوردی هەبێ. تازەش هاتبوونە ولاّتەوە هێشتا خەڵك لێیان تێ نەگەیشتبوون، ئەوان هەر بانگی ئازادی و چاوێری قەومە بەشخوراوەکانیان بە گوێ خەڵکدا ئەدا!.

کە زانیان «شێخ مەحموود» وا پیاوێکی لێهاتوو و بە دەسەڵاتە فیکریان هاتە سەر ئەوە کە یاریدەی بدەن. «شێخ مەحموود»یش دیارە بەبێ هیچ غایەلەیەك حەز ئەکا یەکێك هەبێ یاریدەی بدا و کوردستانێکی گەورەی سەربەخۆ دروست ببێ!.

ئەم هەمووشتانە یەکیان گرت ئەمجا «نۆئیل» بە قسەی «ویلسن» لە (تشرینی

دووهەمی ١٩١٨) کۆبوونەوەیەکی لە ناوشاری سولەیمانی کرد و بانگێشتنێکی گەورەی بۆ هەموو پیاوماقووڵی ناوشار و سەرۆك عەشایەرەکان کرد و لەوێدا [شێخ مەحموود] ناونرایە «حوکمداری کوردستان». ئەوی پێویست بوو، بۆ ئەم حوکمدارییە هەمووی بەجێ هێنرا، [مێجەر نوئێل] بوو بە «موستەشاری مەلەکی» و «مێجەر دانلیس» بوو بە موستەشاری عەسکەری بۆی و بۆ حوکوومەتی کوردستان. مانگانەی حوکمداریش (١٥) هەزار رووپیە بێت.

ئەوا سولەیمانی بوو بە پایتەختی حوکوومەتی کوردستان و ئەم ناوە دڵخۆشیەکی گەلێ زۆریدا بە کورد، بەرە بەرە وڵاتانی پشدەر و خۆشناو و جاف و کوردەکانی ئەو دەورە بە بۆنی حوکوومەتی کوردستان زیاتر دڵ قایم ئەبوون و سەریان لێ ئەدا. ئیتر سولەیمانی بوو بە ناوچەیەکی سیاسی کورد.

لێرەدا کە ئینگلیز یارمەتی حوکوومەتی «شێخ مەحموود»ی ئەدا وەنەبێ لەبەر چاوی کاڵی کورد بووبێ، بەڵکوو گەلێ مەبەستی هەبوو؛ لەولاوە وڵاتی سووریە و بەغدای هێشتا بۆ دانەمەزرابوو، بە تایبەتی حوکوومەتی عێراق هەر دروست نەبووبوو، حەزی بەوە ئەکرد لە وڵاتی کوردەواری حوکوومەتێك ببێ و ئەم حوکوومەتەش بەتەواوی وە یا بە ناتەواوی لە ژێر چاوێری ئەوابێ، لەولاشەوە وڵاتانی [بەغدا و بەسرە] ئەگەر لەگەڵ سووریەدا نەبن بەیەك حوکوومەت، ئەمارەتێك بێ وەکوو ئەمارەتەکانیتری ئەو وڵاتانەی عەرەبستان.

لەمانەش هەموو زیاتر پاشەلەقەی تورکەکان لە وڵاتانی ڕواندز و «پەسۆی» تۆزی ئەکرد!. ئەوان هێشتا دانی سولەیمانیان نەکەندبوو، وڵاتی سولەیمانی بە هیچ لەوان داناپچڕی مەگەر تەنیا بە بوونی حوکوومەتێکی کوردی نەبێ. مەسەلەی [مووسڵ]یش کە لە بەینی سوێندخوارەکان و ئەولادا کێشەیەکی زۆری تێدا مابووەوە ئەویش هەر لە کایەدا بوو[1].

١. بەڵێ کۆبوونەوەی [تشرینی دووهەمی ١٩١٨]ی ناوشاری سولەیمانی «دانلیس» لە ژێر لێوەوە ئەیوت لێرەدا مەبەست دروستکردنی حوکوومەتێکی تەواو نییە بۆ کوردستان بەڵکوو مەبەست حوکمدارییە و هیچیتر. وە «ئیدمۆندس»یش لە کتێبەکەی خۆیا ئەڵێ: «ئینگلیزەکان هەرگیز نەیانوتووە کە حوکوومەت بۆ کوردستان دروست ئەکەن!.». ئەو دوو کەسە ئەم دوو قسەیە ئەخەنە بەرچاوی عالەمەوە، هەر یەکەش بۆ ئەوە کە خۆیان لە ژێر ئۆباڵێك دەرکەن.

**ئەم جۆرە شتانە هەموو پاڵیان بە ئینگلیزەوە ئەنا بۆ بوونی حوکوومەتێکی کوردی لە سولەیمانیا و پاشان لە هەموو وڵاتی کوردەواری ئەو ناوەدا. حوکوومەتی شێخ مەحموود، یا لە ڕاستیدا بەمەی نەئەزانی، وە یا هەندێ لە دەور و پشتەکانی نەیانئەویست ئیش بەم جۆرە بڕوا.**

---

[دانلیس] گەلێ مەبەستی هەبوو بەو قسەیە؛ یەکێك لەوانە ئەوە بوو کە ئەوان قسەیان دابوو بە «فەلە»کان حوکوومەتیان بۆ دروستکەن، وە فەلەکان دیارە گەلێ گیانبازتر بوون بەرانبەر بە ئینگلیز، ئەگەر هی ئەوان ببوایە بوونی حکوومەتێکی کوردی لەو وڵاتەدا ئیتر کەڵکێکی وای نەئەبەخشی بۆ ئینگلیز. کەچی لە لایەکی تریشەوەسەیری ئەکرد [عەلی ئیحسان پاشا] وا لە سەر چزە و پەیتا پەیتا قسە لە «شێخ مەحموود» ئەگێڕێتەوە کە حوکمداری وڵاتی کوردستان بکا. ئەگەر لێرەدا ئینگلیز وازدێنێ [شێخ مەحموو] بە ناوی حوکوومەتی عوسمانیەوە ئەبێ بە حوکمدار و ئیش لە دەست ئەم دەرئەچێ!. ئەگەر وازنایەنێ لەولاوە قسەی بە فەلە داوە و ئەزانێ فەلەش بۆ ئەو بەکەڵکترە تا کورد. وەکوو کابرا وتی: «دارێکی بە دەستەوەیە هەر دوو سەری...!.».

کە واتە نەوەڵڵا بەناوی حوکمداریەوە دێتە مەیدانەوە و لە ڕواڵەتادان بە حوکوومەتی کوردستانا نانێ، ئەگەر لە ئاخردا حوکوومەتی کوردستان سەری گرت، ئەوا ئەو پەیمان و قسانەی کە بە «فەلە»کانی داوە ئەتوانێ پینەی بکاو بڵێت ئەوان زۆریان کرد لە ئێوە و منیش باشارم نەکردن و ئاو و هەواش ئێستە بۆ دروستکردنی حوکوومەتێك بۆ ئێوە دەست نادا!. خۆ ئەگەر حوکوومەتی کوردستانیش سەری نەگرت ئەوە پڕ بە دەم بانگ ئەکا ئەڵێ: باوکم من کەی وتوومە حوکوومەت بۆ ئێوە دروست ئەکەم؟!.. وەکوو چۆن پاشماوەکانیان ئیتر هەمووجار ئەم قسەیەیان گرتبوو بە دەمەوە کە ئەیانوت: ئینگلیز کەی وتوویەتی من حوکوومەت بۆ ئێوە دروست ئەکەم؟!.. ئەگەر ئەم قسەیانە ڕاستبێ کەوایان نەوتبوو بێجگە لە دروەکە زیانێکی گەورەیان کرد، چونکە حوکوومەتی [فەلە]شیان بۆ دروست نەبوو!.

ئەمێنێتەوە سەر قسەکەی «ئیدموندس» کە ئەڵێ: «هەرگیز ئینگلیز نەیوتووە حوکوومەت بۆ کورد دروست ئەکا». [ئیدموندس] بەو ناوەوە کە ئینگلیزێکە یادداشتێك ئەنووسێتەوە ئەمەشی هەر لە عالەمیەتی کە لە پاش ٣٨ ساڵ بەسەرکارەساتدا، کارەساتێکی وا کە سەری نەگرت، ئەو تازە بێنێ ئەو قسەیە زیندوو بکاتەوە لە ئینگلیز و بڵێت: «ئینگلیز وتی بە کوردەکان حوکوومەتتان بۆ دروست ئەکەم و کەچی نەشی کرد!.». دان نان بە قسەیەکی وا لە پیاوێکی ئینگلیزەوە بەرانبەر بە ئینگلیز شتێکی زۆر دوورە. بەڵێ ئینگلیز کارەساتی عیلمی بە جوانی باس ئەکەن بەڵام لە ڕەوشتی ئینگلیز نییە کە پشتی یەك بدەن بە عەرزا. ئەگەر ڕۆژ لەوەدا بوایە کە حوکوومەتەکە سەری بگرتایە ئەو وەختە نەوەك یەکێ، بەڵکوو هەموویان هاواریان ئەکرد کە ئێمە دروستمان کردووە!..

لەگەڵ ئەمانەشا کارەسات و مەنتق هەموو پشتیوانی ئەوە ئەکەن کە ئینگلیز وە یا [دانلیس]بە تەواوی دانیان نابێ بەوەدا کە حوکوومەتی کوردستانی [شێخ مەحموود] ئەبێ ببێ و ئەو زروفانەی پێشوو کە باسکران هەموویان پاڵ بە ئینگلیزەوە ئەنێن کە دان بە حکوومەتی کوردستاندا بنێ و بە ئاشکراش بیڵێ، بەڵام پاشەڕۆژ بە جۆرێکی تر هەڵیبگێڕنەوە ئەمە شتێکی ترە، وەکوو هەڵیانگێڕایەوە و هەموو وەخت ئەڵێن قسەی وامان نەکردووە و نەوتووە!.

ئیش هەر جۆر بوو، [شێخ مەحموود] کەوتە سەر ئەوە کە دەستی ئینگلیز لە حوکوومەتی کوردستانا نەیەڵێ، بەڵام هاتنە پێشەوەی فرمانەکانی [شێخ مەحموود] جۆرێکی تری لە ئینگلیز ئەگەیاند؛ ئەوەی تێ ئەگەیاندن کە گۆیا [شێخ مەحموود] خەریکە ئەوان دەرپەڕێنێ و دەستی تورك لە وڵاتی «سولەیمانی»دا بخاتەوە کایە. ئەم گەنە باوەڕە بوو بە هۆی ساردی بەینی ئینگلیز و حوکوومەتی کوردستان.

هەرچەندە سەرۆکی عەشرەتەکانی وڵاتی سولەیمانی و گەلێکیش لە هینەکانی کوردەواری ئێران مەزبەتەیەکی گەورەیان لە سولەیمانی کردەوە لە لایەن ئەوەوە کە [شێخ مەحموود]یان قەبووڵ کرد بە حوکمداری کوردستان و دایان بە ئینلگیز، بەڵام کە ئینگلیز سەیری کردەوەکانی تری حوکوومەتی کوردستانی ئەکرد نەئەچووە دڵیەوە ئەو مەبەستەی ئەو هەیەتی بە حوکوومەتی کوردستان، حوکوومەتی کوردستان ئەوەی بۆ پێك بێنێت.

لەبەر ئەمە کەوتە تەقە، لە «شێخ مەحموود» و وردە وردە جارێ مانگانەکەی کەم کرایەوە، ئەمجا کەوتە زرنگاندنی ناوەکەی لەناو عەشایرەکاندا، لەمەوە کەوتە سەر ئەو فیکرە کە ناوی حکوومەتی کوردستان هەر بەتەواوی هەڵبگرێ، پڕوپاگەندەیان لەناو عەشایرەکانا بۆ ئەم مەبەستە کەوتە جرت و فرتکردن، جەنابی «مێجەرسۆن»یش لەو سەردەمانەدا کە لە وڵاتی سولەیمانی بوو، ئەویش بۆ تێکدانی ئەو جۆرە حوکوومەتەی [شێخ مەحموود] بە هەموو هێزێکیەوە کەوتە ئیش‌کردن، سەرەڕای ئەوەش دەستی دا بە جەور و ستەمێکی واوە کە ئەو سەری دیار نەبێتەوە. مەردم هیوای ئەوەیان بوو کە ئینگلیز ڕزگارکەری قەومە بچووکەکانە، وا ئەمانیش ڕزگاریان بوو، کەچی زوڵم و زۆری ئەو گەلێ لە هی دەوری تورکەکان خراپتر بوو!.

ئەمجا [شێخ مەحموود]یش کە ساردی بەینی خۆی و ئینگلیزی بەتەواوی بۆ دەرکەوت ناچار ئەویش کەوتە خۆی و کەوتە قسەکردن لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتەکانا، مەبەستیشی لەمەدا ئەوەبوو بزانێ ئاخۆ کامیان لەلای ئەون و کامیان لای ئەو نین تا بتوانێ ئەمجارە شۆڕشێکی ڕاستەقینە بەرانبەر بە ئینگلیز بنێتەوە.

ئەمە لە مارسی (١٩١٩)شدا، خەبەری ناردبوو «مەحموودخانی دزلی» کە بە ناوی - زیارەتی مەرقەدی کاکە ئەحمەد - ەوە بە لەشکرەوە بێت بۆ سولەیمانی، ئەمانەی هەموو

کرد، [مەحموودخان]یش بە لەشکرێکی کۆکەوە خۆی گەیاندە ناوشار، ئەمجا لە [٢١ مارسی ١٩١٩]دا بە هەموو مەعنایەك سەری هەڵدا و ئەو کاربەدەستە ئینگلیزانەی کە لە سولەیمانی بوون گرتنی و شۆڕشی خۆی بەرانبەر بە ئینگلیز بڵاو کردەوە. لەولاشەوە لە لایەن هەورامیەکانەوە هەڵەبجە گیرا و ئەم ناوچانە هەموو کەوتنە ژێر فەرمانی حوکمداری شێخ مەحموودەوە.

ئینگلیزەکان بەم ئیشە ئێجگار شڵەژان و بەتەواوی لەگەڵ حوکوومەتی کوردستانا لێك ئاشکرا بوون. ئەمجا لە ڕێگەی کەرکووکەوە لەشکرێکی زۆریان بۆ گرتنی شاری سولەیمانی و لەناوبردنی حوکوومەتی کوردستان نارد. کە حوکمدار ئەم خەبەرەی زانی ئەمیش لەشکرێکی نارد بۆ بەربەستکردنی ئەو لێشاوە. هەرجارە لەشکری کوردستان سەر ئەکەوت و شکان و گەڕانەوە ئەبوو بە بەشی لەشکری ئینگلیز.

لێرەدا ئینگلیزەکان بەتەواوی کەوتنە خۆیان، بەو شکانی یەك لەسەر یەکەیان تووڕە بووبوون، کەوتنە سەر ئەوە کە ناوی خۆیان بسێننەوە. جارێ لەشکرێکیان نارد بۆ وڵاتەکانی خانەقی، کفری و گەرمیان کە نەیەڵن کوردەکانی ئەو ناوە لەگەڵ حوکوومەتی کوردستان یەك بگرن. خۆیشی لەملاوە بە لەشکرێکی پڕهێز و هەموو جۆرە چەکێکی هەوایی و سەرزەوییەوە وەکوو لێشاو ڕوو بە «چەمچەماڵ» و «دەربەندی بازیان» و «تاسڵووجە» بەڕێکەوت بە نیازی گرتنی سولەیمانی.

لەشکری کوردستان لە ژێر سەرکردەیی «شێخ مەحموود» خۆیا لە تاسڵووجە بەرەنگاریان بوون، بەجۆرێکی زۆر پێس شکاندنیان و بەرەو دوابوونەوە، لەشکری «شێخ مەحموود» دەس لەسەر شان ڕاویان نان تا کردیانن بە دەربەندی بازیانا، لێرەدا یارمەتییەکی فراوان لە کەرکووك و مووسڵەوە گەیشتە فریایان و خۆیان گرتەوە.

لەشکری ئینگلیز وەکوو خۆڵ و ڕشتە بەسەریەکا هەڵدرابوونەوە؛ گورگە و سیك و پیاوخۆر و [مەغول] تا چاو کاری ئەکرد دەشت و دەری پڕ کردبوو!. هەرچەندە لەشکری «شێخ مەحموود» بەرانبەر بەو لەشکرە هەر زۆر هیچ بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا دیسان گومان لە سەرکەوتنی لەشکرەکەی ئەماندا هەر نەبوو. ئەوەندە هەبوو وەکوو ئەڵێن بە شارەزایی و پێشڕەوی «موشیری حەمەی سلێمانی هەمەوەن» دەستە ئینلگیزێکی

زۆر لە کلکەی شاخەکەی دەربەندەوە هاتن بەم دیوا ـ دیوی سولەیمانی ـ و پشتیان لە لەشکری کوردستان بڕییەوە. لەشکری لای شێخ بەمەی نەزانی، کاتێك پێیان زانی بەر و دوایان لێ گیراوە!.

شەڕ گەرم بوو، هەرچەندە بەرەی شێخ جەنگێکی مەردانە و بە کوڵیان کرد بەڵام لەبەر ئەوە لە هیچ لایەکەوە دەرفەت نەما بوو لە ٩١٩/٦/٩ لەشکر شکاو «شێخ مەحموود» بریندار بوو کەوتە بن بەردێك کە ئێستە پێ ئەڵێن «بەردەقارەمانە». ئینگلیزەکان ئەهاتن بە ناو بریندار و کوژراوەکاندا ئەگەڕان و ئەیانویست [شێخ مەحموود]یان دەستکەوێ. هەر بەشارەزایی «مشیر» شێخیان ناسیەوە و بردیان. هەر بەو شاڵاوەوە هاتن سولەیمانیشیان داگیر کردەوە.

کە شێخ مەحموود گیرا بردیانە بەغدا، لە پاش بەینێك لەگەڵ «شێخ حەمە غەریب»دا دران بە دیوانی عورفی ـ کە ئەندامەکانی هەموو ئینگلیزبوون ـ لە پاش موحاکەمەیەکی ڕواڵەتی لە (٢٥ی تەمووزی ١٩١٩) حوکمی خنکاندنی شێخیان دا و پاشان حوکمەکەیانی گۆڕییەوە بە حەپسی هەتا هەتایی و لەگەڵ «شێخ حەمە غەریب» ناردیانن بۆ «ئەندامان» لە هیندوستان. بەم جۆرە پەردە بەسەر دەوری یەکەم حوکمداری، حوکمداری کوردستانا درایەوە. لەم لاشەوە وڵاتی سولەیمانی و دۆستەکانی شێخ مەحموود کەوتنە گێژاوی حوکمی نارەوای ئینگلیزەوە، ئەوی پێ ئەکرا ڕێگەی دەشت و دەر و شاخەکانی ئەگرت و ئەوەش کە پێ نەئەکرا لە ژێر جەوری ئینگلیز ئەتلایەوە.

❋ ❋ ❋

ئەوەی کە شایانی زیاتر باس لێوەکردن بێ لەم دەورەی حوکمداری یەکەمی شێخ مەحموودەدا ناردنی ئەو یادداشتە بوو بۆ کۆنگرەی «ڤەرسای» لە لایەن داواکردنی حقووقی کوردەوە.

دەورەی حوکوومەتی عوسمانی و ئەستەمۆڵ هەتا ئەهات پیرتر و بێفەرتر ئەبوو، پیاوە دیکتاتۆرەکانی بەرانبەر بەو قەومانە کە کەوتبوونە ژێر سایەی ئیمپراتۆرییەتەوە هەتا ئەهاتن خراپە و خراپەکارییان زیاتر ئەکرد، قەومەکانی ژێر بەیداخ هەموو دەمێ لە کۆششی ئەوەدا بوون کە چارێك بۆ ڕزگارکردنی خۆیان بدۆزنەوە.

یەکێك لەو قەومانە قەومی کورد بوو، ئەمانە بەتەواوی بە تەنگ هاتبوون. پایتەخت ئەستەمۆڵ بوو، شوێنی گەلێ پیاوی گەورە و ناوداری هەموو قەومەکان بوو، لە کوردەکانیش زۆر کەس لەوێ بوون. ئەمانە کەوتنە سەر ئەوە کە کۆمەڵێکی سیاسی دامەزرێنن و لە ژێر سێبەری ئەم کۆمەڵەدا داوای بەش خوراوی کورد بکەن.

لە (١٩٠٨)دا گەورە پیاوەکانی کوردی ئەو سەردەمە: (ئەمین عالی بەدرخان، فەریق شەریف پاشای کوڕی سەعید پاشا، شەهیدی وڵات شێخ عەبدولقادر، «داماد ئەحمەد ذوالکفل پاشا») بە ناوی «کۆمەڵی بەرزی و سەرکەوتنی کورد»ەوە کۆمەڵێکیان دانا و ئەمانە کەوتنە ئیش‌کردن. دیکتاتۆریەتی توورانی لە پاش بەینێك کۆمەڵەکەی هەڵگرت، ئەوەندە هەبوو ئەندامانی کۆمەڵ بە جۆرێکی نهێنی هەر وازیان لە ئیش‌کردن بۆ کورد نەهێنا.

جەنگی (١٩١٤-١٩١٨) بەسەراهات، سەرەتا حوکوومەتی عوسمانی لای وا بوو بە پشتیوانی ئەڵمانەوە سەرئەکەوێ و ئەو وەختە بە ئارەزووی خۆی ئەکەوێتە کوشتن و بڕینی قەومەکانی ژێر دەستەی ـ کە دوژمنی هەرەگەورەی ناو قەومەکانیشی قەومی کورد بوون ـ

شەڕ دوایی هات و سوێندخوارەکان سەرکەوتن و بەڵکوو موتارەکەش کەوتە ناوەوە. لە ئیتیحادییەکان حوکوومەتێکی مامناونجی لە ئەستەمۆڵ دامەزرا، قەومە بەش‌خوراوەکان ـ کە یەکێك لەوانە کورد بوو ـ پشوویەکیان پێداهاتەوە، بە تایبەتی پیاوەکانی کورد دیسان سەریان بەرز کردەوە و کەوتنە ئیش‌کردن، هەر ئەوەندە نەء، بەڵکوو بە ئاشکرا کەوتنەوە داواکردنی سەربەخۆیی و ئازادیی کورد.

لێرەدا «بابی عالی» کەوتە دانانی دەستەیەکی وزاری بۆ جێ‌بەجێ کردنی مەسەلەی کورد، هەیئەت لەم ئەندامانە دروست بوو:

«ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری شێخولئیسلام، عەبوق پاشا نازری ئەشغاڵ، عەونی پاشا نازری دەریایی» وە لە کۆمەڵی بەرزی کوردستانیش هەیئەتێك دروست بوو کە ئەندامەکانی: «ئەمین عالی بەدرخان، مراد بەدرخان، شێخ عەبدولقادر ئەفەندی» بوون. ئەمانە تێکڕا لە [بابی عالی] کۆبوونەوە و دەربارەی کورد ئەم بڕیارانەی خوارەوەیان دا:

١ـ کوردستان سەربەخۆیی زاتی بدرێتێ بەو مەرجە کە لە ژێر سێبەری عوسمانیدا بمێنێتەوە.

٢ـ بە زوویەکی زوو ئەم سەربەخۆییە بڵاو بکرێتەوە و چی بۆی پێویستە جێبەجێ بکرێ.

ئەم بڕیارانە درا، بەڵام ڕۆژ و مانگ بەسەر ئەچوو و هیچ بەرێکی دیار نەبوو. لە ئاخرا «کۆمەڵی بەرزی کورد»، «کۆمەڵی جێبەجێکردنی کاروباری کۆمەڵایەتی»، «کۆمەڵی سەربەخۆیی کورد» ئەمانە هەموو کۆبوونەوە و «شەریف پاشا»یان هەڵبژارد ـ کە ئەو سەردەمە شەریف پاشا لە پاریس بوو ـ بۆ ئەوە بچێ لە کۆنگرەی ئاشتی قسە لە باس و خواس و سەربەخۆیی کوردەوە بکا. لە پاش دوان و قسەکردن قسەی هەموو کۆمەڵە کوردییەکان هاتە سەر ئەوە کە:

١ـ شەریف پاشا لەگەڵ «یوغوس نەوبار پاشا» سەرۆکی نێرراوە ئەرمەنییەکان لە «پاریس» یەك بگرن و بە جووتە قسە لە کاروباری کورد و ئەرمەنەوە بکەن.

٢ـ ئیشێکی وا بکەن کە ئەم بەندانەی خوارەوە تێکڵاوی پەیمانی «سیڤەر» بکرێ ـ کە ئەو پەیمانە لە (١٠ی ئاغستۆزی ١٩٢٠]دا کرابوو. وە بە حوکوومەتی عوسمانیش ئیمزا کرابوو. بەندەکانیش بەندی «٦٢، ٦٣، ٦٤» بوون کە ئەمانەن:

**بەندی «٦٢»**

«هەر یەکە لە حوکوومەتەکانی فەرەنسە، ئینگلیز و ئیتالیا سەرو ئەندام ئەنێرن و ئەم ئەندامانە لێژنەیەکی سێ قوڵی لە ئەستەمۆڵ پێك دێنن، بە شەش مانگ دوای بەجێهێنانی ئەم پەیمانە سەربەخۆییەکی ناوچەیی ئامادە ئەکا بۆ ئەو شوێنانە کە کوردی تێدا دانیشتوون و کەوتوونەتە ڕۆژهەڵاتی «فورات» و جنووبی ڕۆژئاوای ئەو سنوورە کە لە دواییدا دائەنرێت بۆ ئەرمەنستان و شیمالی ئەو سنوورە کە «سووریە» و «میزۆپۆتامیا» لە یەك جیائەکاتەوە. ئەمەش بە پێی ئەو تەعلیمات و دەستووراتانە کە لە بەشی (٢ و ٣) بەندی (٢)ی ژمارە (٢٧)دا باسکراوە.

بەڵام ئەگەر هات و ئەم ئەندامانە لە هەندێ شتدا، وە یا لە هەموویا قسەیان یەکی نەگرت هەریەکەیان ئەبێ لەم لایەنەوە حوکوومەتەکەی خۆیان ئاگادار بکەن. هەروەها پێویستە لەسەر ئەم لێژنەیە کاتێ کە ڕێككەوتن لەسەر هەموو شتێك باسی پارێزگاری حقووقی قەومە کەمەکانی ـ وەکوو ئەو نەستووریانە کە ئەکەونە ناو ئەو وڵاتەوە ـ بکەن و حقووقی ئەوانیش لەناو ئەو هەرێمەدا بپارێزرێت.

بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەیەکی پێنج کەسی کە ئەندامەکانی لە بەریتانیا، فەرەنسە، ئیتالیا، ئێران و کورد بن دروست ئەبێ ـ ئەمەش ئەگەر پێویست بوو ـ بۆ پشکنین و بڕیاردان لەو سنوورانەدا کە بە پێی ئەم پەیمانە بۆ تورکیا دانراوە و ئەنووسێت بە ئێرانەوە.».

**بەندی «٦٣»**

«حوکوومەتی عوسمانی لە ئێمڕۆوەوە گفت ئەدا کە لەو وەختەوە پێ ئەوترێ، تا ماوەی (٣) مانگ قسەوباسی هەر دوو ئەو لیژنەیە کە لە بەندی (٦٢)دا باسکرا بەڵێن و بڕیاری لەسەر بدا.».

**بەندی «٦٤»**

«لە پاش ئەوە کە ئەم پەیمانە دروست بوو بڕیاری لەسەردرا ئەگەر لە ماوەی ساڵێکا ئەو کوردانەی کە کەوتوونەتە ئەو هەریمانەوە کە لە بەندی (٦٢)دا باسکرا داوایان لە «کۆمەڵی قەومەکان ـ عصبة الأمم» کرد کە زۆرتری کوردەکانی ئەم ناوچەیە ئەیانەوێ لە تورکیا جیا ببنەوە و سەربەخۆبن، وە ئەویش «عصبةالأمم» دانی بەمەدا نا کە ئەمانە ئەم شایستەییەیان تیا هەیە، تورکیا هەر لە ئێستەوە لەسەر ئەو ڕاسپێری «عصبە»یە بەڵێن ئەدا کە دەست لە هەموو ئەو حقووقانەی هەڵگرێ کە ئەکەونە ئەو ناوچانەوە.

ئەم دەست هەڵگرتنی حوکوومەتی تورکیایەش لە «حقووقەکانی» بە دوور و درێژی لە گفتوگۆ و کۆبوونەوەیەکی تایبەتیدا ـ کە ئەگێڕێت لە بەینی ئەو و سوێندخوارەکانا ـ باس ئەکرێت. دوای ئەم دەست هەڵگرتنەش کە تورکیا دەستی هەڵگرت هیچ بەرهەڵستێك لە لایەن سوێندخوارەکانەوە ناخرێتە بەرچاو بەرانبەر بە ئارەزووی کوردەکانی وڵاتی «مووسڵ» ئەگەر بیانەوێ لەگەڵ ئەو کوردانەدا کە کەوتوونەتە وڵاتی تورکیا و سەربەخۆییان وەرگرتووە تێکڵاو ببن و بچنە ناو ئەو جغزی حوکوومەتەیانەوە.».

❁ ❁ ❁

ئەم پەیمانی موئتەمەری «سیڤەر»ە لەوانە بوو پشتی تورکی شکاند، بە تایبەتی کە ئەو بەندانەشی تێ خرا ئەوەندەی تر ئاژاوەی فیکری لە تورکیادا نایەوە، وەکوو بۆمان

دەرکەوت دروستکردن و کۆشش کردن بۆ ئەم بەندانە و بۆ کۆڕی ئاشتی، کوردە دانیشتووەکانی وڵاتی ئەستەمۆڵ و وڵاتەکانی جزیر و بۆتان بوون. وڵاتی سۆران ئەو سەردەمە دەستیان نەیانئەگەیشتێ. لە دەوری یەکەم حوکمداری شێخ مەحمووددا لە سولەیمانی کۆڕێك بەسترا، زۆر لە سەرۆکی عەشرەتەکان و «مێجەر نۆئیل»یشی تیابوو، مەزبەتەیەك ڕێکخرا کە ئەمانیش ـ واتە کوردی عێراق و سۆران ـ وەکوو کوردەکانی ئەو وڵاتە ئەوا «شەریف پاشا»یان کرد بە نوێنەرەی خۆیان بۆ داوا کردنی مافی کورد لە کۆڕی ئاشتی و موئتەمەری ئاشتیدا.

ئەم مەزبەتەیە درایە دەست «سەید ئەحمەدی بەرزنجی» و «ڕەشید کابان» کە بیبەن بۆ «پاریس» و بیدەن بە شەریف پاشا. نێراوەکان لە ڕێی مووسڵەوە بەڕێ کەوتن بۆ پاریس. کە گەیشتنە «حەڵەب» لەوێ مانەوە و ڕێیان نەدرا بۆ چوونە پاریس. بە خۆیان و مەزبەتەیانەوە گەڕانەوە بۆ وڵاتی «سولەیمانی».

لەگەڵ ئەمانەشا داخەکەم چ کۆڕی ئاشتی و چ دەوڵەتە گەورەکان هەر شتێك کە، وتیان هیچیان بەجێ نەهێنا و هەمووی هەر مەرەکەبی سەرقاقەز بوو لەبارەی حقووقی کوردەوە!.

❋ ❋ ❋

چۆنیەتی وڵاتی سولەیمانی لە پاش برانی شێخ مەحموود بۆ «هندستان» بەتەواوی تێکچوو؛ لە لایەکەوە لە ئاکرێ و ئامێدی ئاژاوە دەستی پێ کردبوو، لەملاوە لە وڵاتی هەورامان و مەریوان و بانە دیسان هەرا هەڵسابوو، «ئۆزدەمیر»یش ـ پاشماوەی تورك ـ لە وڵاتی ڕواندز تۆزی ئەکرد!. لە لای سابڵاخ و ورمێوە «سمایل ئاغای سمکۆ» دەستی پێ کردبوو. شەڕی (١٩١٤ـ١٩١٨) هەرچەندە بڕابووەوە بەڵام گێچەڵ و پاشەلەقەی هەر لەناوا بوو، هێمنی و ئاسایش دانەمەزرابووەوە. بە تایبەتی هەستێکی کوردایەتی لە هەموولایەکی کوردەوارییەوە پەیدا بووبوو.

ئەمانە و مانەوەی «ئۆزدەمیر» لە وڵاتی ڕواندز سەریان لە سیاسەتی ئینگلیز تێکدابوو لەوڵاتا، بە جارێ چوار چاو بووبووەوە. نە ئەمەبوو لابکاتەوە بەلای «حاجی شەعباناغا»ی ئامێدی و «فارساغا»ی زێبارییەوە، ـ کە لەو وڵاتانەدا ئاگری ئاژاوەیان

ناوەتەوە ـ نە ئەمەبوو لابەلای «ئۆزدەمیر»ەوە بکاتەوە کە بە خۆی و لەشکرێکی تورکەوە لە وڵاتی ڕواندز و دەوروبەریا خەریکی پڕوپاگەندە بوو بۆ تورك و خەریکی ئەوەبوو کە کوردەکان هەڵگێڕێتەوەو بیانکا بە سەر بە تورك.

ئەمە لە «عێراق»دا. لە ئێرانیشدا بەرەی سەردار ڕەشید و جافرسانی لهۆن و مەحموودخانی دزڵی و مەحموودخانی کانیسانان و حەمەخانی بانە، ئەمانە هەریەکە لە لایەکەوە ئاژاوەیەکیان ناوەتەوە و زرنگەی تەلی دڵی زۆریشیان بەلای کوردایەتیدا دەنگ ئەداتەوە. وڵاتی سولەیمانیش بۆ برانی «شێخ مەحموود» ئەوە هەر زۆر زۆر دڵ بریندارن و هەر ڕۆژە نە ڕۆژێك لە لایەکەوە کارەساتێك ئەقەومێ!.

ئەم شتانە هەموو ئینگلیزیان ناچار کرد بەوە کە دان بە واقعا بنێ و [شێخ مەحموود] لە هیندوستانەوە بگێڕێتەوە بۆ سولەیمانی و سەرلەنوێ شێخ مەحموود بێنێتەوە بە حوکمدار. هەرچەندە لەماوەی بەینی ئەم دوو جاری حوکمداریەیدا حوکوومەتێکیش لە بەغدا بەناوی حوکوومەتی «فیصل»ەوە دانرابوو، بەڵام وڵاتی کوردستان بە بێ «شێخ مەحموود» هەر نەئەچوو بەڕێوە.

لەو ماوەیەدا کە ئینگلیز کاروباری سولەیمانی ئەبینی و شێخ مەحموود لە هیندوستان بوو، لە «٢٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٠»دا بە ناوی حوکوومەتی عێراقیەوە یەکەم وەزارەتی [سەید عەبدوررەحمانی نەقیب لە بەغدا دامەزرا و پێ ئەوترا «حوکوومەتی وەختی». لەو وەختەدا «مەندووبی سامی» بەغدا ئەمەی لە وەزارەت گەیاند کە ئەیەوێ خۆی چاوێری وڵاتی سولەیمانی بکا.

دەنگی گەڕانەوەی [شێخ مەحموود] بۆ سولەیمانی بڵاو بووەوە، دەستە و دایەرەکەی ـکە تا ئەو سەردەمە هەر سەریان بۆ ئینگلیز دانەنەواندبوو بە ناوی چەتەیەتییەوە هەر بە شاخ و داخەکانەوە بوون ـ هەموو کۆبوونەوە و هاتنەوە بۆ سولەیمانی. نەوەك هەر ئەوان بەڵکوو لە هەموولایەکەوە و لە هەموو عەشرەتەکانەوە وڵاتی سولەیمانی بۆ هاتنەوەی «شێخ مەحموود» بوو بە پۆرەی هەنگ و بوو بە دەورێکی زۆر تاریخی لە ژیانی سولەیمانیدا. بوو بە ڕۆژێك کە ڕۆڵەکانی کوردستان هەموو کۆئەبنەوە بۆ پێشوازی مەلیکی کوردستان!.

[شێخ مەحموود] لە پاش نزیکەی سێ ساڵێ دیلیەتی لە ئاخر و ئۆخری (١٩٢٢) دا گەڕایەوە و هاتە بەغدا و لەوێوە بەرێکەوت بۆ سولەیمانی، پێشوازی و ئیستیقباڵ بەرەبەرە بۆ پیریەوە چوونی «شێخ مەحموود» لە سولەیمانی دەستی پێ کرد، سەرەتای پێشوازی کەران گەیشتە بەغدا، هەتا رووبەرووی سولەیمانی ئەبوونەوە دنیای شادمانی زیاتر ئەبوو، ئەو رۆژە چ رۆژێك بوو کە شێخ مەحموود چووەوە ناوشاری سولەیمانی؟!. هەر لە ئەیلوولا بوو شادی چوونەوەی «شێخ مەحموود» بۆ سولەیمانی، هەر لە ئەیلوولیشا بوو ناکامی سولەیمانی، بەڵام ئەویان لە (١٩٢٢)دابوو. ئەمیان لە (١٩٣٠)دا!..

وەختی خۆی ئەوەبوو «مەندووبی سامی» لە وەزارەتی نەقیبدا هەندێ قسەی لەبارەی ئیدارەی سولەیمانیدا کردبوو، ئەم قسانە بووبوونە مایەی دڵڕەنجاندنی سولەیمانی و دەستەی شێخ مەحموود. کە شێخ مەحموود گەڕایەوە بۆ سولەیمانی ئینگلیز ئەیویست پینەی ئەو قسانەی خۆی بکا و ئەو ساردییە لەبەینی خۆی و سولەیمانیدا نەیەڵێ. بڕیاری دا لەشکرەکەی لە سولەیمانی بکێشێتەوە و دەستەیەك بۆ ئیدارەی سولەیمانی دابنرێ، دیارە ئەمەش لە ژێر فەرمانی «شێخ مەحموود»دا ئەبێ.

لە [١٤ ئەیلوولی ١٩٢٢]دا کۆنگرەیەکی ناوچەیی دروست کراو «شێخ مەحموود» بوو بە سەرۆکی ئەو کۆنگرەیە، لە پاش چەند رۆژێك لە تشرینی دووهەمی (١٩٢٢)دا ناوی خۆی نایە «مەلیکی کوردستان» و لە ڕاستیدا ناوی مەلکی وەرگرت، ئاڵای سەربەخۆیی کوردستان لەو رۆژەدا لە شاری سولەیمانی هەڵکرا و یەکەم وەزارەتی کوردستان بەم جۆرەی خوارەوە دامەزرا:

| | |
|---|---|
| شێخ قادری برای شێخ مەحموود | سەرۆکی وەزیرەکان و سوپاسالار.[1] |
| عەبدولکەریم عەلەکە: | وەزیری دارایی |
| موستەفا پاشای یامەلیکی: | وەزیری فەرهەنگ |
| شێخ حمە غەریب: | وەزیری ناوەوە |
| سالح زەکی ساحبقران: | وەزیری هێزی میللی |

١. ئەم ناوانە لە رۆژنامەی «بانگی کوردستان»ی ئەو دەورەدا ـ کە لە سولەیمانی دەر ئەچوو ـ لە باتی وەزیر رەئیسی داناوە، بەڵام مەبەست لە رەئیس وەزیری ئیستیلاحی ئێستەیە.

| | |
|---|---|
| ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ: | وەزیری گومرك |
| حەماغای ئەورەحماناغا: | وەزیری نافعە |
| سەیید ئەحمەدی بەرزنجی: | سەرۆکی ئەمنی عام |
| حاجی مەلا سەعید: | وەزیری دادگا |
| «صدیق القادری»: | موفەتیشی هەموو حوکوومەتی کوردستان |

بەم جۆرە حوکوومەتی کوردستان و وەزارەتی دامەزرا، لە پاش ئەمە وردە وردە کاروباری ئیدارەی حوکوومەت ڕێکخرا، دایەرەکان دەستیان کرد بە ئیش کردن، نووسینی دایەرە و دەرەوە بە کورد دەست پێ کرا، پوولی پۆستە دەرهێنرا. بزنانە و مەڕانە وەرئەگیرا و پوسولەی ئەدرا. سەرۆکی عەشرەتەکان سەریان ئەدا لە پایتەخت و دڵخۆش بوون بەم حوکوومەتە.

ئەوەندە هەبوو ئەم ئیدارە و حوکمداری و پادشایەتیە هەر بۆ سولەیمانی ـ واتە بۆ لیوای سولەیمانی ـ بوو، دیارە شێخ مەحموود ئارەزوویەکی تری هەبوو ـ ئارەزووی سەربەخۆیی هەموو کوردستان هەبوو ـ بە ناوچەی سولەیمانی ڕازی نەئەبوو. ئەمجا کەوتە سەر داواکردنی هەموو شارە کوردەوارییەکانی تری عێراق و ئەیەویست هەموویان بکەونە ژێر ئاڵای کوردستانەوە.

لەولاشەوە «ئوزدەمیر» کە ئاوازی حوکوومەتی کوردستانی بیستبوو بە هەموو جۆر ئەیەویست خۆی لە مەلیك نزیك خاتەوە، کەوتە فڕوفێڵی «میکیافیلی» و لە ڕاستیدا خۆی لێی نزیك خستەوە و لەگەڵ مەلیکدا دەمێ ڕاسپێرییان گەیشتە یەك!.

لەوسەردەمەدا «مێجەر نۆئیل»ی موستەشاری شێخ مەحموود و وەکیلی (مەندووبی سامی) بەریتانیا لە سولەیمانی بوو، هەستی کرد کە شتێك لە کایەدایە. ئەم هەستەشی لەبەر ئەوە بوو کە گەلێ بیروباوەڕی جیا جیا لە سولەیمانی پەیدا بووبوو؛ شێخەکانی بەرزنجە لە لایەکەوە لەبەر ئەوە شێخ مەحموود، مەلیکە و لەبەرەی بەرزنجەییە ئەیانویست هەچ ئیش و کارێك هەیە ئەبێ لە ژێردەستی ئەواناب‌ێ، نەوەك هەر ئەوەندە بەڵکوو بە هەموو جۆر ئەیانویست حوکم بکەن و ئەشیان کرد، هەریەکە لە لایەکەوە ئاغەیەك بوو بۆ خۆی!. کەس خەتی کەسی نەئەخوێندەوە.

لە لایەکیترەوە هەندێك لە وڵات دیدەکانی سولەیمانی لەو باوەڕەدا بوون کە سیاسەت و خزمایەتی گەلێ لە یەك دوورن، بەڵکوو ئەوان لەسەر ئەو مەفکوورەیە بوون کە مەیدانی سیاسەت ئەوەیە لە هەر لایەکەوە بای هات پیاو ئەبێ لەولایەوە شەن بکا!. لە باوەڕی ئەوانا تێکچوونی دەوڵەتی عوسمانی و هاتنی ئینگلیز بۆ ئەو وڵاتە ئەمە درۆیەك بووە لە کورد کراوەتەوە، چونکە ئەگەر ئینگلیز نەبوایە ئەوان نەئەگەیشتن بەو سەربەخۆییە!. کەواتە تا ئاخر هەناسە ئەبێ لەگەڵ ئینگلیز بن و نابێ قسەی بشکێنن.

هەندێکیتریش هەر بە بیر و باوەڕێکی پێشین لەسەر ئەو ڕایەبوون کە ئەبێ حوکوومەتی تورك لەبەر ئەوە کە ئیسلامە بێتەوە و ئەبێ لە ژێر فەرمانی خەلیفەدا بن!. هەر دوو دەستەکەش بە جارێ کە کردەوەی شێخەکانی بەرزنجەیان ئەبینی لە وڵاتی سولەیمانی بێزیان لە خۆیان و لە ئیدارەی سولەیمانی ئەهاتەوە.

«شێخ مەحموود» خۆیشی پیاوێك بوو لە چاکە بەولاوە هیچیتری نەئەویست، هەرچەندە مەلێك بوو بەڵام لە ڕەوشت و هەڵسوکەوتا بە تەعبیری ئێستە ئەوپەڕی دیموکراتی هەبوو، هەمووکەس ئەیتوانی شێخ مەحموود ببینێ و ئەویش هەموو کەس ببینێ، هەرکەس کە ئەچووە لای سەربەخۆ وەزیرێك بوو، نەوەك هەر وەزیرێك بەڵکوو «فەیلەسووف»ێك بوو بۆ ئیدارەی وڵات!..

جا پیاوێکی وەکوو شێخ مەحموود لە ناو شەپۆلی ئەم هەموو بیروباوەڕانەدا ئەبێ چۆن سەر دەرکا و چۆن بگاتە ئەو ئامانجە کە ساڵەهای ساڵە بۆی ئەجەنگێ؟.. تا لە باوەڕی دەستەیەك ڕزگاری ئەبوو باوەڕی دەستەکەیتر سەری ڕێیان پێ ئەگرت.

«مێجەر نۆئیل» گەلێ کۆششی کرد کە مەلیك لە باوەڕەکانیتر بازگەشت بکاتەوە و بە تایبەتی نەکەوێتە شوێن فرۆفێڵی میکیافیلی ئۆزدەمیر، هیچ کەڵکی نەبوو. بۆ ئەمەش کە بەتەواوی خۆی پیاو خراپ نەکا «چەپمەن»ی کرد بە وەکیلی خۆی لە سولەیمانی و خۆی سولەیمانی بەجێ هێشت.

کردەوە و باس‌وخواسەکانی «شێخ مەحموود» لەگەڵ ئۆزدەمیردا ـ کە بە هۆی کۆششی پیاوە تورك خواکانەوە بوو ـ هەر زیادی ئەکرد، ئەم زیادکردنەش دەستی نەئەدا بۆ ئینگلیز. (چەپمەن) کەوتە خۆی و ئەویش دەستە و دایەرەیەکی پەیدا کرد و بەرە بەرە لە ژێرەوە

بۆ ڕووخاندنی حوکوومەتی شێخ مەحموود چاکیان لێ کرد بەلادا!. لە ئاخردا وای لێ هات بەتەواوی دانیان لە یەك سپی بووەوە، مەکینەی حوکوومەتی کوردستانیش ئەوا جارێ هەر ئەگەڕێ.

شێخ مەحموود هەتا ئەهات شیرگیرتر ئەبوو، فیکری هاتە سەر ئەوە کە پەلاماری کەرکووك بدا. لەم ڕووەوە سەرۆکی عەشایرەکانی بانگ کرد و کەوتە گفتوگۆ لەگەڵیانا. وەکوو وترا لەبەر ئەوە گەلێ شەپۆلی فیکری لە سولەیمانیدا هەبوو هەندێك لەمانە لەگەڵی بوون و هەندێکیش قسەیەکی ڕاستیان نەئەدا بە دەستەوە.

لەم دەورانەدا «سمایل ئاغای» سمکۆیش هات بۆ سولەیمانی و بوو بە میوانی [حوکوومەتی کوردستان]، ئەو ماوەیە کە لە سولەیمانی مایەوە خزمەتێکی شاهانەکرا، لە ڕووی حوکمداری کوردستانیشەوە گەلێ قسە لە بەینی ئەو و «شێخ مەحموود»دا هاتوچووی کرد. هاتنەکەی ئەمیش وا ڕێکەوتبوو کاتێك بوو کە حوکوومەتی کوردستان لەگەڵ ئینگلیزدا شیریان لەیەك ئەسوو و سولەیمانی وەکوو مەنجەڵی سەرئاگر ئەکوڵا. بە تایبەتی چی ئینگلیز لە سولەیمانی هەبوو «شێخ مەحموود» دەری کردبوون.

ئینگلیزەکان زۆر داخ‌بەدڵ بوون لە [شێخ مەحموود]، ئەیانویست سولەیمانی لە دەست دەرێنن و نەشیان ئەزانی چۆنی دەرێنن، هەرجارە لەشکریان ئەنارد و بە ناهومێدی لەشکر ئەگەڕایە دواوە. ئەمجا هاتە سەر ئەوە کە بە هۆی بۆمبابارانەوە سولەیمانی بە شێخ مەحموود چۆڵ بکا. ئەمەش لەسەرێکەوە ئیشێکی گران بوو بەرانبەر بە ئینگلیز؛ دوو شتی پێچەوانە لە سولەیمانی هەبوون؛ شێخ مەحموودی لێ بوو کە داخی ناوە بەدڵی ئینگلیزەوە و لەبەر ئەو بۆم بوردمانی سولەیمانی ئەکا. سمایل ئاغای لێ بوو کە ئەو سەردەمە ئینگلیز سمایل ئاغای بە دۆست ئەزانی و نەیئەویست بە جارێ ئاگر لە هەموو لایەکەوە بۆ خۆی بنێتەوە!.

هیچ چاری نەما هات لە پێشا «بەیاننامە»ی فڕێدایە خوارەوە؛ لە [٢٣ شوباتی ١٩٢٣]دا بۆ سمایل ئاغا کە سولەیمانی بەجێ بێڵێ چونکە ئەم ئەیەوێ بۆردمان بکا و نایەوێ ئەو تووشی زیان بێت. لە (٢٦)ی عەینی مانگا بۆ شێخ مەحموود و ئەهلی شار کە شار چۆڵ کەن بۆردمان ئەکات.

«سمایل ئاغا» لە (٢٨ شوباتی ١٩٢٣)دا خۆی و سوارەکانی دیدەنیان تەواو بوو «ڕەشید جەودەت»یان لەگەڵ چوو چوونەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

پاش ئەوان شێخ مەحموودیش بە خۆی و لەشکریەوە چوونە دەرەوە و ڕوویان کردە ئەشکەوتەکانی «جاسەنە». ئەهلی شاریش بەرە بەرە لە شار دەرچوون و ڕوویان کردە قەرەداغ و شارباژێڕ و ئەوناوە.

لە بەیانی [٤ی مارتی ١٩٢٣]دا هێشتا سولەیمانی بەتەواوی چۆڵی نەکردبوو فڕۆکە بۆمبا هاوێژەکان بەسەر شاری سولەیمانیدا وەکوو داڵاش دەستیان کرد بە سووڕانەوە!. لە سووڕی یەکەم و دووهەم و سێهەمدا یەکەم بۆمبایان خستە خوارەوە کە، ماڵی «حاجی عارف بەگ»ی بەرکەوت، حەمەبەگی کوڕی نەبێ لەگەڵ برابچکۆلەکەیا لە بازاڕ بوون کەسیان دەرنەچوون!. لە پاش هاویشتنی چەند بۆمبایەك سولەیمانیی بەجێ هێشت و گەڕایەوە. فڕۆکەکان نەگەیشتبوونەوە فڕۆکەخانەکانی خۆیان لەشکری ئینگلیز گەیشت و سولەیمانی داگیر کردەوە.

کام سولەیمانی؟. ئەو سولەیمانییە کە بۆمبا کاولی کردووە و دەنگی شین و شەپۆڕی گریان و زاری لە گەرووی ئەو کەسانەوە هەڵئەستێ کە فریا نەکەوتوون ناوشار بەجێ بێڵن!. بەم جۆرە پیاوەتییە ئینگلیز سولەیمانی گرتەوە و گۆیا حوکوومەتی [شێخ مەحموود]ی هەڵفڕان.

لەولاشەوە کە «شێخ مەحموود» ڕووی کردە وڵاتی قەمچۆغە و جاسەنە فڕۆکە و باڵۆن هەموو ساتێك بەسەر سەریەوە بوو، بەڵام دڵقایمی و ئازایی شێخ مەحموود و پیاوانی [شێخ مەحموود] لەوەدا نەبوو کە سەر لەو جۆرەشتانە بکەنەوە. شەڕ لە بەینی حوکوومەتی کوردستان و ئینگلیزدا بوو بوو بە داشی دامە، هەرجارە بە لایەکا ئەسووڕایەوە.

لەو ماوەدا کە ئەو لە دەرەوەی سولەیمانی بۆ ئینگلیز جەورێکی زۆری ئەنواند لە سولەیمانیدا، هاتوچووی پیاوی «شێخ مەحموود» بەدزی هەر هەبوو بۆ سولەیمانی، ئەم جەورە هۆشێکی‌تری هێنایەوە بە بەر خەڵکدا، لە لایەن [شێخ مەحموود]یشەوە سەرۆکی عەشرەتەکان بەتەواوی لێ کۆبوونەوە و هاتنە سەر ئەوە کە بە پەلاماردانێکی مردن و ژیان پەلاماری ئینگلیز بدەنەوە و سولەیمانی لە دەست بسێننەوە.

خۆیان بۆ ئەم هێرشە ئامادە کرد و ڕوو بە سولەیمانی هاتن، لە (١١ی تەمووزی ١٩٢٣)دا سولەیمانیان گرتەوە و ئینگلیزیان دەرپەڕاندەوە، دیسانەوە «شێخ مەحموود» کەوتەوە قایمکردنی سولەیمانی و حوکمدارییەکەی جارانی. تا نزیکەی ساڵێك بەم جۆرە ئینگلیز هیچی لەگەڵ پێنەکرا.

❋ ❋ ❋

لە [٢٥ی نیسانی ١٩٢٠]دا کە بەریتانیا بە ناوی ئینتیدابەوە نیشتەوە بەسەر عێراقەوە، هەرچەندە کە وەزارەتی دەرەوەی تورکیا لەو وەختەدا دانەیەك لە پەیمانەکەی «سیڤەر»ی وەرگرت و پاشان دایە دواوە و نەچووە ژێر ئەو قسانە کە لە بارەی سەربەخۆیی کوردەوە لە پەیمانەکەدا دابووی. قسەوباسی پەیمانی «لۆزان» لە پاش ئەو مێژووە لەناو حوکوومەتەکانا هەبوو و لە ئاخردا لە [٢٤ی تەمووزی ١٩٢٣]دا ئەمیش ئیمزا کرا و بەتەواوی کوردیان لە هەمووشت بێبەش کرد!..

هێشتا پەیمانەکەی «لۆزان» ئیمزا نەکرابوو، واتە لە ساڵی (١٩٢٢-١٩٢٣)دا کوردەکانی عێراق دەمودووی ئەوەیان بۆ دەرکەوتبوو کە حوکوومەتێکی گەورەی وا کە کوردستانی عێراقیشی بەرکەوێ ـ لەبەر ئەوە کە بەر هەڵستیان زۆرە ـ بۆیان دانامەزرێ و نایەڵن، بەڵکوو ئەو جۆرە قسەیە لە ناوا هەیە کە کوردستانی عێراق بخرێتە پاڵ حوکوومەتی عێراقی.

دوو حوکوومەتەی بەریتانیا و عێراق کەوتبوونە سەر ئەوە کە پەیمانێك لەبارەی کوردەکانەوە بدەن و بە دڵخۆشی ئەم پەیمانە «شێخ مەحموود» لەو باوەڕەی خۆی هەڵگێڕنەوە. پەیمانەکەشیان ئەمە بوو:

«حوکوومەتی عێراق و بەریتانیا هەردووکیان دان بە حقووقی ئەو کوردانەدا ئەنێن کەوان لە عێراقا و ڕێگەی ئەوەیان ئەدەن کە حوکوومەتێکی کوردی لەناو ئەم چوار چێوەی عێراقەدا بۆ خۆیان دابنێن، لەم ڕووەوە خۆیان سەرپشکن بۆ دروستکردنی چۆنیەتی ئەو حوکوومەتە و بۆ دانانی سنووری. وە ئەتوانن پیاویش بنێرن بۆ بەغدا بۆ ئەوە باسی پەیوەند و ئاشنایەتی ئابووری و سیاسی خۆیان لەگەڵ دوو حوکوومەتەی عێراق و بەریتانیادا ببڕێننەوە.».

ئەم قسەیان دا و کەسیشیان نەچوو بە گوێچکەیاندا!.

لە [١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢]دا پەیمانی چوار ساڵەی عێراق ـ ئینگلیز هاتە پێشەوە، بەو مەرجە کە سەرەتای ئەم پەیمانە لە وەختێکەوە دەست پێ بکا کە پەیمانی ئاشتی لە بەینی عێراق و تورکیادا ببەسترێ. کە پرۆتۆکۆڵی ئینگلیزی ـ عێراقی لە [٣٠ نیسانی ١٩٢٣] دا کراو بەتەواوی دانی نا بەوەدا کە سەرەتای پەیمانەکە لەو مێژووەی پێشووەوەبێ ئیتر ئەم پرۆتۆکۆڵە بڕیاری دا کە سولەیمانی بکەوێتە پاڵ بەغدا، وە بۆ ئەوە کە کوردەکان دڵیان هیچ چەکەرە نەکا لە [١١ی تەمووزی ١٩٢٣]دا دیوانی وزاری عێراقی بڕیاری‌دا کە:

١ـ حوکوومەت بێجگە لە کاربەدەستانی پێشە و فەن هیچ کاربەدەستێکی «عەرەب» لە وڵاتی کوردەواریدا دانەنێ.

٢ـ کوردەکان لە کاروبار و موراجەعاتی ڕەسمیدا حوکوومەت ناچاریان ناکا بەوە کە بە عەرەبی قسە بکەن.

٣ـ حوکوومەت پێویستە لە سەری پارێزگاری هەموو جۆرە حقووقێکی دانشتوانی دینی و غەیرە دینی ئەو وڵاتانە بکا.]

کە ئەم قسانە هاتە ناوەوە بەمانە تۆزێ ناوشاری سولەیمانیان هێمن کردەوە و پێنج نایبیان چوو بۆ «بەغدا».

* * *

لەم‌لاوە ئەم فرمانانە ڕووی دا، لەولاشەوە ئەوەبوو کە «شێخ مەحموود» لە [١١ی تەمووزی ١٩٢٣]دا سولەیمانی داگیر کردەوە و کەوتەوە ئیش‌کردنەکەی جارانی. لەم ماوەیەدا حوکمڕانی ئەکرد و کوردەکانی هەموولایەك بە هەموو جۆر هاتوچووی سولەیمانیانیان ئەکرد.

کە ئەم ئیشانە لە بەغدا ڕووی دا ئیتر دەستی نەئەدا بۆ ئینگلیز کە پیاوێکی وەکوو «شێخ مەحموود» مەلیکی کوردستان بێت، وە یا دەستی نەئەدا بۆی کە کوردستان سەربەخۆییەکی ببێ، چونکە ئەو ئارەزووەی کە ئەو هەیبوو بە وڵاتی کوردەواری عێراق، وە یا ئەو ئارەزووەی کە ئەو هەیبوو بە عێراق، پیاوەکانی بەغدا بە بارێ سوپاسەوە بۆیان جێ‌بەجێ ئەکرد!.

مەسەلەی کوردەکان و بەغدا بەرانبەر بە ئینگلیز وەکوو مەسەلەی کابرای لێ هاتبوو

کە کوڕە نەخۆشەکەی بردە سەر «سەی ساق» و گێسکێکیشی لەگەڵ برد بۆی سەربڕی، لەگەڵ ئەوەدا نەئەبوا گێسکی ببردایە، بەڵکوو ئەبوا مەڕێکی ببردایە کە چوونەسەر شەخسەکە رووی کردە شەخس و پێی‌وت:

«سەی ساق!. تۆ وەگێسکێ خاسی ئەکەیتەوە خاسی کەرەوە، خاسی ناکەیتەوە «باڵانتەران» وە مامرێ کرە ئەکا!.[1]».

لەم ماوەیەدا کە «شێخ مەحموود» لە سولەیمانی بوو لە هەموو لایەکەوە بە تایبەتی لە قۆڵی پێنجوێنەوە سەرۆکی عەشرەتەکان و هەموو جۆرە کوردێك هاتووچۆیان ئەکرد و بە گیانێکی پاکەوە ئەیانویست ئەم حوکوومەتە بژیت. ڕسووماتی حوکوومەتیش وەکوو جاران کۆ ئەکرایەوە و هەمووشتێك لە ڕێگەی خۆیەوە ئەڕۆیشت. لە وڵاتی ئێرانا بەتەواوی دڵگەرمییەکیان بەم کوردایەتیە پەیدا کردبوو.

حوکوومەتی ئینگلیز و عێراق کەوتنە سەر ئەوە کە بەتەواوی قۆڵ بکەن بە قۆڵی یەکا بۆ لە ناوبردنی حوکوومەتی «شێخ مەحموود»، وەزارەتی بەغدا وەزارەتی «جەعفەر عەسکەری» بوو، بەتەواوی لێ برا، با هەر جۆرە زیانێکیش ڕووبدا هێرش بەرێتە سەر حوکوومەتی سولەیمانی. بە تایبەتی لە [٤ی مارسی ١٩٢٤]دا کارەساتی کوشتاری بەینی «فەلە»کان و ئەهالی «کەرکووك» ڕوویدابوو، لێرەدا شێخ مەحموود زۆر بە سۆز هەڵیدایە و ئەیەویست لە تۆڵەی ئەو ئیشە ناشیرینەی «کەرکووك»دا تووی فەلەکان ببڕێنرێتەوە. لەم لاوەش مەندووبی سامی بەغدا «السیرهنری دوبس» بە هەموو دڵێکیەوە ئەیەویست ئیشەکە بپۆشرێ، تەنانەت «فەتاح بەگ»ی موتەسەڕیفی کەرکووکی لابردبوو، «مەجید یەعقووبی» ڕەئیسی بەلەدیەی دانابوو لە شوێنی هەر، بۆ ئەوە برینەکە تەشەنە نەکا. کەچی لەولاوە شێخ مەحموود ڕیسەکەی ئەمی ئەکردەوە بە خوری و هەر زیاتر لەسەری ئەڕۆیشت.

کە «کەرکووك» تۆزی نیشتەوە ئەم ناسۆرە لە دڵی مەندووبی سامیا زیاتر ژانی پەیدا کرد، «مستر کورنوالیس» موستەشاری داخلیە و شارەزای کاروباری وڵاتی سولەیمانی بوو، مەندووبی سامی ئاخر بڕیاری لەگەڵ دا کە بە هۆی «عەلی جەودەت» وەزیری

١. - «سەی ساق» و «باڵانتەران» دوو مەزارن لە شارەزوور، هەریەکە لەسەر کێوێکن بەرانبەر بەیەك.

داخلیە و «جەعفەر عەسکەری» و دیوانی وزەراوە تا ئاخر هەناسە بڕیار بدەن بۆ لە ناوبردنی حوکوومەتی شێخ مەحموود.

هەموو ئەم ئیشانە کرا و هێزی حوکوومەتی عێراقی بە هێزی عەسکەری لیوی و هێزی هەوایی بەریتانیەوە ڕوو بە وڵاتی سولەیمانی کەوتنە جموجووڵ. سەرەتای شەڕ هەر لە دەوروبەری [چەمچەماڵ و دەربەندی بازیان] دامەزرا، لەبەر ئەوە دەستێکی نهێنیش لەژێرەوە لە وڵاتی سولەیمانی ئیشی هەر ئەکرد، لەشکری [شێخ مەحموود] لەگەڵ ئەوەدا پیاوانی وەکوو کەریم بەگی فەتاح بەگ و «سابری کەریم بەگ»یشی هەبوو هەر توانای گێڕانەوەی ئەو هێزانەیان نەبوو.

لە ئاخردا لە [١٩ی تەمووزی ١٩٢٤]دا شێخ مەحموود سولەیمانی بەجێ هێشت و عەسکەری عێراقی و ئینگلیزی سەرلەنوێ شاری سولەیمانیان گرتەوە و ئەم جارە بە هەموو توانایەکیانەوە کەوتنە قایمکردنی وڵاتی سولەیمانی و دەرەوەی، وردە وردە ڕەگی خۆیانیان تیا داکوتا، ئەمجا هەر بە قسەی ئینگلیز حوکوومەتی عێراق هێنای مڵکەکانی شێخ مەحموودی هەموو زەوت کرد و بەیانی دەرکرد کە ئەم مڵکانە مافی «شێخ مەحموود»یان پێوە نییە.

شێخ مەحموود کە سولەیمانی بەجێهێشت ڕووی کردەوە وڵاتی «جاسەنە» و لەملاوە تا وڵاتی پێنجوێن هەر بە ناوی حوکمداریەوە دەستی بۆ ئەبرد، کە هێزی حوکوومەت ئەچووە سەری لەشکرەکەی ئەچوونە ئەشکەوتەکانەوە و ئیتر ئەوان هیچیان پێ نەئەکرا.

هەروەها لە حوزەیرانی (١٩٢٥)دا مەندووبی سامی بەغدا و حوکوومەتی عێراق فەرمانێکیان دەرکرد کە هەرکەس «شێخ مەحموود» بگرێ چە بە زیندوویەتی، چە بە مردوویەتی شەست هەزار ڕووپیەی بدرێتێ. وە بۆ «کەریم بەگی فتاح بەگ» و بۆ «سابری کەریم بەگ»یش هەر یەکە (٢٠) هەزار ڕووپیە بەخشش دانرابوو بۆ ئەو کەسە کە بیانکوژێ وە یا بیانگرێ!.

کابرایەکی [فەلە]ی لیوی بە خۆگۆڕین چووبوو بۆ کوشتنی شێخ مەحموود و ئەوانیتر، شێخ پێ زانیبوو، لە پاش پرسیار لێکردن بەتەواوی بۆی دەرکەوت کە مەسەلە وایە، ناچار فەرمانی دا بە کوشتنی.

دەرچوونی شێخ مەحموود لە سولەیمانی و تێکچوونی حوکوومەتی کوردستان، لە دڵا کارێکی گەورەی ئەکردە سەر دڵی کوردەکان و لەبەر هێزی داگیرکەریش ئەوانەی ناوشار نەیانئەتوانی دەنگ بکەن. تەنانەت کوردە ناحەزەکانی [شێخ مەحموود]یش تێکچوونی ئەو حوکوومەتەیان هەر بەلاوە خۆش نەبوو، چاوەڕوانی ئەوە بوون کە ئەگەر هەلێکیان بۆ هەڵکەوێ بەسەریا نەچن، جا سەر ئەکەون یا سەر ناکەون ئەمە شتێکی‌ترە.

ئینگلیز هەستی بەمە کردبوو ئەیویست بە جۆرێکی [غەیرە موباشر] تا پێی‌بکرێ دڵی کوردەکان ڕاگیر کا، بە تایبەتی ئەوا لەو لاشەوە «شێخ مەحموود» کۆڵی نەداوە و هەر لە شاخەکانایە و زیاد لە قابلیەتی جارانی عەزیەتی حوکوومەت ئەدا، بوونی ئەو و مانی ئەو هیوایەکی گەورەیە بۆ هەموو جۆرە کوردێك.

هەر لەبەر ئەمەبوو کە لە شوباتی (١٩٢٥)دا لەوکاتەدا کە لیژنەکەی «کۆمەڵی ئەقوام» هاتن بۆ تێگەیشتن لەو ناکۆکییەی بەینی عێراق و تورکیا لەسەر مووسڵ، بەریتانیا ئەوەی زیندوو کردەوە کە ئەبێ کوردەواری عێراق پاڵ بدا بە عێراقەوە بەڵام بەو مەرجە کە ئارەزووەکانی کورد بەجێ بهێنرێ؛ ئەو سێ ئارەزوانە کە لە [١١ی تەمووزی ١٩٢٣]دا دیوانی وەزارەتی عێراقی بڕیاری لەسەر دا و لە لاپەڕە (٨٥) ئەم کتێبەدا باس‌کرا.

دووپاتەکردنەوەی ئینگلیز بۆ ئەم قسانە هەر بۆ ئەوەبوو کە دڵی کوردەکان ـ وەکوو باسکرا ـ گۆیا بکاتە خۆی!..

«شێخ مەحموود» لەگەڵ ئەوەشا کە لە دەرەوەی سولەیمانی بوو لەم لاوە بەتەواوی حوکوومەت و ئینگلیزەکانی بێزار کردبوو حوکوومەت بە هیچ جۆر چاری نەئەکرد، لەولاشەوە لە خەتی پێنجوێنەوە لەگەڵ هەورامان و مەریوانا دەنگوباسی قسەی داخستبوو کە ڕوو بکاتە ئەو ناوەش، ماوەی بەینی جاسەنە و پێنجوێن و مەریوان دەسەڵاتێکی تەواوی بەسەردا هەبوو.

لەو سەردەمانەدا «مستر ئەدمونس» بە قسەی «مستر کورنوالیس» موستەشاری داخلیە لەو وڵاتانەدا ئەسووڕایەوە کە کەمتر دەستی «شێخ مەحموود»ی ئەگەیشتێ. یەکێ لەو شوێنانە «کۆیە» بوو. لەو وەختەدا «عەلی کەمال» لەوێ معاونی پۆلیسی کۆیە بوو. [مستر ئەدمونس] ئەچێتە لای پێ ئەڵێ کە گۆیا ئەو بەڵکوو خۆی بگەیەنێتە

«شێخ مەحموود» و پێ بڵێت دەست لە ئاژاوە هەڵگرێ و بچێت بۆ بەغدا. عەلی کەمال ئەمەی بەلاوە سەیر ئەبێ؛ [شێخ مەحموود]ێ کە خۆی بە مەلیکی کوردستان ئەزانێ چۆن لە شتێکی وادا ئەکەوێتە شوێن قسەی ئەم؟!.

بە «ئەدمونس» ئەڵێ ئەمە ناکرێ بەڵام من ئەتوانم لەگەڵ «ساڵح زەکی بەگ»دا ـ کە لەو وەختەدا لەگەڵ شێخ مەحموود بوو ـ قسە بکەم و بەڵکوو ئەو شێخ تێ بگەیەنێ.

لەسەر ئەم تەگبیرە «عەلی کەمال» قسە لە «ساڵح زەکی بەگ» ئەگێڕێتەوە و ژوان ئەدەن کە لەدێ «خەرابە» یەکتر ببینن.

ئەمجا هەر لەو ڕۆژانەدا هەر دوولا ئەچنە «خەرابە» و ئاخر قسەیان دێتە سەر ئەوە کە بەڵکوو [ساڵح زەکی بەگ] شێخ مەحموود بێنێتە سەر ئەوباڕە کە بچێت بۆ بەغدا بۆ چاوپێکەوتنی پیاوەکانی بەغدا بۆ ڕێككەوتن.

کە [ساڵح زەکی بەگ] ئەگەڕێتەوە و مەسەلە، لە شێخ مەحموود تێ ئەگەیەنێ. شێخ ڕازی نابێ بە چوون، بەڵام بڕیار لە سەر ئەوە ئەدا کە لە لایەن ئەوەوە «ساڵح زەکی بەگ» بچێت بۆ بەغدا و هەر قسە و باسێکی ڕێکەوتن هەیە ئەو بیبڕێنێتەوە.

لە دەوروبەری سەرەتای ساڵی (١٩٢٦)دا ساڵح زەکی بەگ ئەچێ بۆ بەغدا، لەولاشەوە مستر ئەدمونس، کورنوالیس تێئەگەیەنێ لە کەین و بەین. ساڵح زەکی بەگ «عبدالمحسن سعدون» وەزیری داخلیە و «مستر کورنوالیس» موستەشاری داخلیەی لە وەکاڵەتی [شێخ مەحموود]ەوە چاو پێئەکەوێ. ئیش و کار هەموو لە دەست کورنوالیسا بوو. قسەوباس دێتە سەر ئەوە کە شێخ مەحموود وازبێنێ لە هەموو شت و لە عێراق بچێتە دەرەوە، کارێکی بەسەر سیاسەتی عێراقەوە نەبێ، یەکێ لە کوڕەکانی بنێرێ بۆ بەغدا بۆ خوێندن، مڵکەکانی پێبدرێتەوە و خۆی یەکێکی بۆ دانێ بۆ چاوێریکردنیان.

ساڵح زەکی ئەم قسانەی هەڵگرت و هێنانیەوە بۆ شێخ مەحموود، شێخ مەحموود لەمە زۆر تووڕە بوو بەڵکوو هەندێ شتیشی دایە پاڵ ساڵح زەکی بەگ و حەپسیشی کرد.

«شێخ مەحموود» زووتر قسەی دابوو بە وڵاتی مەریوان و پێنجوێن کە بچێت بۆ ئەو ناوە، بەرە بەرە وڵاتی (جاسەنە) و ئەشکەوتی بەجێهێشت و ڕووبەڕووی دەوروبەری پێنجوێن بووەوە کە لەوێوە بچێت بۆ «پیران» لە مەریوان. وڵاتی سولەیمانیش لە

تەنگ‌وچەڵەمەدا بوو، هێزی حوکوومەت هەموو ئەو ناوەی داگیر کردبوو، زیاتر لە هێزەکەش پۆلیس و سەربازی کورد بوون، هەرچەندە بۆ شەڕکردن لەگەڵیا سەربازی لیوی و ئینگلیز و سەربازی عێراقی پێکەوە ئەچوون بە گژیا بەڵام باوەڕی ئینگلیز و حوکوومەتی عێراقی ئەوەبوو کە پۆلیس و سەربازە کوردەکان پێش بخرێن!. «شێخ مەحموود»یش نەیئەویست گوللەی خۆی بەو جۆرە بە ئاشکرا بنێ بە کوردەوە، چونکە ئەو ئەیەویست کورد ڕزگار کا، ئێستە چۆن خۆی بیانکوژێ؟!. ئەمە و دیسان وڵاتی [جاسەنە] و دەوروبەری سولەیمانی بە هۆی بوونی لەشکری «شێخ مەحموود»ەوە لەو ناوەدا تووشی گەلێ بۆردمان و عەزیەت بووبوون لە لایەن هێزی حوکوومەتەوە.

ئەم دوو هۆیە بوو کە پاڵیان نا بە «شێخ مەحموود»ەوە بۆ ئەوە ئەو وڵاتە بەجێ بێڵێ و بچێت بۆ «پیران».

لەو دەورانەدا کە ئەو لە بەینی پیران و پێنجوێندا بوو لە لایەن حوکوومەتەوە وەڵامی بۆ نێرا کە حوکوومەت ئەیەوێ ڕووبەڕوو لەگەڵ خۆیدا دەمیان بگاتە یەك و بەڵکوو لەم کۆبوونەوەیانا ڕێك بکەون و ئیتر هەردوولا وازبێنن. جا حوکوومەت دانانی ئەو شوێنی کۆبوونەوەیە خستۆتە دەست شێخ مەحموود خۆی، لە کوێ ئارەزوو ئەکا تاتیا کۆببنەوە. «شێخ مەحموود» بەمە ڕازی بوو «خورماڵ»ی دانا بۆ شوێنی کۆبوونەوە و قسەکردن تیایا.

ئەمجا لە [٤ی ئەیلوولی ١٩٢٦]دا مستر کورنوالیس موستەشاری داخلیە، [کابتان هۆڵت] سکرتێری «مەندووبی سامی» بەغدا، وە موفەتیشی ئیدارەی سولەیمانی لە لایەن ئینگلیزەوە بە ڕێکەوتن بۆ خورماڵ و لەولاشەوە شێخ مەحموود بەخۆی و چەند پیاوێکەوە هات و کۆبوونەوەکەیان (٣) سەعات درێژەی کێشا. لەم کۆبوونەوەیەدا قسەیان لەگەلێ شتەوە کرد. لە ئاخردا لەو شوێنەدا لەسەر ئەم شتانەی خوارەوە ڕێ‌کەوتن:

١ـ [شێخ مەحموود] خۆی و هەندێ لە خزم و پیاوەکانی لەسەر پرسوڕای حوکوومەت نەبێ نەیەنە ناو عێراقەوە.

٢ـ دەست لە هیچ ئیشێکی حوکوومەت نەدا، کەسیش هەڵنەخڕێنێ بۆ ئەوە دەست

بخاتە کاروباری حوکوومەتەوە، تێکڵاوی هیچ بزووتنەوەیەکی سیاسی نەبێ بەرانبەر بە «عێراق».

٣ـ [بابەعەلی] کوڕی بنێرێ بۆ «بەغدا» کە لە سەر حیسابی حوکوومەت بخوێنێ.

٤ـ ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان حوکوومەت لێی خۆش بوو، ئەم لێخۆشبوونەی کە لەبارەی سیاسەتایە نەبێتە هۆی ئەوە کە ئەگەر خەڵکی‌تر لە بارەی کاروباری تایبەتیەوە لەگەڵیان، ویستیان شکات و شکاتکاری لێ بکەن ڕێگەیان لێ بگرێ.

٥ـ ئەو ملّکانەی کە حوکوومەت لێ زەوت کردووە پێی بداتەوە، وە ئەو ئەتوانێ یەکێکیان بۆ دابنێ بۆ ئەوە بیانهێنێتە بەرهەم.

٦ـ حوکوومەت خۆش‌بێ لە هەندێ لە ژێردەستەکانی بەرانبەر بە چەند پەیمانێك، بەڵام ئەوانەی کە گوناحەکانیان زۆر زلە لەوانە خۆش نابێت[١].

پاش ئەم قسانە ئینگلیزەکان هەستان گەڕانەوە بۆ بەغدا و «شێخ مەحموود»یش بۆ دەوری پێنجوێن و پیران. لەم مەرجانە کە ئەم ئینگلیزانە دایاننا شێخ مەحموود زۆر سەری سڕما، لە ئاخردا هەر بە هیوای ئەوە کە بزانێ دنیای پاشەڕۆژ بە چەکارەساتێکی‌تر ئاوسە، لە [٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٦]دا لە لایەن خۆیەوە «سەید ئەحمەدی مەرەخەس»ی نارد بۆ بەغدا بۆ جێ‌بەجێ کردن و ئیمزاکردنی ئەم پەیمانە. «سەید ئەحمەد» ماوەیەك لە بەغدا مایەوە و لە لایەن ئەم فرمانەوە کەوتە قسەکردن لەگەڵ پیاوەکانی بەغدا و لەگەڵ ئینگلیزەکانا. تا لە دەوروبەری ناوەڕاستی کانوونی دووهەمی (١٩٢٧)دا حوکوومەتی عێراقی ئیمزای پەیمانەکانی کرد و سەید ئەحمەد هێنایەوە بۆ «شێخ مەحموود» کە ئەویش ئیمزای بکات.

لەو ماوەیەدا کە «سەید ئەحمەد» چووبوو بۆ بەغدا «شێخ مەحموود» هەر فیکری لە چۆنیەتی ئەم پەیمانە ئەکردەوە؛ فیکری لەوە ئەکردەوە کە ئەو لەو ڕۆژەوە هۆشی کردۆتەوە تا ئەم ڕۆژە ئەم هەموو شۆڕش و ئاژاوانەی بۆ سەندنەوەی حەقی خوراوی کورد و بۆ سەربەخۆیی کورد کردووە، کەچی ئێستە پەیمانێکی وەها هەموو کۆششەکەی

١. مەبەست بەو گوناحبارە زۆر زلانە لەو ڕۆژانەدا «کەریم بەگی فتاح بەگ و سابری کەریم بەگ و شێخ عەلی قەڵبەزە و شێخ موحەممەدە بچکۆلە و خەلیفە یوونس» و چەند کەسێکی‌تر بوون.

ئەدا بە بادا و وەکوو ئەوە وایە کە هەر هیچی نەکردبێ!. لەبەر ئەم باوەڕانە لە ئیمزا کردنی پەیمانێکی وا پەشیمان بووەوە و بڕیاریدا کە بەو جۆرە بە ئاسانی ئیمزای نەکا. بەو بۆنەوە هێنای لە [٢٧ی کانونی دووهەمی ١٩٢٧]دا ئەم نامە و مەرجەی بۆ مەندووبی سامی بەغدا نووسی و بۆی نارد. بۆی نووسی کە:

«لەبەر ئەوە کە وەختی خۆی حوکوومەتی بەریتانیا لەبارەی حقووقی کوردەوە هەندێ قسەو پەیمانی داوە بە کۆمەڵی ئەقوام (عصبة الأمم) وە ئێستە پشتی لەو قسانە کردۆتەوە. من داوای بەجێهێنانی ئەو پەیمانانە ئەکەم، وەیان بەلانی کەمەوە بۆ ئەوە من بتوانم ئەم پەیمانەی بەینی خۆم و حوکوومەتی عێراقییە ئیمزا بکەم ئەبێ ناوچەی پێنجوێنم بدرێتێ بۆ ئەوە ئەو ناوچەیە ببێ بە شوێن و جێگەی ئەو کەسانە کە وەکوو من داوای حوقووقی میللی کورد ئەکەن.».

[مەندووبی سامی]ش بۆی نووسیەوە کە:

«کۆمەڵی ئەقوام شتی وای نەوتووە کە سەربەخۆیی بدرێ بە کورد، ئەوی ئەو دانی پیانابێ ئەوەبووە کە ئارەزووی کوردەکان بەجێ بهێنرێ، ئەم ئارەزووەش ئەوەیە کە کاربەدەستەکانیان لە خۆیان بێ، زمانی کوردی زمانێکی ڕەسمی بێ. دوو حوکوومەتی عێراقی و بەریتانی ئەمەیان قەبووڵ کرد و کەوتنە جێبەجێ کردنی.».

شێخ مەحموود کە ئەم وەڵامەی بیستەوە بڕیاری دا لەسەر شۆڕشی خۆی بڕوا و دەستی کردەوە بەداگیرکردنی ئەو وڵاتانە و بە پیاو ناردن بە هەموو لایەکی وڵاتی پێنجوێن و شارەزوورا. سەرلەنوێ لەگەڵ حوکوومەتدا کەوتنەوە شەڕ: «پێنجوێن»ی کرد بە شوێنی بنەی شەڕ و بەرەبەرە ڕوو بە وڵاتی «سولەیمانی» ئەڕۆیشت.

لەو ماوەی چەند مانگەدا کە شەڕ وەستێنرابوو، حوکوومەت لەبەینی پێنجوێن و سولەیمانیدا گەلێ کارقایمی کردبوو، نوختەی پۆلیسی لەهەموو لایەك دامەزراندبوو، هێزی هەوایی بەریتانی بۆ پاسی ئەو نوختانە و بۆ چاوترساندنی خەڵك هەموو وەخت هاتوچووی بوو.

پاش ئەمە هێزێکی زۆر زۆر لەهی حوکوومەتی عێراقی و لەشکری لیوی و فڕۆکەی ئینگلیزی بە جارێ پەلاماری «شێخ مەحموود»یاندا لە پێنجوێن و دەوروبەری

پێنجوێن. بەرەی لای شێخ مەحموودیش بەرەنگاریان بوون، شەڕ هەتا ئەهات گەرمتر ئەبوو، هێزی حوکوومەت هەتا ئەهات زیاتری ئەکرد، هێزی «شێخ مەحموود» ورده ورده لەبەر کەمبوونەوەی چەك بێ‌هێزی بەسەردا ئەهات، لەگەڵ ئەمەشا زیانی کوشتاری بەری حوکوومەت و زیانی جبەخانه و فڕۆکەیان له حساب نەئەهات.

له ئاخرا له [٢٠ی نیسانی ١٩٢٧]دا شێخ مەحموود پێنجوێنی چۆڵ کرد و هێزی حوکوومەت له ڕۆژی (٢٣)دا چووه ناویەوه و بەهەموو جۆر دەستی کرد بە کارقایمی تیایا. هەرچەنده پێنجوێن له دەست «شێخ مەحموود» دەرچووبوو بەڵام له دەرەوه حوکوومەتی بە شەڕی چەتەیەتی کوشتبوو، هەرجاره له لایەکەوه پەلاماری ئەدا.

پاش ئەم هەرایه هەندێ له دۆستەکانی پێیان وت مادام کاروبار ئێسته وای لێ هاتووه، شەڕ نەچووه بچێت، بێنه ئێسته پەیمانەکەی خۆت و مەندووبی سامی و حوکوومەتی عێراقی ئیمزا که و ئیمڕۆ هێمنیەك بده بە حوکوومەت، سبەی ڕۆژێ که پشوویەکمان پیا هاتەوه ئەتوانین ئەو شەڕەی ئێسته ئەیکەین ئەو ڕۆژه بیکەین.

قسەکەیانی وەرگرت و ئەمجا هات پەیمانەکەی ئیمزا کرد و دای به «مەجید ئەفەنی» کانیسکان و «بابەعەلی» کوڕی خسته تەك و ناردیه پێنجوێن، لەوێوه ئەو چوو بۆ بەغدا، له [١٤ای حوزەیرانی ١٩٢٧]دا ئەوان گەیشتنه جێ و پەیمانەکەی گەیانده شوێنی خۆی.

له ڕۆژی (١٧)ی مانگدا خۆیشی هات بۆ [پێنجوێن]، لەم لاشەوه موتەسەرفی سولەیمانی و موفەتیشی ئیدارەی ئینگلیز له سولەیمانی چوون بۆ پێنجوێن، ئەوەی لەلایەن بەندەکانی پەیمانەکەوه مابوو جێ‌بەجێ کرا، پاشان ئەمان گەڕانەوه بۆ سولەیمانی و ئەویش چووەوه بۆ «پیران».

له (٢٨» حوزەیراندا جەعفەر عەسکەری (رئيس الوزرا) چوو بۆ سولەیمانی و لەوێوه بۆ پێنجوێن، «شێخ مەحموود»یش لەولاوه هات و لەگەڵ ئەویشا چاویان بە یەك کەوت، قسەیان هاته سەر ئەوه که ئەویش خۆی بچێت سەرێکی بەغدا بدا، ئەم قسەشیه وەرگرت و بەرێ‌کەوت له [٥ی تەمووزی ١٩٢٧]دا گەیشته بەغدا و لەوێ «مەندووبی سامی» چاو پێ‌کەوت و شوێن و جێگەی بۆ «بابەعەلی» کوڕی ـ که

لەگەڵ خۆی هێنابووی ـ ڕێك خست و پاشان گەڕایەوە بۆ سولەیمانی و لەوێوە بۆ «پیران» لە مەریوان.

کە ئەو چوو لە «پیران» دانیشت مەعنای وانەبوو شۆڕشی کوردایەتی نیشتەوە و ئیتر ئاوکرا بە ئاگرا. لە وڵاتی سولەیمانی لەسەر بە شێخ مەحموودەکان لە ژێرەوە هەر خەریك بوون و بۆ هەل ئەگەڕان، پیاوەکانی [شێخ مەحموود] هەموو جار هاتوچووی سولەیمانیان ئەکرد، لەم هاتوچووکردنەدا هەموو جۆرە باوەڕێك تازە ئەبووەوە.

بەڵێ وەکوو لە هەموو وڵاتێك کە بەرەی توجار و خاوەنپارەکان حەز بە ئاسایش و پشێوەنەبوون ئەکەن لە سولەیمانیش ئەو دەستەیە لە ڕواڵەتا حەزیان بەو بێ پشێوەییە ئەکرد، بەڵام ئەمە مەعنای وانەبوو کە بزووتنەوەی «شێخ مەحموود»یان پێ ناخۆش بوو، ئەیانزانی کە شۆڕشی شێخ مەحموود بۆ سەربەخۆیی و بۆ ئازادی کوردە، هەموو دەمێکیش سەربەخۆیی و ئازادی لە دیلی و ژێردەستەیی خۆشترە، ئەوەندە هەبوو لە ڕواڵەتا لەبەر هێزی زۆردار وایان پیشان ئەدا کە گۆیا ئەوەندە لووت بەم بزووتنەوەی شێخ مەحموودەدا نایەنن. خۆ ئەگەر لە ژێریشەوە سەیر بکرایە هەموو کسپە لە جەرگیانەوە ئەهات بۆ دەربەدەری «شێخ مەحموود» و بۆ تێکچوونی حوکوومەتی کوردستان.

بۆ وێنە پیاوەتیەکانی «کەریمی عەلەکە» کە لە ژێرەوە و بەبێدەنگ لەگەڵ دەستەی شێخ مەحموود و لەگەڵ ئەهلی سولەیمانیدا بە پارە و بە لیرە ئەینواند ئەمە یەکێك بوو لە شا وێنەی هەستی سولەیمانی بەرانبەر بە بزووتنەوەی شێخ مەحموود و وڵاتی شێخ مەحموود.

ئەمە لەم لاوە هەستی نهێنی سولەیمانی وا، لەولاشەوە مەرکەزی سیاسەت و بزووتنەوە لە سولەیمانیەوە چووبووە «پیران». شێخ مەحموود لەوێ دانیشتبوو ئەمەش مەعنای ئەوە نەبوو کە دەستی لە ئەنجامی شۆڕشی چەند ساڵەی هەڵگرتووە، بەڵکوو کۆنگرەی ڕاستی بۆ ئەم مەبەستە هەر ئەوەبوو کە لە «پیران» دروست ئەبوو.

پیران ناوەڕاستی بزووتنەوەی شۆڕشی شێخ مەحموود بوو، مەریوان و هەورامان و بانە و جوانڕۆ و ڕەوانسەر بە دەوریەوە بوون، ڕێبازی گەرمیان و کوێستانی عەشرەتی جاف بوو، ڕێگەیەکی نزیکی چەپەری «سنە» بوو بۆ دەم بەیەك گەیشتن لەگەڵ

ئەعیانەکانی سنەدا. شێخ مەحموود لەوێدا بە سانایی لەگەڵ ئەم هەموو شوێنانەدا قسەی ئەکرد و ئەم هەموو شوێنانە وەکوو پوورەی هەنگ لە دەوری کۆ ئەبوونەوە.

لەوێدا توانی مەزبەتەیەکی گەورە دروست بکا و بینێرێ بۆ ئەعیانەکانی سنە بۆ ئەوە بڕیار لەسەر بوونی حوکوومەتێکی کوردی بدەن و پاشان بە هۆی ئەم مەزبەتە و پشتیوانییەوە کە لە هەموو لایەکەوە ئەکرێ سەرلەنوێ تێ‌هەڵچێتەوە و بکەوێتەوە ئیش‌کردن.

کە وابوو ئەو ماوەیە کە شێخ مەحموود لە «پیران» و «ولەژێر» بوو وەنەبێ تەنها لەبەر ئەوە بووبێ کە ئینگلیز، وە یا حوکوومەتی عێراقی ڕێگەی هاتنەوەیان لێ گرتووە، بەڵکوو زیاتر ئامانجەکەی ئەوەبوو کە ئەو شتانە ڕێك خا. ئەگینا ئەگەر ئەو بیویستایە بە ژیانی چەتەیەتی ڕاببوێرێ هەموو دەمێك ئەیتوانی لە ژێر سێبەری ئەو ژیانەدا ئینگلیز و حوکوومەتی عێراق تووشی گەلێ تەنگ‌وچەڵەمە و گیروگرفتێ بکا.

❋ ❋ ❋

سولەیمانی و کوردەواری ماوەیەك بە هێمنی ڕواڵەتی و بە نائاسایشی فیکری ڕایانبوارد، ئەمان لەم‌لاوە و «شێخ مەحموود» لەولاوە. وردە وردە ساڵی (١٩٣٠) تەنگی بە هاتنە پێشەوە هەڵچنی، ساڵێکی سەیر بوو بەرانبەر بە کوردەواری، بۆنی خوێنی لێ ئەهات؛ بۆنی خوێنی لێ ئەهات زیاتر بەرانبەر بە ناوشاری سولەیمانی!.

پەیمانی عێراقی ـ ئینگلیزی (١٩٣٠) خەریك بوو ئەهاتە پێشەوە، هێشتا ساڵی (١٩٣٠) نەهاتبوو «مەندووبی سامی» بەریتانی لە بەغدا «جلبرت کلایتن» مرد و حوکوومەتی بەریتانی «سیرفرەنسیس هەمفریز»ی دانا بە مەندووبی سامی و لە [١٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٩]دا گەیشتە بەغدا، بە پەلە گەیشت بۆ ئەمە بناغە بۆ بەستنەوەی ئەو پەیمانە دابنێ! چونکە بناغەکانی «کلایتن» بە مردنی خۆی تۆزێ تێکچوون.

کە ئەم هات بۆ بەغدا وەزارەتی «عبدالمحسن سعدون» بوو. وا دیار بوو قسەکانیان یەکی نەئەگرت بۆیە لە داخانا لە [١٣ی تشرینی دووهەمی ١٩٢٩]دا لە بەغدا خۆی کوشت و لە وەسیەتنامەکەشیا وتی: «شەعب چاوەڕێ خزمەتە و ئینگلیزیش نایەڵێ، منیش هیچ پشتیوانێکم نییە، عێراق سەربەخۆیی ئەوێ کەچی بێ‌هێزیشن، وا

ئەزانن من بەرانبەر بەم نیشتمانە خائنم و پیاوی ئینگلیزم، داخەکەم قسەی پیاوی پیاو ناگرنەگوێ، کە واتە با من لە پێناوی ئەم نیشتمانەدا ببم بە پێشمەرگە!.».

لە ڕۆژی (١٨) عەینی مانگا «ناجی سویدی» وەزارەتی دروست کرد، ئەویش کە سەیری کرد ئەرکەکانی ئینگلیزی پێ بەڕێوە نابرێ. لە [٩ی مارتی ١٩٣٠]دا دایە دواوە. لە ئەرکە هەرەزلەکانی ئینگلیزیش مەسەلەی پەیمانەکە بوو، کە لە (١٩٢٢) کرابوو بۆ (١٩٢٧)، لێرەدا پێنج ساڵیتر دوا بخرێ، لە (١٩٣٢) کۆمەڵی ئەقوام ئەگەر نوێنەری عێراقی خستە ناوخۆیەوە ئەو وەختە ئەو پەیمانی عێراقی ـ ئینگلیزیە کە لە [١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٧]دا لە لەندەن ئیمزا کراوە بکەوێتە ئیشەوە.

کە ئەمانە ڕوویدا «نووری سەعید» هاتە پێشەوە و وتی ئەم ئیشە ئیشی ئەوان نییە ئیشی خۆمە!. لە [١٣ی مارتی ١٩٣٠]دا وەزارەتی دروست کرد و کەوتە هاتوچوو و هەڵسووڕان بۆ پەیمانی ئەم ساڵی (١٩٣٠)ە!. لە ئەندامانی وەزارەتەکەی: «جەمیل مەدفەعی» وەزیری داخلیە، «جەمال بابان» وەزیری عەدلیە، «جەعفەر عەسکەری» وەزیری دفاع بوون.

ناوی ئەمانەمان بۆ ئەوە هێنا چونکە ئیشمان پێیان ئەکەوێ بە کەمەکێ پێش مانگی ئەیلوول!. هەر لەم وەزارەتەشا بوو کە «توفیق وەهبی» کرا بە موتەسەڕیفی شاری سولەیمانی.

ئەو قسەیە لە هەموو کەس ئاشکرا بوو کە پەیمانی عێراقی ـ بەریتانی ئەبێ لە ڕۆژی [٣٠ی حوزەیرانی ١٩٣٠]دا دوایی پێ بهێنرێ، وردە وردە بەندەکانی پەیمان بە گەلێ پێش ئەو مێژووە کەوتە بەرچاوی خەڵك. بە جۆرێکی تێکڕایی لە وڵاتەکانی جنووبی عێراق و بەغدا دەنگوباسی ناڕەزایی خەڵك لەم پەیمانە بڵاوبووەوە، ئەویسترا ئەم پەیمانە بە جۆرێکی نیوە نهێنی بکرێ، کەچی زۆر خراپ دەنگی دایەوە، ئەم دەنگ دانەوەیە و قسە لێوەکردنەی خەریك بوو بەرانبەر بە عێراق ئاوەکە لە ئینگلیز لێڵ بکا!. هەرای شارەکانی جنووبی عێراق و شاری بەغدا دەستی پێ کرد، ئەمان لێرە لەگەڵ ئەو هەرایەدا خەریك بن.

* * *

وڵاتی سولەیمانی و کوردەواری کە سەیریان کرد ئەم پەیمانە بەم جۆرە کە ئەبەستریٚ لەبارەی کوردەوە، هیچ شتێکی تیانیە و ئەو قسانە کە زووتر لە لایەن حوقووقی کوردەوە وتراون بۆدەرمانیش لەم پەیمانەدا نین!. ئەمە ئاژاوەیەکی فیکری لە وڵاتی «سولەیمانی»دا نایەوە، نەوەك هەر لە سولەیمانی بەڵکوو لە هەموو کوردەواری عێراقا. داخ و ژاری دوورخستەوەی شێخ مەحموود و تێکچوونی حوکوومەتی کوردستان لە دڵی خەڵکدا پەنگی خواردبووەوە ئەمەشی چووەسەر!.

جاریٚ لە مانگی شوباتی (١٩٢٩)دا جەمال بابان، حازم شەمدین ئاغا، حمەبەگی جاف، ئیسماعیل ڕواندزی، «سیف‌اللّه» خەندان، حەمەسالح بەگی حەمەعەلی بەگ ـکە ئەمانە نایبی کوردبوون لە پارلەماندا ـ عەریزەیەکیان‌دا بە ڕەئیسی وزەرا و لە بارەی کاروباری کوردەوە داوای هەندیٚ شتیان کرد، کە لەو شتانە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١ـ یەکیەتیەکی ئیدارەی کوردستان دروست بکریٚ کە وڵاتەکانی کەرکووك، هەولێر، سولەیمانی بگرێتەوە و ئەمانە هەموو پێکەوە بن، لوایەك لە قەزا کوردەواریەکانی [مووسڵ] دروست بکرێت، چاوێری‌کردنی کاروباری ئەم یەکیەتی ئیدارەیە لە ژێر فەرمانی موفەتیشێکی کوردی گشتیدا بێت کە ئەم موفەتیشە چەپەر و واسیتە بێت لە بەینی حوکوومەتی بەغدا و ئەم ناوچە کوردەواریانەدا.

٢ـ پارەی میزانیەی مەعارفی کوردەواری زیاد بکرێت.

٣ـ پارەی کاروباری گشتی‌تر ئەو ناوچانە زیاد بکرێت.

کە ئەم عەریزەیەیان دا وەڵامێکیان دەست نەکەوتەوە، لە مارتی (١٩٣٠)دا دیسان تیٚ‌هەڵچوونەوە، دیارە قسەکردنی ئەمانە لە ڕووی ئەوەوە بوو کە ئەیانزانی لە وڵاتی کوردەواری بزووتنەوەیەك سەری هەڵداوەتەوە!.

ئەم جارە ڕەئیسی وزەرا تۆزیٚ شڵەژا و کەوتە قسەکردن لەگەڵ [مەندووبی سامی]. هەردووکیان قسەیان هاتە سەر ئەوە کە بەندی یەکەمی عەریزەی ئەوانە جیٚ‌بەجیٚ بوونی دروست نابیٚ، ئەوەندە هەبوو گۆیا وەزارەت دەستی دا بە دانانی ئەو قانوونە کە زمانی ڕەسمی لەوڵاتەکانی کوردەواریدا زمانی کوردی بیٚ.

ئەوەبوو کە لە [٢٣ی مارتی ١٩٣٠]دا نووری سەعید وەزارەتی دروست کرد و «جەمال

بابان»ی خستە ناو وەزارەتەکەیەوە ئاو کرا بە ئاگرا و ئیتر داواکردنی شت لە لایەن ئەو دەستەیەوە دوایی هات!. لەگەڵ ئەوەش هەر بۆ ئاهی سوێن لە [١٠ی نیسانی ١٩٣٠]دا وەزارەت بڵاوی کردەوە کە:

«وەزارەت ئەیەوێ ئامانجی هەموولایەك بەجێ بێنێ، بە تایبەتی ئەو شتانە کە ئاشنایەتیان بە ناوچەکانی کوردەوارییەوە هەیە؛ لە ڕیزی ئەوشتانە ئەوەیە کە نووسراوێك دابنێت و لەم نووسراوەدا باسی ئەوە بکرێ: بە پشتیوانی بەندی (١٧)ی قانوونی ئەساسی زمانی ڕەسمی لە وڵاتەکانی کوردەواریدا زمانی کوردی بێت، وەئەمە ـ ئیشەڵڵا! ـ ئەدرێ بە پاڕلەمان و پاڕلەمانیش بە گیان و بەدڵ بڕیاری لەسەر ئەدا!.»).

سەیرتریش ئەوەبوو هێشتا نە، نووسراوکرابوو، وە نەدرا بوو بە پاڕلەمان کەچی هەندێ لە ڕۆژنامەکانی ئەو ڕۆژەی بەغدا گێرەوکێشەیان بوو لەسەری ئەیانوت: زمانی ڕەسمی زمانی عەرەبیە، چۆن ئەبێ زمانی کوردی بێت؟!..

ئەمجا لەبەر ئەوە کاروباری وڵاتی کوردەواری لە بارەی ئەم پەیمانەوە بەرانبەر بە ئینگلیز باش نەئەهاتە بەرچاو. مەندووبی سامیش هەر لەو ساڵی (١٩٣٠)دا نووسراوێکی بۆ دڵخۆش‌کردنی کوردەکان دا بە کۆمەڵی ئەقوام و تیایا نووسی:

(لەبەر ئەوە کە کوردەکان لە وڵاتی عێراقا لە کاروباری خۆیان ڕازی نین و متمانەی تەواویان نییە، وە لەبەر ئەوە کە سەرلەنوێ باوەڕیان پێ پەیدا بکرێتەوە «مەندووبی سامی و مەلیك فیسەل و نووری سەعید» و موستەشارەکان کۆبوونەوە و لەم ڕووەوە قسەیان کرد. لەو قسانەدا کە کردیان:

١ـ دانانی قانوونی بەکارهێنانی زمانی کوردی.

٢ـ دانانی دەستە دلماجێك لە وەزارەتی داخلیەی بەغدا بۆ ئەوە ئەمانە قانوون و فەرمان و نیزامەکان بکەن بە کوردی.

٣ـ معاونی مدیری داخلیەی گشتی کورد بێت.

٤ـ قوتابخانەکان لە لواکانی هەولێر، کەرکووك و سولەیمانیا لە ژێر چاوێری موفەتیشێکی تایبەتیدا بێت.

(ئەمانە هەموو لە پێش دوایی‌هاتنی ساڵی (١٩٣٠)دا جێ‌بەجێ ئەکرێت.).

ئەمان ئەم قسانەیان لێرەوە ئەکرد و لەولاشەوە کوردەکان پەیتا پەیتا لە هەموولایەکەوە برووسکە و نامەیان لەلایەن حقووقی کوردەوە هەر ئەباران بە سەر کۆمەڵی ئەقوام لە «جنێڤ» و بە سەر موعتەمیدی سامیدا لە بەغدا.

کاروباری سولەیمانی هەتا ئەهات زیاتر ڕووی بەلای گرژیدا ئەکرد، ئیشی خۆیانیان زۆر خراپ ئەهاتە بەرچاو، بەمەزبەتە و عەریزە و ڕاسپاردن ڕوویان ئەکردە هەرلایەك لە ناهومێدی بەولاوە هیچیتریان وەرنەئەگرت!. نە وەك هەر ئەوەندە بەڵکوو کەوتبوونە ڕۆژێکەوە کە، هەرابوو لەبەینی ژیان و مردنا؛ ئەوان تا ئەو ڕۆژە بە تەمای سەربەخۆیی و ئازادی بوون، کەچی سەیریان ئەکرد پەیمانی عێراقی ـ ئینگلیزییان بۆ ئەهێنانە پێشەوە، کە ئەم پەیمانە تەنانەت ژیانێکی تۆزێ هێمنیشی بۆ ئەوان تیا نییە!.

لەبەر ئەمانە نەوەك تەنها ناوشار، بەڵکوو ئەهلی دەرەوەی شاریش هەستیان بە خەتەرێکی زۆر گەورە کردبوو بەرانبەر بە خۆیان، بەم بۆنەوە ناوشاری سولەیمانی لەم ڕۆژانەدا بووبوو بە شوێنی کۆنگرەیەکی گەورە و لە هەموو لایەکەوە کوردەکان ڕوویان تێ ئەکرد. لە زۆر لە دیواخانەکانی شارەکەدا بۆ ئەم مەبەستە و بۆ قسەکردن لە پاشەڕۆژی کورد قۆمیتە ئەکرا و وتار و شیعری ئاگرین لە لایەن شاعیرەکانەوە لە گەلێ شوێن و شوێنە پڕمەردمەکانا دەنگی ئەدایەوە.

بڵاوکردنەوەی مەزبەتەکان بەسەر شوێنە سیاسیەکانا و کۆبوونەوەکانی ناوشاری سولەیمانی و ترسی گەیشتنی ئەم دەنگانە لەم کاتە تەنگوچەڵەمەدا بە «شێخ مەحموود» لە دەرەوەی عێراق، ئەمانە هەموو حوکومەتی «بەغدا»یان شڵەژاندبوو.

ئەمە لەملایەنەوەوا، لە لایەکیتریشەوە حوکوومەت بڕیاری داوە لە [١٠ی تەمووزی ١٩٣٠] دەست بکرێ بە هەڵبژاردنی نائیبەکان و لە (١٠)ی ئەیلوولدا دوایی بێت بۆ ئەوەوە بە هێمنی لە وەختی خۆیا «نائیب» بچنە پارلەمانەوە و بڕیار لەسەر پەیمانی [٣٠ حوزەیرانی ١٩٣٠]ی ئیمزا کراوی لەندەن بدەن!. کەچی لەم وەختەدا ئەم هەرایە لە سولەیمانی پەیدا بێ ئەمە چۆن ئەبێ؟!. لە کاتێکا کە سولەیمانی چاوی بە قاقەزی هەڵبژاردنی سەرەتای (١٠)ی تەمووز کەوت ئەوەندەیتر ئاگری تێبەربوو!. چۆن ئاگری تێبەر نابێ؟. ئەوێ کە بزانێ دانانی پارلەمانێکی وا بۆ سەربڕینی ئەو ئەبێ، گومان لەوەدا نابێ کە نایەوێ بچێتە [پارلەمان]ەوە.

لەم لاشەوە وڵاتەکانی جەنووب و شاری بەغدا ئەوانیش هەر بەو جۆرە تێك چووبوون، بەڵام تێکچوونی ئەوان لەبەر دەردێك بوو، هی وڵاتی سولەیمانی لەبەر دەردێکی‌تر بوو، دەردەکان گەلێ جیا بوون لەیەك؛ وڵاتی عەربەکان ئەیانوت بە پەیمانێکی وەها نیوەگیان ئەبین، وڵاتی کوردەواری ئەیانوت نەوەك نیوەگیان. بەڵکوو خوێن لە لەشمانا نامێنێ!.

کە ڕۆژەکانی وڵاتی «سولەیمانی» و بیروباوەڕەکانیان وای لێ‌هات، حوکوومەتی بەغدا ناچار بوو بەوەکە بکەوێتە گەڕان و پەلاماردان. بە تایبەتی «نووری سەعید» ڕەئیسی وزەرایە و بۆ مۆرکردنی پەیمان چووە بۆ لەندەن و «جەعفەر عەسکەری» زاوای کردووە بە وەکیلی خۆی و پێی‌وتووە ئاگات لە ئیش بێ!.. لەولاشەوە «مستر همفریز» مەندووبی سامی بەریتانیایە لە بەغدا و ئەویش هەر بۆ مۆرکردنی پەیمان لەگەڵ هاورێ خۆشەویستیا نووری سەعید چووە بۆ لەندەن و «مێجەر یانغ»ی لە شوێنی خۆی داناوە وئەویش بەوی وتووە: تۆیش ئاگات لە ئیش بێت!.

لەبەر ئەمانە لە ڕۆژی [٨ی ئابی ١٩٣٠]دا جەعفەر عەسکەری وەزیری دفاع و نائیبی ڕەئیسی وزەرا، مێجەر یانغ وەکیلی مەندووبی سامی، جەمیل مەدفەعی وەزیری داخلیە و جەمال بابان وەزیری عەدلیە بە فڕۆکە ڕووبەڕووی کوردەواری بوونەوە و لە کەرکووك نیشتنەوە و خەڵکیان کۆ کردەوە، لە بارەی پەیمان و وڵاتی کوردەوارییەوە دەستیان کرد بە قسەکردن لەگەڵیانا، لەوێ چوون بۆ «هەولێر» هەر عەینی چەشن و ڕۆژی (٩) گەڕانەوە بۆ «سولەیمانی».

کە چوونە سولەیمانی سەیریان کرد شاری سولەیمانی دەورەی شۆڕشێکی زۆر گەورە ئەگیرێ، لە هەموو دەستە کوردێکی وڵاتەکانی تیا کۆبووەتەوە و بە دەنگی ئاوازەی ئازادی، مناڵی ناوبێشکە ئەلاوێننەوە، دار و بەرد حەشاماتە و ڕێ بەر ڕێدار ناکەوێ.

بە هەر جۆرە بوو دریان بە خەڵکەکە دا و چوونە ناو سەرای حوکوومەتییەوە. بەردەرکی سەرا و ئەو ناوەش پڕ بووە و هەر گەورە و بچووکێك لە عاستی خۆی شۆڕشێکی فیکری ئەگیرێ!. ئەمانە هەرچەندە ئەیانزانی قسەکردنیان لەو شوێنەدا و لەناو ئەو باوەڕانەدا جێ‌گیر نابێ بەڵام لەگەڵ ئەوەش «جەعفەر عەسکەری» و «مێجەر یانغ» هاتنە سەر لێواری بەرهەیوانی سەراکە و ڕوویان کردە خەڵکەکە و دەستیان کرد بە قسەکردن؛ بەو

قسەکردنانە کە تا ئەو وەختە ئەو خەڵکە زۆر شتی وایان گوێ لێ بووبوو هیچیشی نەهاتبووە دی!.

لە خۆشی قسەکان خەڵکەکە گوێیان ڕاگرتبوو چونکە هیوایەك بوو وەکوو هیواکانی جاران؛ ئەیانوت ئەوانەتان بۆ ئەکەین و ئەو فرمانە چاکانەتان بۆ بە ئەنجام ئەگەیەنین!. لە جەرگەی گوێ گرتنەکەدا و لە دوای بیستنی ئەوقسانە «ڕەمزی فەتاح» لەناو خەڵکەکەدا ڕاست بووەوە و وتی:

«جەعفەر عەسکەری!. ئەم قسانە بیخەرەوە توورەکەکەی خۆت و بیبەوە بۆ بەغدا، جارێکی‌کە ئێمە بەم جۆرە قسانە هەڵناخەڵەتین و ئەو جۆرە فرمێسکانە دڵمان فێنك ناکاتەوە بۆ ئەوە چاو لە سەربەخۆیی و ئازادی خۆمان بپۆشین، یا ئێمە، یا سەربەخۆیی و ئازادی!.».

مەبەست بە فرمێسکەکان ئەو تنۆکە فرمێسکانە بوو کە [جەعفەر عەسکەری] بە چاویا ئەهاتە خوارەوە.

[جەعفەر عەسکەری] کە ئەو شۆڕش و هەمهەمەی ئەو ڕۆژەی چاوپێ‌کەوت لە «سولەیمانی» و ئەو کوردانەی بە فیشەك و تفەنگ و دەمانچەوە بینی و هەموو بە یەك دەنگ داوای ئازادی وڵاتەکەیان ئەکرد، ئەویش لە کاتی وتارەکەیا جۆرە فرمێسکێك بە چاویا ئەهاتە خوارەوە و ڕووی ئەکردە خەڵکەکە و پەنجەی بۆ سنگی خۆی ڕائەکێشا و ئەیوت: «بۆچی ئەم خوێنە لەو خوێنەی ئێوە نییە!.» گۆیا دڵی بە کەساسی وڵاتی کورد پڕ ئەبوو بۆیە گریا!.. بەڵام لە ڕاستیدا ئایا ئەمە وابوو، دڵی پێیان ئەسووتا؟!.

بەلای منەوە وا نەبوو، چونکە نەوەك ئەو، بەڵکوو دیسان بەلای منەوە لە سەرەتای ئەم سەدەی بیستەمەوە هەموو پەرێشانی و دەربەدەری و هەژاری و بە قوڕاچوونی کورد ئۆباڵی ئەچێتە ئەستۆی هەندێ لەو پیاوە کوردانە کە بە ناوی وەزارەت و پایەی گەورە گەورەوە ـ بە ناوی کوردەوە ـ لە پایتەختەکانا دانیشتوون و گۆیا تەمسیلی کورد ئەکەن. ئەوانە بۆ ئەوە پایەکەی خۆیان بپارێزن هەر خەریکی ئەوەن کەوا ئاژاوە و فەلاکەت بۆ کورد بنێننەوە.

«عەلی کەمال»یش ئەو سەردەمە معاونی پۆلیس بوو لە بەغدا، بەخۆی و هەندێ پۆلیسەوە بۆ پارێزگاری ئەو دەستەیە چووبوو بۆ «سولەیمانی» و لەو قۆمیتەیەدا هەبوو، خەڵکەکە هەندێك ئەچوونەلای و هەندە جارێکیش پێیان ئەوت کە باوەڕی تۆ چیە؟

ئەویش پێ ئەوتن ئەم ڕۆژە ڕۆژی باسکردنی سەربەخۆیی نییە، ڕۆژی ئەوەیە داوای شتێك بکەن کە بۆتان سەربگرێ. لە باوەڕی ئەوا سەربەخۆیی سەری نەئەگرت!.

* * *

لەو سەردەمانەدا کە ئەم وەزیرانە ئەچن بۆ وڵاتی کوردەواری «مەعرووف جیاووگ» و «جەمال عارف» بەناوی پیتاك بۆ «یانەی سەرکەوتن» ـ کە ئەویش تازە دروست بووبوو لە بەغدا ـ ئەچن بۆ کوردەواری، مەعرووف پێشەکی خەبەر ئەنێرێ بۆ «کەلار» بۆ حەمەبەگی جاف کە بێت بۆ کەرکووك بۆ ئەوە لەبارەی کوردەوە هەندێ قسەی پێ بڵێ و ئەو قسانە بە جەعفەر و ئەوان بڵێت. ئەمان پاش ئەوە ئەچن بۆ سولەیمانی، لەوێ زۆر گوێیان نادەنێ، ئەگەڕێنەوە بۆ [هەولێر].

لە هەولێر لەماڵی مەلافەنی لە «باداوا» مەعرووف جیاووگ لەگەڵ «ئەحمەد عوسمان» تەلگرافێك ئەنووسن بۆ ڕۆژنامەی «ژیان» لە سولەیمانی و یەکێکیش بۆ ڕۆژنامەکانی بەغدا کە ئەمانە بە هەموو دڵێکیانەوە پشتیوانی ئەو خواستانە ئەکەن کە سولەیمانی داوای ئەکەن بۆ سەربەخۆیی کورد. ڕۆژنامەی «ژیان» ئەو تەلگرافە بڵاو ئەکاتەوە. پاش ئەمە ئەگەڕێنەوە بۆ سولەیمانی، ئەمجارە لە سەرشان هەڵیان ئەگرن. وەزیرەکانیش لەو وەختەدا لەوێ ئەبن.

دەستەی وەزیران ڕۆژی (١٠)ی ئاب ئەگەڕێنەوە بۆ بەغدا و خۆیان تێگەیشتن کە هیچیان بۆ نەکراوە.

ئەمجا بە قسەی مەعرووف جیاووگ کۆبوونەوەیەك ئەکەن لە سولەیمانی و قسە لەوەوە ئەکەن کە بۆ ئەم مەسەلەی سەربەخۆیی کوردە ئەبێ هەموو کوردەواری [عێراق] بە تایبەتی وڵاتی «بادینان» تێ بگەیەنن، بۆ ئەوە هەموویان بە یەك دەنگ داوا بکەن.

لەم ڕووەشەوە بڕیار وا ئەدەن کە نامەی بانگێشتن بنووسن بە ناوی «مەولوودیەوە» بۆ هەموو سەرۆك عەشرەت و شێخەکانی بادینان کە لە ڕۆژی [٢٤ ئابی ١٩٣٠]دا لە مزگەوتی گەورەی سولەیمانی مەولوودی ئەکرێ، کۆمەڵی بەڕێوەبەر، بانگیان ئەکا بۆ هاتنیان بۆ ئەو «مەولوود»یە.

جا، کە، کۆبوونەوە، لەوێدا قسەوباس و خواسیان چییە هەمووی ئەڵێن و دەنگیان

بۆ داواکردنی سەربەخۆیی کورد ئەبێ بەیەك.

هەر لەو شوێنەدا بە هەرەوزی قوتابیەکانی «زانستی» گەلێ نامە ئەنووسرێ و ئەخرێتە پاکەتەوە بەبێ ئەوە کە سەری بنووسرێ. ڕوو، لە هەرکە ئەنێن بۆ بردنیان کەس بە خۆیا ڕاناپەرمووێ. «جەمال عارف» لەگەڵ ئەوەشا کە ئەو سەردەمەش ئەفسەری عێراقی ئەبێ و گۆیا بەدەستوور لەگەڵ مەعرووف جیاوگا چووە، ئەرکی بردنیان ئەگرێتە ئەستۆ. وەریان ئەگرێت و ئەڕوا لە وڵاتەکانی «دهۆك» و «زاخۆ» و ئەو ناوەدا بە هەر جۆر ئەبێ ئەیانگەیەنێ بە سەرۆك عەشرەتەکان بە چەشنێکی زۆر نهێنی.

سەرە دێتە سەر «ئامێدی» و ئەچێت بۆ ئەویش. لەو وەختەدا «ماجد مستەفا» قائمقامی ئامێدی ئەبێ و ئەبێ بە میوانی ئەو، بەڵام پێ ناڵێ کە بۆچی چووە بۆ ئەو وڵاتە. لەپاش کەین وبەین و قسەکردن ماجد ئەیەوێ پێی دەرخا کە چۆن ڕێی کەوتۆتە ئەو وڵاتە؟ ئەمیش پێی ناڵێ.

پاش ئەمانە [ماجد] دەست ئەبا هەر قاقەزێك کە ئەم لەو وڵاتانەدا لەولایەنەوە بڵاوی کردۆتەوە دەریان ئەهێنێ و ئەیخاتە بەردەستی جەمال!. جەمال لەمە واقی وڕئەمێنێ. پاش ئەوە دیسان ماجد دەست ئەبا با قاقەزێکی‌تر دەردێنێ و ئەیدا بە جەمال پێی ئەڵێ بیخوێنەوە. کە ئەیخوێنێتەوە سەیر ئەکا: ئەمە فەرمانێکی حوکوومەتە کە بۆ گرتنی ئەم دەرچووە و بڵاو کراوەتەوە بەسەر هەموو شوێنە حوکوومیەکانا! گرتنەکەشی لەو ڕووەوەیە کە ئەم ئەرکەی گرتۆتە ئەستۆ و ئەچێ ئیشێکی وا لەناو کوردەکانا بڵاو ئەکاتەوە!.

ئەوەندەی‌تر سەری سڕ ئەمێنێ. بۆیەش وای لێ دێ چونکە لای‌وایە ئیشێکی زۆر نهێنی کردووە. تومەس قاقەزی بە هەرکەس داوە لەو وڵاتەدا ئەو کەسە خێرا قاقەزەکەی بردووە بۆ قائمقام و وتوویە «ئاگرە سووری لە خۆم دووری!.».

پاشان ماجد پێ ئەڵێ: برام ئیشی ئەمانە سەرناگرێ و وازبێنە، پێ ئەڵێ: ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەی و بۆ کورد ئەم کۆششەتە وەرە ئەوە لە «ئارارات» ئیحسان نووری خەریکی شەڕە، من لەگەڵت ئامادەم کە پێکەوە دووبەدوو بچین و شەڕبکەین، ئەگەر خۆواش ناکەی هەستە بە ڕێگەی خۆتا بە جۆرێك کە پێت نەزانن بگەڕێوە، دانیشتوانی ئەم وڵاتانە پشتیان پێ نابەسترێ.

جەمال وتی «دە» ڕووپیەشی پێدام بۆ خەرجی ڕێگەکەم و بەهەرجۆرە دزەیەك بوو لە دەست نوختەکانی حوکوومەت خۆمم گەیاندەوە سولەیمانی، وتی بۆ ڕۆژی ناوبراویش کەسیان نەهاتن بۆ کۆبوونەوەکە.

● ● ●

ئەم هەرایە و چوونی ئەم وەزیرانە بۆ سولەیمانی و کوردەواری هەمووی لەسەر بەزمی [ئینتیخابات] بوو، بۆ ئەوە بەڵکوو حوکوومەت دەستەنائیبێك دروست بکا و پاشان بە بێ قسە پەیمانی [٣٠ حوزەیرانی ١٩٣٠] لە پارلەمان بڕیاری لەسەر بدرێ، هەر لەبەر ئەوەش بوو کاتێ جەعفەر و ئەوان چوون بۆ سولەیمانی فایەقی تاپۆیان لەگەڵ خۆیان بردبوو بۆ ئەوە ببێ بە یەکێ لەو نائیبانە کە ئەوان ئەیانەوێ، بەڵام سولەیمانی کە بە فایەقیان زانی بە پێچەوانەی مەتلووب هاتنە پێشەوە لەگەڵیا، بەڵکوو ڕاویان ناو بەهزار کێشە سەری خۆی دەرباز کرد!.

پاش ئەوە کە ئەوان گەڕانەوە بۆ بەغدا لەبەر ئەوە کە وەختی خۆی «تۆفیق وەهبی» بۆ کاروباری ئینتیخابات لە سولەیمانی کرابوو بە موتەسەڕیف، وە ئەو ئیش و کردەوەیە کە ئەمان لە سولەیمانی چاویان پێکەوت زۆر دووربوو لەگەڵ ئەو مەبەستەدا کە هەیانبوو. کە چوونەوە «تۆفیق وەهبی»یان بانگ کردەوە بۆ بەغدا و«گاون»ی موفەتیشی ئیدارەی ئینگلیز لە سولەیمانی بوو بە وەکیلی موتەسەڕیف.

بەرەبەرە مانگی ئەیلوول هاتە پێشەوە، هەمهەمە و کۆبوونەوە و خوتبەدان لە شاری سولەیمانی ڕۆژ بەرۆژ هەر لە زیادی بوو، لە هەموو لایەکەوە خەڵك ڕژابوونە ناوشارەوە. ئەم کۆبوونەوانەش کە ئەکرا، وە یا هەمهەمەکان کە ئەبوو هەمووی بە جۆرێکی هێمن و ڕێکوپێك ئەکرا و هیچ نافەرمانییەك تیایا ڕووی نەئەدا، هەموو ئامانج و قسەکەیان ئەوەبوو:

[لەبەر ئەوە کە ئەو پەیمانە زیانێکی زۆری هەیە بۆ کورد، ئەمان نایانەوێ تیایا بەشداربن. بەڵکوو مادام ئیش گەیشتە ئەم شوێنەو تا ئێستە هەر شتێك لەبارەی کوردەوە هەبووە هەمووی هەر بە قسە دەرچووە لە ئێستە بە دواوە پێویستە ئیتر سەربەخۆ بین و لەمە زیاتر بە دەستبڕین دەستخەڕۆ نابن.]

لە ڕۆژی (٥)ی ئەیلوولا حوکوومەت کەوتە جێبەجێکردنی هەیئەتی تەفتیشی بۆ ئینتیخاباتی ڕۆژی دوایی. دیارە ئەمە پێچەوانەی ئەو بیر و باوەڕەیە کە تا ئەو ساتە خەڵکی سولەیمانی لە سەری بوون، چونکە ئەوان بڕیاریان داوە کە نەچن بەلای هەڵبژاردنا.

کەوتە ڕۆژی دوایی؛ ڕۆژی (٦)ی ئەیلوول، هەموو شتێك لە سەرادا ڕێك خراوە بۆ ئەو هەڵبژاردنە، هەر لە بەیانیەوە پۆلیس و سەرباز بە جۆرێکی زۆر زۆر لە دەوروبەری سەرادا کۆکرانەوە. ئەهالی ناوشاریش لەبەر دەرکی سەرادا کۆبوونەوە و قسەیان ئەکرد و شاعیرەکان شیعر و خوتبەیان ئەخوێندەوە و هانی خەڵکیان ئەدا بۆ ئەوە کە کەس دەنگ نەدا بەم هەڵبژاردنە و بەڵکوو بە یەك دەنگ داوای سەربەخۆیی و ئازادی کوردیان ئەکرد.

پۆلیس بڵاوەی پێ ئەکردن، لەولاوە سەرباز بەری لێشاوەکەی ئەگرتن. دنیا کەوتە چێشتەنگاو، پۆلیس دەستی کرد بە تەقە بەسەریانا، ئەمانیش بەدار و بە کورسی چاخانەکان بەربوونە پۆلیسەکان، پۆلیس دەستی کرد بە تەقەی ڕاستەقینە، ئەمانیش کە ئیشیان واهاتە بەرچاو دەستیان کرد بە تەقە و ڕاوی پۆلیسەکانیان نا. ئیش بەتەواوی تێكچوو و خوێن کەوتە سەرجادەی بەردەرکی سەرا!.

لەو کاتەدا بە فەرمانی ناو «سەرا» (١٠٠) سەربازیتر هاتن بۆ یارمەتی پۆلیسەکان و ئەو هەندە سەربازانە کە لەوێ بوون، ئەهلی شار کە ئەمەیان چاوپێکەوت ئەوەندەیتر شێرگیرتر بوون و ئیش لەوە ترازا کە بکوژێتەوە، بە تفەنگ و دەمانچە بەربوونە تەقەکردن لە پەنجەرەکانی سەرا و لە ئەهلی سەرا، پۆلیس و عەسکەر بەتەواوی دەستیان کردەوە و ئەوەندەیتر خوێن ڕژێنرا!. فەرماندەی سەرا کە سەیری کرد کاروبار بە بارێکیترا گۆڕا و شەڕ بوو بە شەڕی ئەهلی و ئەو هێزەی حوکوومەتیش کە هەیە چار ناکا خێرا داوای فەوجی سەربازی بە هەموو چەکێکەوە کرد لە ئامرفەوجی سولەیمانی.

شەڕ لە جۆشی گەرمیدا بۆ فەوجە عەسکەرێ بەهەموو جۆرە چەکێکەوە گەیشت، لە پشتی سەراوە چوونە سەربانی سەرا و لەم لاشەوە چوونە سەربانی چاخانەکان و مەترەلۆزیان دامەزراند لە ئەهالی و ئەو عالەمە ـکە دەرزیت هەڵبخستایە نەئەکەوتە زەوی لەبەر ئەوان- بەبێ ڕەحمانە درانە بەر شێلیکی مەترەلۆز و وەکوو ڕشتە بەسەر یەکدا هەڵدرانەوە، وە یا کوشتار وەکوو مەڕی قەسابخانە بەو جۆرە بە تەنیشت یەکدا هەڵاژیان!..

خوێنی گەشی ئەهالی، لەبەر دەرکی سەرادا لەگەڵ مێشکی پڕژاوی گەنجانی کورد بەدیوارەکانەوە هەر دەنگوباسی ئەوەیان بوو ئەیانوت ئازادی کورد و سەربەخۆیی کورد... تا، لای نیوەڕۆ ئەم شەڕە درێژەی کێشاو پاشان تیربارانی گولله بڵاوەی بە ئەهالی کرد.

بەپێ بەیاناتێك کە حوکوومەت لە (٢١)ی ئەیلوولا دای، ئەڵێ:

(لە کارەساتی ڕۆژی (٦)ی ئەیلوولی سولەیمانیا (٩) پۆلیس بەدار و بەرد و خنجەر بریندار‌بوون، سەربازێك کوژرا و سێ سەربازیش بریندار بوون، دوویان بە تفەنگ و یەکێکیان بە بەرد. هی ئەهالیش (١٣) کەس کوژرا و (٢٣) کەسیش بریندار بوو.)

بەڵام لە ڕاستیا وانەبوو بەڵکوو لە کارەساتی ئەو ڕۆژەی سولەیمانیا (٤٥) کەس کوژرا و (١٩٥) کەسیش بریندار بوو، بێجگە لە زیانی‌تر. لەبەر ئەمەبوو کە ئەو ڕۆژە لە سولەیمانیا ناونرایە «ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلوولی (٩٣٠)» وە بوو بە تەئریخیش بۆ ڕۆژانی داهاتوو.

پاش ئەوە کە خەڵکەکە بڵاوەیان پێ‌کرا هەر خێرا کەوتنە گرتنی ئەوکەسانە کە بە سەرۆکی ئەم بزووتنەوەیە ئەناسران. ئەوانەش ئەمانەبوون:

١ـ عەزمی بەگی بابان. ٢ـ شێخ قادری شێخ سەعید ـ٣ـ ئەوڕەحماناغای ئەحمەد پاشا. ٤ـ حەمەسالح بەگی حەمەعەلی بەگ. ٤ـ حمەغای ئەورەحماناغا. ٦ـ عیزەت بەگی وەسمان پاشا. ٧ـ فایەق بەگ. ٨ـ شێخ موحەممەدی گولانی. ٩ـ مەجید ئەفەنی کانیسکان. ١٠ـ ڕەمزی فەتاح. ١١ـ تۆفیق قەزاز.

ئەمانە گیران و هەرخێرا «گاون» موفەتیشی ئیداری هاتە دەرەوە بەدەستی پیرۆزی خۆی کەلەبچەکەی ئەکردە دەستیان و ئەیفەرموو: «قەیناکا، قەیناکا!.» ناردنی بۆ کەرکووك و لەوێ بۆ بەغدا. پاش بردنی ئەوان نزیکەی (١٥٠) کەسی‌تر لەناو شارگیران و ئەمجا بە ئارەزووی خۆیان ئینتیخاباتیان کرد و لەسەرەتای مانگی تشرینی یەکەمی (١٩٣٠)دا لە پارلەمان کۆبوونەوە و بە ئارەزووی سمێڵی خۆیان هەموو شتێکیان کرد...

ئۆباڵ بە ئەستۆی تەئریخ وە یا بە ئەستۆی ئەو کەسانانە کە ئەڵێن:

ئینگلیزەکان هەر وەخت ویستبێتیان فرمانێك لەگەڵ عەرەبەکاندا لە عێراقا بکەن و عەرەبەکان مل‌پێچیان کردبێت، کوردەکانیان بۆ ڕاست کردوونەتەوە بۆ ترساندنیان، کە ئیشی خۆیانیان جێ‌بەجێ کردووە ئەو وەختە بە چەقۆیەکی کول هاتوونەتە وێزەی کوردەکان!..

زۆر دوور نییە ئەمەش ڕاست بێ چونکە لە تاریخی ئینگلیزا بەرانبەر بە قەومەکانی‌تر هەموو وەخت ئەم جۆرە کردەوانەیان خستۆتە کار. ساڵی (١٩٤٣) گەرمەی شەڕی دووهەم بوو «بهاءالدین» نووری کرابوو بە موتەسەڕیفی سولەیمانی، لەبەر ئەوە کە ئەو وەختە وای پێویست ئەکرد، «بهاءالدین» نووری خەڵکی کۆ ئەکردەوە و ئەچوو لە «گردی سەیوان» داری ئەچەقان و فرمێسك بەچاویا ئەهاتە خوارەوە و ئەیوت: «ئەم دارە ئاخۆکەی ئەبێ بە داری ئاڵای سەربەخۆیی کورد!.». کە ئەو دەورەش بەسەرچوو دیسان کەوتنەوەی جەستەی کوردەکان!..

❁ ❁ ❁

ئەم کارەسات و کوشتاری ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلوولە لە هەموولایەکەوە دەنگی دایەوە؛ لە عێراقا لە خانەقیەوە تا زاخۆ. لە ئێراندا لە هەموو وڵاتی ئەردەڵان و موکریدا، لە بەغدا و وڵاتەکانی جنووبی عێراقا ڕازی هەموو دیواخانێك بوو، تەنانەت ڕەئیسی وزەرای وەخت تەعبیری کوشتاری سولەیمانی بەکارەساتی کەربەلا دابووەوە!. سەری گوریس گەیشتبووە دیواخانە سیاسییەکانی لەندەنیش.

ئەمانە لەلایەن باس‌کردنەوە، لەلایەن کاریگەریشەوە ئەوە سەرلەنوێ برینێکی هەرەگەورەی کاریگەری سەر دڵی هەموو کوردەکانی عێراق بوو؛ ئەوانەی کە لە وڵاتی «سولەیمانی» بوون وە یان لە وڵاتەکانی‌تر بوون، تەنانەت کاربەدەستە کوردەکانی حوکوومەت ئەوانیش بەم کارەساتە بەتەواوی دڵگران بووبوون.

❁ ❁ ❁

«شێخ مەحموود» تا ئەو ڕۆژە بە جۆرە بێ‌دەنگییەك لە «پیران» دانیشتبوو، بە بیستنی ئەم خەبەرە ئیتر توانای دانیشتن و گۆشەگیری نەما، کەوتە قسەکردن لەگەڵ سەرۆك عەشرەتەکانا و دەستی کرد بە لەشکر کۆکردنەوە، لە ماوەیەکی کەمدا لەشکرێکی زۆری لە دەور کۆبووەوە، بە نیازی تۆڵە وەرگرتنەوە و بە نیازی سەندنی سەربەخۆیی کورد لە خەتی پێنجوێنەوە ڕووبەڕووی عێراق بووەوە. هەتا ئەو نزیکتر ئەبووەوە لە وڵاتی سولەیمانی لەشکر و پشتیوانی زۆرتر ئەبوو. وڵاتی پێنجوێن و دەوروبەری پێنجوێنی داگیر کرد، بەرەبەرە لە ڕەوشەن فیکرەکانی کورد سەرلەنوێ چوونەوە بۆلای، پیاوی

خۆیشی هەر لەو ماوەیەدا گەیاندە «بەغدا» بۆ ئەوە کوردەکان و ئەو زابتە کوردانەی کە لە نەیرووی حوکوومەتی عێراقدان بچنە پاڵی لە ڕاستیدا لە ئەفسەرەکانی کورد «مەحموود جەودەت، حەمید جەودەت و کامل حەسەن» خێرا خۆیانیان پێ گەیاند و ئەمجارە بزووتنەوەی لەشکری شێخ مەحموود بە جۆرێ سەربازییەکی ڕێکوپێك ئەچوو بەڕێوە. ئەم ئەفسەرانە هێزێکی باش بوون بۆ لەشکرەکەی.

ئەمجا هێنای لە (١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٠)دا لەگەڵ ئەو کوردە زانایانە کە لەگەڵی بوون لە ژێر ناوی خۆیانا نامەیەکی‌تریان بۆ مەندووبی سامی بەغدا نووسی و داوای ئەم شتانەی خوارەوەیان کرد:

(لەو وەختەوە کە پاڕلەمان تێکدرا و پەیمانی ئینگلیزی ـ عێراقی هێنرایە ناوەوە بۆ پاڕلەمانی تازە، لە لایەن ئەم وەزارەتەوە کوردەکان هەستیان بەوە کردووە کە هەموو حەق و حقووقێکیان کرا بە ژێر لێوەوە و بە ئاشکرا ئەبینن لە پاش بڕیاردان لە سەر ئەم پەیمانە ئەکەونە ژێر چنگی عەرەبەکانەوە، ئەو عەرەبانە کە تەنها حوکم نەبێ هیچی‌تریان مەبەست نییە. ئەمەش هەم پێچەوانەی بڕیارەکانی کۆمەڵی ئەقوامە و هەم پێچەوانەی ئارەزووی کوردەکان..

لەبەر ئەمە کوردەکان هەموو لە خانەقی‌وە تا زاخۆ هەستان و بە یەك دەنگ داوای حقووقی خۆیانیان کرد، عەرەبە حوکمدارەکان وەڵامیان بە کوشتارەکەی سولەیمانی دانەوە کە لوولەی مەترەلۆزیان تێ ئەگرتن و وەکوو برێشکە هەڵیانیان ئەدایەوە بەسەر یەکدا. بەمەشەوە وازیان نەهێنا هێنایان هەموو ڕەوشەنفیکر و پیاوماقووڵی وڵاتەکەیان ـ ئەوانەی کە لە کوشتن ڕزگاریان بووبوو ـ گرتنیان و بە حەپس‌کردن و تەفروتووناکردن هەریەکەیان خستنە شوێنێك. لەبەر ئەمە کە کورد ئیتر لە توانایا نەما کە لەگەڵ عەرەبا پێکەوە بژیت. بێ‌گومان حوکوومەتی بەریتانیا لە ئێستە بەدواوە گوێ بۆ ئەم داخوازییانەمان ڕائەگرێ و براعەرەبەکانیشمان پێم وایە بەم شتانە دلگران نابن. داخوازییەکانیشمان ئەمانەن:

[١ـ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە زاخۆوە تا پشتی خانەقی، ئەم ناوچەیە بدرێ بە کورد و هیچ عەرەبی عەسکەری و مەدەنی تیدا نەمێنێ.

٢ـ ئەم ناوچەیە لە ژێر چاوێری بەریتانیادا بمێنێ تا کۆمەڵی ئەقوام بڕیارێکی بۆ دەرئەکا.

٣ـ بەرەڵا کردنی ئەو حەپس و دوورخراوانە کە لە کارەساتی سولەیمانیدا حەپس کراون و دوورخراونەتەوە.

٤ـ هەر ئەفسەر و کاربەدەستێکی کورد هەیە لە وڵاتی عەرەبستانا بنێرینەوە بۆوڵاتی کوردەواری.].

شێخ مەحموود ئەم نامەیە نارد بۆ مەندووبی سامی و هیچ وەڵامێکیشی لێ وەرنەگرتەوە. ئەمجا زانی مەسەلە وایە خۆی بینی پێوە ناو لەشکری کرد بە دوو قۆڵەوە، قۆڵێکی لە دەوروبەری پێنجوێن و قۆڵێکیشی بۆ وڵاتی «پشدەر». لەملاوە کە حوکوومەتیش زانی ئیش گەیشتە ئەم شوێنە ئەمیش کەوتە خۆی و لەشکری بە هەموو هێزێکەوە ڕوانە کرد، ئەمیش کردی بە دوو قۆڵەوە؛ بۆ پێنجوێن و بۆ سیوەیل و قۆڵی پشدەر. «شێخ مەحموود» خۆی لە قۆڵی پشدەربوو.

کە هەرا لە دەوروبەری پێنجوێن دەستی پێ کرد «جەمال عارف» کە ئەویش ئەفسەرێك بوو لە بەغدا بە پەلە خۆی گەیاندە لەشکرەکەی شێخ مەحموود لەگەڵ ئەفسەرەکانیتردا دەستیان کرد بە ئیش[1] ئەو هێزەی کە حوکوومەت ناردبووی بۆ دەوری

١. لە ڕێکوپێکی کاروبارا «جەمال عارف» ئەیوت:

لە پاش ئەوە کە من لە بەغدا بەڕێکەوتم و گەیشتمە سولەیمانی لەماڵی «عوسمان فایەق» کۆبووینەوە و لەوێ هەموو شتێك ئامادەکرابوو، زۆری نەخایان هاتن پێیان وتم ئۆتۆمۆبیل وەستاوە، هەستام و سواربووم ڕووەو خەتی هەڵەبجە. ئۆتۆمۆبیلەکە پڕ بوو کەسیانم نەناسی، کە گەیشتینە «سەی ساق» پیاوێك لە تەنیشتمەوە بوو پێ‌وتم لێرەدابەزە! زۆرم بەلاوە سەیربوو. کە دابەزیم وتی من لە لایەن شێخەوە نێراوم بە شوێن تودا و ڕێگەکەمان ئیتر ڕوو بە هەڵەبجە ناڕوا و ئەبێ لێرەوە بڕۆین.

هەروەها وتی لەو وەختانەدا کە ئەکەوتینە کۆڕی شەڕەوە ئێمە وەنەبێ نان و ئازۆخەیەکمان پێ بێ. لە هەر شوێنێ کە تەقە هەڵئەستا خێرا خەڵکی ئەو شوێنە ئەوەندەمان ئەزانی ئەکەوتنە خۆیان، ژنان ئەکەوتنە نان کردن و پیاوان ئەکەوتنە هێنانی، تا چاو ئەنرا بەیەکا هەموو شتێکمان بۆ ئامادە ئەکرا.

ئەیوت ئەم گیانی یارمەتیدانەی کە بەو جۆرە من لە وڵاتی کوردەواریدا چاوم پێ کەوتووە ناتوانم بڵێم لە هیچ لایەکیتر هەیە، چونکە ئامادەکردنی خواردەمەنی شەڕکەرەکان بەو جۆرە تەنانەت لەوانەبوو کە لەناو سەربازێکی ڕێکوپێکی حوکوومەتیشا نەبێت. وە ئەم نان و خوانەش کە بەو جۆرە ئامادە ئەکرا هەمووی بە گیانێکی خۆشویستن و بەرەزامەندییەکی تەواو ئەکرا، وەنەبێ بە هیچ چەشنێك لایەنی زۆر و ستەمی تیدا بووبێت، وە یا دڵێشانی کەسێکی تێدا ڕووی بدایە.

پێنجوێن لەگەڵ لەشکری شۆڕشگێڕ کەوتنە شەڕ و هەرجارە ترازوو بەلایەکا گران ئەبوو.

دەستەی قۆڵی سیوەیل کە لەژێر فەرماندەیی «بەکر سدقی» و «بهاءالدین» نووریدا بوو لە دەوروبەری دێ «بەیانان» لەسەر ڕووباری سیوەیل لەگەڵ ئەوەش کە سێ فەوجێك ئەبوون هەر شکستێکی پیسیان بەسەرهات.

ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە، کەوتبوونە ناوشیوەکەوە نەیانزانیبوو کە بەرودوایان لێ گیراوە، گوللە وەکوو بارانی بەهار بەسەریانا ئەباری و ئەوانیش وەکوو دانەی سەرساج بەملاو بەولادا ئەکەوتن. ئەوی کوژرا، کوژرا ئەوی نەکوژرا تا ناو دێی «چوارتا» خۆی نەگرتەوە، هێزی میللی شوێنیان کەوتن و لە چوارتاش هەندێ لە نوختەکانیان گرت. کە گەڕانەوە سەر تالآن لە فیشەك و تفەنگ و ولآغ و شتومەك ئەوەندە بەجێ مابوو لەشکری «شێخ مەحموود» نەیئەزانی چی هەڵبگرن. بە تایبەتی فیشەك و سەعات لە وزە دەرچوو بوو!. ئەم هەرایەش لە (١٩٣٠/١١/٣)دا بوو.

ئەو سەردەمە «ئەحمەد بەگی تەوفیق بەگ» موتەسەرِیفی سولەیمانی بوو، کە ئەم خەبەرەی بیست زۆر دڵگران بوو، دڵگرانییەکەشی بۆ هەر دوولابوو بەڵام هیچ نەئەکرا. وادیاربوو پیاوەکانی بەغدا ئەیانویست هەرا و ئاژاوە درێژە بکێشێ بۆیە هیچ بە تەنگ کوشتنی خەڵکەوە نەبوون!.

ئەمجا لێرەدا «بەکر سدقی». ناردیەلای «شێخ مەحموود» کە با لەمە زیاتر کوشتار ڕوونەدا شوێنێك و یەکێك دیاری بکا بۆ ئەوە قسە بکەین و ئێمە تێبگەین لە داخوازییەکانی ئەوان. شێخ مەحموود لە زابتەکانا «جەمال عارف»ی هەڵبژارد. جەمال

---

دیسان ئەیوت: لە بەغدادا کە «زابتە»کان کۆئەبووینەوە و قسەمان لە کاروباری کوردەوارییەوە ئەکرد و ڕێگە و شوێنمان دائەنا، شوێنی ئەم کۆبوونەوە و قسەکردنانەمان بە درێژایی ئەوسالآنە، یەکەم لە دووکانەکەی «وەستا بەشیر موشیری خەیات» بوو. دووهەم لە دووکانی «رەئووف دەلاك»، تەنانەت لە گەلێ وەختا وەستا بەشیر بیروباوەڕی خۆیشی دەرئەبڕی، لەم ڕووەوە و بۆ ئەم جۆرە خزمەتانە ئەم دوو کەسە خزمەتێکی گەورەیان پێ کردین، نەوەك هەر بە ئێمە بەڵکوو بە هەموو بیروباوەڕێکی کوردایەتی.

هەروەها لە مووسڵیش دووکانەکەی «نووری خەیات» شوێنی قۆمیتەمان بوو، بەڵکوو گەلێ جار کە ئێمە تەنگوچەڵەمەیەکمان ئەهاتە ڕێ هەر ئەوەندەمان ئاگا لێ بوو «نووری» هەموو ئیشێکی ساز کردووە و ئەهات دەربازی ئەکردین و کەسیش پێی نەئەزانی. نووریش لە «مووسڵ» لەم ڕووەوە خزمەتێکی گەورەی پێ کردین.

لەگەڵ «حەمە بانەیی» و «عەزە بانەیی» هاتن و هەموو دەستووراتێکی دایە کەچی بڵێ و چی نەڵێ.

جەمال لە ١٩٣٠/١١/١٠ لەبەری «کەناروێ»وە هات و لەم بەر ئاوی «سیوەیل»ەوە «بەکر» چاوەڕێ ئەکرد. یەکیان گرت، «بهاءالدین نوری» و نووری حەداد مودیری پۆلیسی سولەیمانیشی لەگەڵ بوو. جەمال وتی: بەکر سدقی لەبەر ئەوە کە منیش ئەفسەر بووم لە نەیرووی عێراقا ئەیناسیم. یەکەمجار ڕووی تێکردم وتی:

«دەست لەم زۆر و ستەمانە بۆچ هەڵناگرن و بۆچ ئاژاوە ئەنێنەوە و ئەچن بەگژ حوکومەتا؟!.». وتی منیش وتم: «ئایا ئێمە ئەمە جەورە ئەیکەین لە ماڵی خۆمانا دانیشتووین و داوای حەقی خۆمان ئەکەین؟. یا ئەوە زوڵمە کە ئێوە هاتوون و لە خاکی خۆمانا دەرمانی ئەپەڕێنن؟!. لەم شاخ و داخەدا کە مڵکی کوردە ئێمە بەسەر ئێوەدا هاتووین، یا ئێوە بەسەر ئێمەدا هاتوون؟!.» وتی بەکر بێدەنگ بوو وابزانم دەماری کوردایەتی لە مێشکیا بزووتەوە بۆیە هەستم کرد تنۆکێ فرمێسك بەرچاوەکانی گرت!. وتی پاش ئەمانە کەوتینە قسەکردن و وتی: شێخ چی ئەوێ؟. وتم: شێخ فەرموویەتی داوای ئەم شتانە بکەم:

(١ـ تۆڵەی ئەوکەسانە بدرێ کەبوون بە هۆی کوشتاری ڕۆژی [٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠] ناوشاری سولەیمانی، وە خوێنی کوژراوەکان بدرێ بە خێزانەکانیان.

٢ـ بەرەڵاکردنی ئەو حەپسانە کە لە کارەساتی (٦)ی ئەیلوولدا گیراون و حەپس کراون، وە گێڕانەوەی ئەوانە کە بە هۆی ئەو کارەساتەوە گیراون و دوورخراونەتەوە لەشاری «سولەیمانی».

٣ـ دەرچوونی هێزی حوکومەت لە سولەیمانی بێجگە لەو کاربەدەستانە کە ئیش هەڵ ئەسووڕێنن.

٤ـ مانەوەی هێزی شێخ مەحموود لە وڵاتەکانی پێنجوێن، شارباژێر و سیوەیل تا هەیئەتی کۆمەڵی ئەقوام دێت و بڕیار لەسەر شتێك ئەدات.

٥ـ شێخ مەحموود لە وڵاتی خۆی و بە موڵکی خۆی بژیت و ئیتر لە ئێران نەمێنێتەوە.). داخوازەکان ئەمانەن. وتی ماوەی «دە» ڕۆژیشمان دانا بۆ وەستانی شەڕ تا ئەم قسەیە

ئەگەیەنرێ بە «مەجلسی وزەرا» لە بەغدا و وەڵامەکەی دێتەوە.

وتی لە هەمووشت بووینەوە «بهاءالدین نوری» ڕووی تێ کردم وتی: «ئەگەر بوون بە دەوڵەتێکی کورد شوێنی دەرچوونی دەلیاییتان لە کوێ ئەبێ؟!.» وتی وتم: «ئەگەر گەیشتینە ئەو پایەیە ئەچین لە حوکوومەتی ئیسویچەرە ئەپرسین بزانین ئەوان شوێنی دەرچوونی دەلیاییان لە کوێیە بە ئێمەشی پیشان بدەن!.» دیسان وتی پێم وت: «لەم داخوازییانە کە ئێمە کردمان تۆ هیچ بۆنێکی جیابوونەوت کرد و وا ئەڵێت؟.» وتی ئیتر بێدەنگ بوو و هەرلایەك گەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان.

جەمال وتی ئەوا لەسەر ئەو پەیمانە شەڕ لە هەر دوولا وەستێنرا، هێزی شێخ کە لە «باسنێ و ڕەشەکانی» بوو گەڕایەوە بۆ «هەڵەدن»[1].

کەچی لەپاش دوو شەو شتێکی سەیر ڕێکەوت! وتی: دەستەی شێخ سەلام و شێخ موحەممەدە بچکۆلە ـ ئەوان کە لە قۆڵی پێنجوێن بوون ـ هاتن بۆلای لەشکرەکەی ئێمە کە یەك بگرین. کە بەشەو دێن دنیا تاریك ئەبێ، بەسراوردی نیروەکەی [بەکر سدقی]دا دێن، لەو نیروەش فەرماندراوە کە بەشەو ئاگرنەسووتێ، نەسووتانی ئاگریش لەبەر ترسی شەڕ نییە چونکە شەڕ لەسەر پەیمان وەستێنراوە، بەڵکوو لەسەر باوەڕی عەسکەری بۆ ئەوەیە کە دوژمن بە هۆی ئاگرەوە ئەندازەی هێزی ئەوانی بۆ دەرنەکەوێ.

کوتوپڕ لەو وەختەدا کابرای موفەتیشی ئینگلیزی، فانووسێکی بۆ هەڵئەگرن و ئەچێ بۆ سەر ئاودەست. دەستەی [شێخ موحەممەد] کە کوتوپڕ چاویان بە ئاگری فانووسەکە ئەکەوێ، وەبێ ئاگاش ئەبن لەو کەین‌وبەینەی بەینی ئێمە و ئەوان کە شەڕ وەستێنراوە، وا تێ ئەگەن ئەمە ئیشارەیە بۆ شەڕ، چەند تەقەیەکیان بەسەردا ئەکەن!. لەشکرەکە ئەشڵەژێ و لەوانە ئەبێ ببێ بە شەبەیخوون.

لە بەیانیدا «بەکر» لۆمەی نارد کە بۆچی ئیشی وابووە؟. لە ئاخردا بۆی دەرکەوت

---

١. لەم سەردەمەدا ئەفسەرێکی گەورەی نەیرووی ئێران کە ناوی «ئەسعەد» و خەڵکی «سنە» بوو خۆی گۆڕیبوو هاتبوو بۆ «پیران» بۆ لای شێخ مەحموود، شێخ لەوێ نەمابوو چاوی بە «ئایشەخان» کەوت و لەوێوە هات بۆ «هەڵەدن» شێخی چاوپێکەوت و ڕاستی خۆیشی پێوت، ئەمجا وتی بۆ ئەوە هاتووم بزانم دەنگوباسی ئێوە چییە بۆ ئەوە ئێمەش لە قۆڵی «سنە»وە شۆڕش بنێنەوە و هەردوولامان بگەینە یەك!. [شێخ مەحموود] ئەم قسەیە بەلاوە ڕاست نەبوو لەبەر ئەوە کابرا وەکوو خۆی گەڕایەوە.

کـە ئەمـە هەڵـە بووە و لە دەسەنقەسـی وا نەکراوە وە بڕواشـی کـرد، بەڵام لە پێش ئەمەدا کـە ئەمـەی بـۆ دەرکەوێ ئەم خەبەرە گەیشتەوە بەغدا و حوکوومەت ئەمەی بەشتێکی خراپ بڵاو کردەوە!.

ماوەی شـەڕ نەکـردن بڕایـەوە و [مەجلسـی وزەرا] لـە باتـی ئـەوە ئیشـێکی وا بـکا، کە ئەمـن و ئاسایش لـەو، وڵاتـەدا بـڵاو بکاتەوە گوێـی بە هیـچ یەك لـەو داخوازییانە نەدا و بەڵکوو وتی ئەبێ هەر بە زۆر و بە هێزی عەسکەر شێخ مەحموودی بخرێتە دەست.

ئەم فەرمان و باوەڕی مەجلسی وزەرایە غەیری ئەوە نەبێ کە پیاوەکانی حوکوومەت دڵیان بە وڵات نەئەسووتا و بۆ قازانجی شەخسی خۆیان و بۆ پاراستنی جێگە و پایەکەیان دائما کۆششـی هەرەگـەورەیان ئەوەبوو کـە ئاژاوە لە وڵاتـدا پەیدا ببـێ و خوێنی ناهەق بڕێـژرێ هیچی‌تـر نەبـوو. ئەمەبوو ویژدانی پیاوە حوکمدارەکانی پێشـووی عێراق بەرانبەر بە شەعب و بە میللەت.

کە شـێخ مەحموود زانی کۆششـی هێمنی کەڵکێك ناگرێ لە ئیشـی خۆی هەڵچووەوە و هـەتا ئەهـات خەڵکیـش زیاتـر لە دەوری کۆ ئەبوونەوە، بەڵێ لەو ناوەدا کوشـتار ڕووی ئەدا چە لە دەستەی ئەو و چە لە دەستەی حوکوومەت بەڵام ناچار بوو بەم بزووتنەوەیە. هێـزی حوکوومەتیـش کەزانـی ئیشـی بـۆ ناچێتـە پێشـەوە و دنیاش بوو بە زسـتان و وڵات بەفر دایگرت گەڕانەوەی بە قازانجتر زانی تا درێژەدان بەشەڕ.

[جەمال عارف] وتی: هەر لەو سەردەمانەدا کە هێزی شێخ مەحموود بە شاخەکانی «پوشـێن» و ئەوناوەدا بڵاوبووبووەوە، شـێخ خوێ و (٢٧) سـوار لە «یاڵان‌پێ» بوو ڕۆژی پێنجشـەنبە بـوو شـێخ فەرمانـی دا بچیـن بـۆ «باخەکۆن» بۆ ئـەوە سـبەینێ نوێژی جمعە لـەوێ بکەیـن. سوارەکانیش عیبـارەت بـوون لـە باقـی نووری بـەگ و کاملـی حەسـەن ئەفەندی و ئەوانە. سەرەوخوار بووینەوە بەلابەلای «خورماڵ»دا بۆ «باخەکۆن».

کوتوپـڕ زەلامێـك لـە ئاوایـی «خورمـاڵ» بـە دەستەسـرێکی سـپیەوە بەدەرکـەوت و دەستەسڕەکەی ڕاوەشاند. وتی ئێمەش لاربووینەوە بەسەر خورماڵا و خورماڵ گیرا.

مەسـەلەش عیبارەت بوو لەوە کە لەو سـەردەمەدا «سـەعید ئەفەنی» لەوێ مودیری ناحیـە بـوو، کـە چاویان بە سوارەکانی ئێمە ئەکـەوێ لای وا ئەبێ هێزێکـی زۆریـن و بۆ

گرتنی «خورماڵ» ڕۆیشتووین. فەرمان ئەدا ئەو زەلامە بە دەستەسڕە سپیەکەوە بێتە دەرەوە و ئیشارەی «تەسلیم» بدات.

وتی بەهێزی پۆلیس و گومریکەوە (٣٤) تفەنگ و (٧) سندۆق فیشەك هەبوو ئەوەیان داینێ. بەم جۆرە خورماڵیش گیرا.

لەشکری شێخ لەو ناوەدا بە هەموو جۆرە ئەگەڕان کە تۆڵەی دەورەکانی ڕابردوو وەربگرنەوە. لێرەدا حوکوومەت ڕێگەیەکی تری گرتە پێش؛ ئەو ڕێگەیە گرتە پێش کە بێنێ بە پارە و بە زمانی لووس عەشایر و کوردەکان لە شێخ مەحموود هەڵخرێنێ. زانی بە شەڕی تۆپ و تەیارە هیچی بۆ ناکرێ کەواتە با پەلاماری ئەم جۆرە فڕوفێڵانە بدا!. لە ڕاستیدا لە ئەنجامدا گرتنی ئەم ڕێگەیە بوو بە هۆی سەرکەوتنی و لەناوبردنی شێخ مەحموود!..

❋ ❋ ❋

شێخ مەحموود لە گەڕانی شاخەکانا فیکری هاتە سەر ئەوە کە بچێت لە دەوروبەری کەرکووك کارەساتێك بنێتەوە بەڵکوو بە هۆی نانەوەی ئەم کارەساتەوە هێزەکانی حوکوومەت لە یەك دابڕێ، لەمەوە ئەتوانی «کەرکووك» بگرێ، کەرکووکی گرت هێزی حکوومەتی وڵاتەکانی ئەم لای «کەرکووك» لەبەر ئەوە بێ‌پشتیوان ئەمێنێتەوە ئیتر گرتنیان شتێکی ئاسان ئەبێ.

لەسەر ئەم نیازە لە ئاخر و ئۆخری شوباتی (١٩٣١)دا ڕوو بەوڵاتی کەرکووك بەرێ‌کەوت تا گەیشتە «ئاوباریك». بێ‌خەبەر لەوە کە هەندێ لە عەشایرە کوردەکانی ئەو دەورە لەگەڵ حوکوومەتا ڕێك‌کەوتوون بۆ لەناوبردنی شێخ مەحموود؛ ئەو هەندە عەشایرانە کە ئەم هیوای هەرەزۆری لەو وڵاتەدا بەوان بووا!..

هەر ئەوەندە ئەزانێ دەورەی ئەگیرێ؛ دەورەی ئەگیرێ بە فەوجێك عەسکەری چەکدار بە هەموو جۆرە تۆپ و جبەخانەیەك، بە حەوسەد پۆلیس، بە هێزی فڕۆکە لە سەرەوە، بە هێزی ئەو هەندە عەشایرە خائینانەی ئەو ناوە!. ئەمیش تەنها پەنجا سواری لەگەڵە، کە هەندێك لەمانە «داود بەگی فەتاح بەگی جاف» و «حەمەمین بەگی کەریم بەگ» بوون بە (٢٧) سوارەوە. حەمەمین بەگ شەڕی ئاوباریکی کردووە بە ڕۆمانێکی

شعری زۆر جوان. ئەبێ ئەوەش بزانرێ کە عەشرەتی جاف تا ئاخر هەناسە لەگەڵ «شێخ مەحموود» بوون.

کارەسات و شەڕی «ئاوباریك»ی شێخ مەحموود یەکێکە لە کارەساتە هەرە زلەکانی ژیانە پان و فراوانەکەی شێخ مەحموود، چونکە لەشکرێکی وا کەم بەرانبەر بە هێزێکی وا زۆر زەبەندە بە هەموو چەکێکەوە لە حاڵێکا کە ئەمان بێ‌ئاگا لە هەموو شتێك و خەریکی حەسانەوەی نان‌خواردن بوون کوتوپڕ بارانی گوللە دەستی کرد بە بارین! چەند سەعاتێك شەڕ درێژەی کێشا، هیچ دڵێك ئەوەی نەئەخوێندەوە کە شێخ مەحموود و لەشکری شێخ مەحموود لەو ئابڵۆقەدانەدا ڕزگاریان ئەبێ. کەچی بە پێچەوانەی ئەوە بە جۆرێکی زۆر مەردانە وە لە پاش زیان‌خستنێکی زۆر لە هێزی حوکوومەت دەربازبوون و هێزی حوکوومەتیش لەو ناوەدا بە پەرت‌وبڵاوی و سەروگوێلاك شکاوی مانەوە. تەنها کارەساتی «ئاوباریك» خۆی داستانێکی سەربەخۆیە بۆ خۆی لەم کتێبەدا جێگەی نابێتەوە.

[شێخ مەحموود] گەڕایەوە بۆ وڵاتە شاخاویەکانی سولەیمانی بەڵام لەدڵا زۆر دڵگرانە لەوە کە ساڵەهای ساڵە بۆ سەربەخۆیی کورد و بۆ ڕزگاربوونی کورد لە دیلی، ئەم هەموو کۆششەی کردووە کەچی ئێستە وا بەو جۆرە هەندێ لە کوردەکان تفەنگ ئەنێن بە ڕوویەوە و بەو جۆرە تۆڵەی خەباتی چەند ساڵەی ئەدەنەوە!.

ئەمە کارێکی زۆری کردە سەر نەفسیەتی شێخ مەحموود، فیکری ئەوەی کردەوە کە تا ئێستە ئەو بۆ سەرفرازی کورد تفەنگی ئەنا بە دوژمنی کوردەوە، ئێستە ئیش وای لێ هات کە تفەنگ بە کوردەوە بنێ!. کە واتە لەم تاریخە بە دواوە پێویست نەما بەو جەنگە کە ئەم چەند ساڵە کردوویەتی!.

هێنای لە (١٣ی مارسی ١٩٣١)دا خۆی تەسلیم کرد بە حوکوومەت و بە دوور خراوەیی هێنرایە «سەماوە»، پاشان بۆ «ناصریە» و ماوەیەك بۆ «عانە» و لە (١٩٣٣)دا هێنرایە بەغدا و لەوێ خانەشاری کرا. لەولاشەوە موڵکەکانی سەرلەنوێ زەوت کرانەوە.

بەم جۆرە بە دەست بەسەری و خانەشاری لەبەغدا مایەوە تا لە مارسی (١٩٤١)دا هەرای «ڕەشید عالی» لە بەغدا دەستی پێ کرد. هەلی بەباش زانی هەر لە عەینی ئەو

مانگەدا بە بێدەنگ لە بەغدا ڕوو بە وڵاتی «باقوبە» چووە دەرەوە، لەولاوە لە لایەن «فەقێ حسەین و عەزیز مەحموود» کە لە دۆستە دڵسۆزەکانی بوون، وڵاغی بۆ هێنرا و لە ڕێگەی «سەنگاوە»وە ڕوو بە وڵاتی «داریکەلی» بوونەوە.

لەوێدا دیسانەوە کەوتەوە سەر ئەو باوەڕە کە وڵاتی کوردەواری ئەبێ ئازاد بێ و سەربەخۆیی وەربگرێ. لەسەر ئەم نیازە و بۆ ئەم مەبەستە «داریکەلی» بووەوە بە شوێنی کۆنگرە و کوانووی سیاسەت، کوردەکان لە دەوری کۆبوونەوە. ئەم ناو و ئاوازەیە گەیشتەوە بەغدا. وەزارەت، وەزارەتی «جەمیل میدفەعی» بوو، بەم باسە زۆر گرژبوو تەنانەت فەرمووی: «سەربەخۆیی کوردستان لە قامووسا نەماوە، ئەم قسەیە بووە بە ئەفسانەی کۆن!.».

پاشان ڕەئیسی ئەرکانی جەیش «ئەمین عەمری» نارد بۆ ئەوە قسە لەگەڵ شێخ مەحموود بکاو لەو فیکرانە بازگەشتی بکاتەوە، چوونی ئەمین عەمری هیچ کەڵکێکی نەگرت. پاش ئەو موتەسەڕیفی سولەیمانی «شێخ مستەفای قەرەداغی» چوو بۆلای، دیسان کەڵکی نەگرت و هەر لەسەر فیکری خۆی زیاتر قایم بوو.

ئەمجا حوکوومەت هێزە لێشاوەکەی خۆی نارد و لە [١٤ای تەمووزی ١٩٤١]دا حوکمی عورفیشی لە وڵاتی «سولەیمانی» بڵاو کردەوە بۆ ئەوە کە ئیتر کەسی‌تر نەداتە پاڵ شێخ مەحموود. بەڵام شێخ مەحموود هەر وازی لە فیکری خۆی نەهێنا، حوکوومەتی وەخت بۆی دەرکەوتبوو ئەمجارە ئەگەر شێخ مەحموود هەستێتەوە کاروباری سیاسی عالەمی وای پیشان‌ئەدا کە سەر ئەکەوێ، لەگەڵ ئەوەش کە هێزی ناردبوو ئیعلانی عورفیشی بڵاو کردبووەوە هەر بۆ ڕێکەوتن پێ لێ نەئەبڕی.

لە ئەنجامدا شێخ مەحموود کە فیکری دەورەکانی پێشووی و دەوری «داریکەلی» کردەوە، ئەوەی هاتەوە فیکر کە ئەبێ دیسان گوللە بە کوردەوە بنێ، ئەمەش پێچەوانەی مەبەستەکەی ئەوە. بەم بۆنەوە وازی لە فیکرەکەی هێنا و لە ئەوەڵی ئابی (١٩٤١)دا بڕیاری ڕێکەوتن و وازهێنانی دەربڕی و بۆ متمانە «شێخ لەتیف»ی کوڕیشی نارده بەغدا. حوکوومەت ئەم وازهێنانەی شێخ مەحموودی بە جەژن و بەسەرکەوتنێکی زۆر گەورە زانی.

شێخ مەحموود بەم جۆرە بە گۆشەگیری و بە فڕێدانی سیاسەت پەردەکانی ڕۆژگاری

هەڵئەگێڕایەوە؛ ئەو شێخ مەحموودە بە جەرگە نەترسە کە لە ڕۆژەکانی دیلی زەمانی پێشوویدا بە دیلیەتی ئەبرێتە بەردەمی «مەلیك فەیسەلی یەکەم] لە بەغدا. پێی ئەڵێ: «مەحموود!. ئەم زوڵم و ستەمە چی بوو کە تۆ لە ڕووی منا دەستت کرد بە شۆڕش گێڕان و بە ئاژاوە نانەوە؟.» ئەویش پێ ئەڵێ:

«فەیسەل!. هەندێ کەس کافر ئەباتەماڵی کەعبە و خوێنی موسوڵمانان لەوێدا ئەرێژێ و ماڵی خوا ئەدا بە کافر، ئەوە بە زوڵم نازانی. ئەگەر من لەناو خاك و ئاوی خۆمدا و لە وڵاتی خۆمدا داوای حەقی خوراوی خۆم بکەم ئەمە بە زوڵم ئەزانی!. دە، تف لە چارەت گەردوون!!..».

جا ئەم شێخ مەحموودە نەترسەی ژیان پڕ لە چەوسانەوەیە بەو گۆشەگیرییە مایەوە تا لە ساڵی (١٩٥٦)دا بە نەخۆشی هاتە بەغدا و لە خەستەخانەی «حەیدەریە» لە شەوی «١٩٥٦/١٠/٩»دا کۆچی دوایی کرد و دنیای پڕمەینەت و دەردیسەری بەجێ هێشت و بەداخی سەربەخۆیی کوردەوە سەری نایەوە و تەرمەکەی برایەوە بۆ «سولەیمانی».

✹ ✹ ✹

بۆ ئەوە ڕۆژانی پاشەڕۆژ چاوێك بە مێژووی ڕۆژانی ڕابردووی خۆیا بگێڕێت باسێکی ماڵاوایی شێخ مەحموود لەم دنیایە پێویستە بکرێ بۆ ئەوە بزانرێ کە «شێخ مەحموود» لە بێشکەی دارەوە تا بێشکەی خاك هەموو لاپەڕەیەکی ژیانی و کاتی نەمانی هەر ئاژاوە و شۆڕشی لەسەر نووسراوە:

لە شەوی ١٩٥٦/١٠/٩ شێخ مەحموود کۆچی دوایی کرد، ئێستگەی بێ‌تەلی عێراق لە بەیانیا ئەم ماتەمەی بڵاو کردەوە، عالەم لە کورد و لە عەرەب، لە گەورە و لە بچووك بەیانی زوو لە خەستەخانەی «حەیدەریە» کۆبوونەوە. لە سەعات «نۆ و نیوی» تەواو تەرمەکەی ڕووبەڕووی شاری سولەیمانی لە بەغدا هەڵگیرا، هەتا چاوکاری ئەکرد تا «بەغداد الجدیدە» لە لایەن پیاوانی بەغداوە بەڕێ کرا، ئەوان گەڕانەوە و چەند ئۆتۆمۆبیلێك ڕووبەڕووی سولەیمانی بووەوە. ـ نووسەری ئەم کتێبەش یەکێك بوو لەو کەسانە کە لەگەڵ تەرمەکەدا ڕۆیشت ـ

بەرە بەرە پێشوازیکەر لە وڵاتی کوردەوارییەوە ئەگەیشتن بە تەرم، لەم ڕێگەیەدا

لە هەر لایەك لە پێش گەیشتنی تەرمەکەدا ئەهلی ئەو وڵاتە ئەهاتنە سەر ڕێگەکە و ماتەمی خۆیانیان بۆ نەمانی پێشەوایەکی کورد دەرئەبڕی. لە «توزخورماتو» قائمقام «بورهان جاف» واجباتێکی ئینسانی و قەومی بەرانبەر بە پێشوازیکردنی تەرم و عالەم بە جێ‌هێنا، لە کەرکووك ئەهلی ناوشار ئەم‌لاو ئەولای شەقامەکانیان گرت و بە چاوی پڕ لە گریانەوە سەری کڕنۆشیان بۆ تەرمی پێشەوای کورد دانەواند. موتەسەڕیفی کەرکووك تا «قەرەهەنجیر» تەرمی بەڕێ‌کرد. خەڵکیش هەتا ئەهات هەر زیادی ئەکرد.

سەعات حەوتی پاش نیوەڕۆ لەناو نزیکەی (٥٠٠) ئۆتۆمۆبیلی پێشوازی کەرا تەرمی «شێخ مەحموود»ی پێشەوا گەیشتە سولەیمانی، بەڵام چە سولەیمانیەك؛ ئەو سولەیمانیە کە ژن و پیاو و گەورە و بچووکی بە شین و شەپۆڕ و گریان جادەکانیان گرتووە و چاوەڕێ ئەو پێشەوایەیان ئەکەن کە زیاتر لە حەفتا ساڵ بۆ کورد لە جەنگایە. ئەو سولەیمانییە کە لە هەموو وڵاتەکانی هەولێر و ڕواندز و کۆیە و ڕانیە و هەڵەبجە و پێنجوێنەوە داباریون بەسەر تەرمی شێخی جەنگاوەریاندا.

موتەسەڕیفی سولەیمانی (عومەر عەلی بوو) لە بەغدا بوو، وەکیلی موتەسەڕیفی «فوزی سائب» بوو. فوزی و بەرەی ماڵی شێخان و پیاوماقووڵی سولەیمانی و هەموو کاربەدەستانی دائیرەکان لە مزگەوتی گەورە کۆبوونەتەوە چاوەڕێ گەیشتنی تەرم ئەکەن. دنیا تاریك بووە و دەرزی هەڵخەی لەبەر عالەم ناکەوێتە زەوی. «شێخ لەتیف»ی کوڕی «شێخ مەحموود» لەو دەورەدا حەپس کرابوو لەبەندی‌خانەبوو.

«ڕەفیق حلمی» و «دوکتۆر ئیبراهیم حامی»م لەگەڵ بوون ـ کە ئەوانیش لەگەڵ تەرمەکەدا لە بەغداوە هاتبوون ـ بە شوێن تەرمەکەدا ئەسووڕاینەوە، چونکە لەبەر زۆری مەردم تەرمەکەمان لێ ون بووبوو، لە هەرکەسمان ئەپرسی ئەیوت نازانین، چووین بۆ مزگەوتی گەورە نەبوو، بۆ ماڵی «بابە عەلی» نەبوو. گەڕاینەوە بۆ بەر دەرکی سەرا. لەو کاتەدا تەقەی شێلیکی تفەنگ لەلای بەندیخانەکەوە پەیدا بوو، تومەس ئەمە تەرمەکە براوە بۆ ئەوێ کە شێخ لەتیفی کوڕی چاوی پێ بکەوێ، لەبەر خەڵك زۆریش کەسی شوێنەکانی‌تر بەمە نازانن، خزمان و پیاوانی‌تر لە مزگەوتی گەورە چاوەڕێ ئەوەن کە تەرم بچێ بۆ ئەوێ، کەچی ئەم کارەساتە قەوما.!

شێلیکی تفەنگ هەتا ئەهات زیادی ئەکرد، تەقە لە هەموو لایەکەوە پەیدا بوو، شار تێکچوو، ئێمە هەر یەکە چووین بۆ شوێنی خۆمان، من چوومەماڵی «فایەق هۆشیار». لەو کاتەدا کە من و هاوڕێکانم هەرکە چووینە شوێنی خۆمان دیسان لەبەر دەرکی سەرا و سەرادا بوو بەهەرا، پۆلیس چووبوونە ژووری سەراکە و لەوێوە دەستیان کردبوو بە تەقە لە خەڵکەکە. لەو لاشەوە کە تەقە پەیدا ئەبێ وەکیلی موتەسەڕیف و دانیشتوانی مزگەوتی گەورە ئاگاداری ئەم ئیشە نابن، وەکیل هەڵئەستێ ئەچێ بە شوێن تەقەوە، ئەچێ بۆ سەرا ڕێگە نییە بچێتە ژوورەوە هەرچەندە هاوار ئەکا من وەکیلی موتەسەڕیفم پۆلیس دەرگای لێ ناکاتەوە، ناچار لە پشتەوە بەهۆی چوونە سەرشانی یەك دووکەس لە خەڵکی شارەکە ئەچێتە ناو «سەرا» و تفەنگ لە [پۆلیس] وەرئەگرێتەوە، لەسەر ئەمە تووڕە ئەبێ کە ئایا کێ ئەمری داوە بە پۆلیس بۆ تەقەکردن؟!.

لەوێوە ئەچێ بۆ بەردەرکی حەپسخانە و خۆی تێکلاوی خەڵکەکە ئەکا و تووشی تەرمەکە ئەبێ بەهەر جۆرە زمانێك بێت تەرم ئەگێڕێتەوە ڕووبەڕووی مزگەوتی گەورە.

ئەمان لێرەدا وا، لەولاوە لەو وەختەدا کە من چووم بۆ ماڵی فایق مودیری حەپسخانە خەریکی تەلەفۆنکردن بوو لەگەڵ فایەق و هاوار و دادی ئەوەی بوو کە ئێستە ئەو عالەمە حەپسخانە ئەشکێنن و منیش هیچ هێزێکم لەلا نییە و چارێك بکەن، مودیری حەپسخانە لەمە زۆر ترسابوو، لە ڕاستیشدا چەند پۆلیسێکی کەم نەبێ هیچیتری لانەبوو، ئەو تەقانەش کە لەو دەورە هەبوو هی ئەوان نەبوو بەڵکوو هی پۆلیسەکانی سەرابوو.

کە ئەو لە تەلەفۆن بووەوە فوزی تەلەفۆنی کرد بۆ ئەوە بەڵکوو بچن بە هەموو لایەکەوە ئیشێکی وابکەن ئەم تەرمە ڕزگار کەن و بینێژن، فایەق پێی وت لەم قیامەت و هەرایەدا کەس خەتی ئێمە ناخوێنێتەوە، ئەوا فڵان هاتووە بەڵکوو ئەو ئیشێك بکا، لە بیستنی چوونەکەی من وەکوو بڵێیت گەشکەیەك گرتنی. فایەق بە پەلە تەلەفۆنی دانا و هات بۆلای من وتی فلانی ڕۆژێکە و هەر ئەمڕۆ کەیفتە بزانم چی ئەکەی؟. وتم لەم قیامەتەدا کی چی پێ ئەکرێ؟. وتی کەیفتە. ناچار پیاوێکم لەگەڵ خۆم هەڵگرت و لە ماڵ دەرچووم، ناشزانم بۆ کوێ ئەچم چونکە نازانم تەرمەکە لە کوێیە. بەبێ فیکر ڕووم کردە «مزگەوتی گەورە». ئەوا لە هەموو کۆڵانەکانیشەوە گوللەبارانە. کە گەیشتمە بەر ماڵی «ڕەشۆل»،

«ئەختەر»ی ژنی ڕەشۆل - کەچوو بوو لەگەڵ تەرمەکەدا بۆ حەپسخانە و گوللەی بەرکەوتبوو - هێنابوویانەوە بۆ ماڵەوە، لەو کاتەدا گیانی دەرچوو بوو بە شین و شەپۆڕا!..

کەچوومە مزگەوتی گەورە و پرسیم بۆ تەرم سەیرم کرد هێناویانەتەوە، لێرەدا تۆزێ حەسامەوە بەڵام مزگەوتی گەورەی چی؟ لەبەر خەڵك ڕێگەی ڕێدار نییە. لەبەر ئەوە کە «فایەق» و ئەوان پێیان وتبووم بەڵکوو ئیشێکی وا بکرێ تەرمەکە بنێژرێ، کەوتمە مشووری ئەوە، ئەوەندە هەبوو لەو کاتەدا نە [بابە عەلی]م دەست ئەکەوێ، نە [شێخ قادر]ی برای شێخ مەحموود. بە هەر جۆر بوو شێخ قادرم دۆزییەوە و پێم وت، شێخ قادر ڕازی نەئەبوو بە ناشتنی تەرم بەو شەوە، ئەو و چەند کەسێکی تر لە خزمەکانی ئەیانوت لە سولەیمانی نەبووە بە ڕەوشت کە بە شەو تەرم بنێژرێت. بیانووی منیش ئەوە بوو ئەم تەرمە جارێ هەر لە مزگەوتی گەورە ئەنێژرێ، دووهەم ئەگەر بکەوێتە بەیانی هەرایەکی خراپتر ئەقەومێ و ئەمە بۆ ئێوە و ئەهلی شارەکە هەمووی زیانی هەیە. لەو وەختەدا [بابە عەلی]ش هات و بە هەر جۆر بوو ڕازی بوون بە ناشتنی تەرم، بەڵام چۆن بنێژرێ. جارێ نەشۆراوە، پاش ئەوەش جەنازەکە لە ژووری مەرقەدەکەدایە بهێنرێتە دەرەوە بۆ شۆردن خەڵکەکە ئەیفڕێننەوە!. لێرەدا دیژواری زۆرتر بووا!..

قسەیان هاتە سەر ئەوە کە جاڕ بدەن بەناو خەڵکەکەدا ئەم [جەنازە]یە بەیانی ئەنێژرێ و هەرکە بچێتەوە ماڵی خۆی. بەمە تۆزێ خەڵکەکە سووك بووەوە، پاشان وتم هەر دوو قاپی حەوشەکە داخەن. لەگەڵ ئەمانەشدا هەر زاتی ئەوە نەبوو کە جەنازەکە بۆ شۆردن لە ژووری مەرقەدەکە بهێنرێتەوە دەرەوە، لە دەرەوە بەسەتڵ ئاو ئەبرایە ژووری مەرقەد و بەو جۆرە شۆردیان. پاشان نوێژی لەسەرکرا و نێژرا. تا ئەمانە کرا سەعات بوو بە یازدەی شەوێ خەڵك بەتەواوی ئیتر بڵاوەی لێ کرد.

لە هەرای ئەو شەوەدا (٢) کەس کوژرا؛ ژنەکەی ڕەشۆل و فەقێیەك. بریندار، کە برایە خەستەخانە (١٣) کەس بوو کە ئەمانە هیچ هۆشیان نەبوو. بەڵام ئەو شەوە بە جۆرێکی تێکڕایی کە لە پاشان من وەرم گرت بریندار گەیشتبووە (٤٠) کەسێك. لە زمانی ئەو کەسانەوە کە تەرمەکەیان شۆردبوو وتیان لەو وەختەدا کە برابوو بۆ بەردەرکی سەرا گوللەیەکیش بەرشانی تەرمەکە کەوتبوو، ئەوەندە هەبوو لەو وەختەدا نەیان ئەویست بڵاوی بکەنەوە.

ئەمە لێرەدا وا، لەولاوە «عومەر عەلی» موتەسەڕیفی وڵات کە لە بەغدا بوو، خەبەر وەرئەگرێ ئەوا جەنازەی [شێخ مەحموود] برایەوە بۆ سولەیمانی، سەر لە ئێوارە لە بەغدا بەڕێ‌ئەکەوێ و بە پەلە ئەیەوێ خۆی بگەیەنێتەوە سولەیمانی. لە ڕێگە ئەپرسێ، کە پێ‌ئەڵێن ئەم کارەساتەیە ئەڵێ تەقەیان لێ بکەن و لێیان بکوژن هیچ دەست مەپارێزن!.

بەیانی زوو گەیشتەوە سولەیمانی لە پێش هەموو شتێکا ئەمری دەرکرد بۆ دەرنەچوونی شەوێ لە ناوشار؛ لە سەعات شەشی ئێوارەوە تا شەشی بەیانی، پۆلیسی بە چەك و دەبابە و تۆپ و تفەنگەوە خستە سەر جادەکان. مەنعی کرد کە کەس ناوی شێخ مەحموود نەیە بەسەر زمانیا، خەتیبەکانی مزگەوتی گەورە و خانەقای مەولانای بانگ‌کرد کە نەکەن باسی شێخ مەحموود بکەن، بەیاننامەیەکی دەرکرد و بڵاوی کردەوە کە: هەموو کەس ئەمرێ و پێویست نییە بۆ شێخ مەحموود ئەوەندە بە تەنگەوە بن، ڕۆژنامەی «ژین» کە لەو ڕۆژەدا خەبەری مردنی شێخ مەحموودی بڵاو کردبووەوە نەیهێشت بڵاو ببێتەوە، دەستەی ڕۆژنامەی خستە ژێر پرسیارەوە کە بۆچ شتی وایان نووسیوە؟. ڕۆژنامەکە تا، لای عەسر تەوقیف کراو پاشان بەهەر زمانێك بوو بەرەڵا کرا.

ئەمجا کەوتە خەڵك گرتن لەناو شار، لەبەر کارەساتی ناشتنی تەرمی شێخ مەحموود (٥٢) کەسی لە سولەیمانی گرت، کەوتە سەر ئەوە کە ئەوانەش لەگەڵ ئەم تەرمە لە بەغداوە هاتوون ئەوانەش بگرێ، بەڵام بۆی نەکرا.

پرسە لە مزگەوتی گەورە دانرا، پرسەکەش هەر ئەوەبوو بەیانی دائەنرا تا سەعات پێنجی ئێوارە و پاشان لەبەر ئەوە ماوەی گەڕان نەبوو هەڵئەگیرا. تا سێ ڕۆژ پرسە هەبوو خەڵکی‌تر لە وڵاتانەوە ئەهاتن، پاش سێ ڕۆژە پرسە دوایی هات، ئەوانەی کە لەم لاو لەولاوە هاتبوون گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان. من و «حاجی نووری کەریماغا»ش گەڕاینەوە بۆ بەغدا.

ئەمە کارەساتی مردنەکەی شێخ مەحموود بوو لە سولەیمانی و ئەمەبوو پیاوەتی حوکوومەتی وەخت و عومەر عەلی موتەسەڕیفی سولەیمانی.! لەگەڵ ئەوەدا ئەگەر حوکوومەت [شێخ مەحموود]ی پێشەوای کوردستانی بە ئەفسەرێکی بچووك بزانیایە و چەند سەربازێکی «ماتەمی» لە بناری شارەکەی سولەیمانیەوە هەم بەناوی ڕێز لێ

گرتن و هەم بە ناوی ئاسایشەوە بخستایەتە تەکی ئەو کارەساتانە هیچی ڕووی نەئەدا، بەڵام حوکوومەت ئەو حوکوومەتە بوو کە (٣٥) ساڵ جەزرەبەی [شێخ مەحموود]ی ئەدا بۆ ئەوە پیاوەکانی خۆی لەسەر کورسی بن، ئێستە چۆن ئیشی وا ئەکا کە شێخ محموود بەڕێز و خەڵکی‌تر لە ئاسایشا بن؟!..

ئەوەندە هەیە زۆر لۆمەشیان ناچێتەسەر، چونکە ئەوان هەموو ئامانجێکیان کیسە پڕکردنی خۆیان و ڕازی‌کردنی ئاغاکانیان بوو. یەکێ ئەمە ئامانجی بێ ئیتر چۆن بە تەنگ دڵنەوایی و ئەمن و ئاسایشی میللەت و وڵاتەوە ئەبێ؟!.

ئەمە قانوونێکی تەبیعییە ئەگەر سەرۆکی حوکم و کاربەدەستانی حوکم بیروباوەڕیان باش بێت و ئارەزووی ڕەزامەندی و ئاسایشی میللەت بکەن، ئەو «شەعب» و میللەتە لە ماوەیەکی کەمدا ئەگەیەنە چڵەپۆپەی بەرزی و کامەرانی، خۆ ئەگەر ئەو کاربەدەستانە هەموو کۆششێکیان بۆ ڕەنگاوڕەنگ‌کردنی کۆشکە عاجییەکانی خۆیان بوو بۆ ئەوە گوێیان نەبێ لە ئاه و ناڵەی میللەت، ئەوە ڕۆژە ڕەشێکە کە تووشی هەر دوولایان ئەبێ؛ تووشی ئەوان ئەبێ چونکە کۆشکی عاجێ کە لەسەر بناغەی زوڵم و جەور دامەزرا زوو ئەڕووخێ، تووشی میللەتیش ئەبێ چونکە بەدەست ئەوانەوە ماوەیەك گیر ئەخۆن، بەڵام دەوری هەر دوولاشیان زوو دوایی دێ؛ هی ئەوان بە ڕووخاندن!. هی ئەمان بە ڕزگاربوون!..

◈◈◈

# شۆڕشی بەرزان

«بەرزان» ـ کە هەندێك بە «بارزان» ناوی ئەبەن ـ گوندێکە لە قەزای «زێبار» کە کەوتۆتە شیمالی ڕۆژهەڵاتی مووسڵەوە ـ شێخەکانی بەرزان نیسبەت ئەدرێنە پاڵ ئەو گوندە.

سەرچاوەی ئەم شێخانە لە شێخ «تاج الدین»ەوە هاتووە، کە ئەم شێخە یەکێك بووە لە خەلیفەکانی «مەولانا خالد» و لەو گوندەدا ئیرشادی کردووە و پاشان بەرە بەرە خەڵکی‌تر هاتوونەتە کۆڕەکەیەوە. ئەم شێخ «تاج الدین»ە بێجگە لە تەریقەتەکەی پیاوێکی عالم و زاناش بووە. پاش خۆی تەرێقەت هاتۆتە سەر شێخ «عەبدوسەلام»ی کوڕی و پاش ئەو بۆ شێخ «موحەممەد»ی کوڕی شێخ «عەبدوسەلام». پاش ئەو شێخ «عەبدوسەلام»ی دووهەم، شێخ ئەحمەد، شێخ موحەممەد سدیق، مەلا موستەفا، شێخ موحەممەد، کە ئەم شێخ موحەممەدەیان بە «بابۆ» ناوبانگی دەرکردووە.

هەرچەندە شێخ موحەممەدی یەکەم ئەم هەموو کوڕانەی هەبووە بەڵام دەستووری سەرۆکی شێخایەتی و ئیرشاد هەر بە دەست «شێخ ئەحمەد»ەوە بووە.

هەر لە سەرەتاوە بەرە بەرە بە هۆی شێخایەتی و تەرێقەتەوە هەموو ناوچەکانی «مێرگەسوور و مزووری باڵا» و زۆرتر لە «زێبار» بوون بە مورید و تۆبەکاریان تا لە ئاخرا وای لێ هات بە هەموو خەڵکی ئەو ناوە ئەوترا: «بەرزان» و «بەرزانی» وە یا عەشایری بەرزان. بێجگە لە شێخەکان بە مسکێنەکانیش هەر ئەوترا «بەرزانی»، ئەمە یەکێك بوو لە تاقە ڕەوشتە نایابەکانی شێخانی بەرزان کە لەقەبی خۆیان دابوو بە مسکێنەکانیش.

[بەرزان] وای لێ هات لە تاقە گوندێکەوە بوو بە نزیکەی (٢٠٠) گوند و (٢٥) هەزار کەسێك. وڵاتەکە زۆر کوێستان و شاخ و داخە، لە شیمالەوە پاڵ ئەدا بە خاکی [تورکیا] وە، کەمەکێك لە ڕۆژهەڵاتیەوە پاڵ ئەدا بە ئێرانەوە، باقی ڕۆژهەڵاتەکەی ناوچەکانی «برادۆست» و ڕواندزە. لە جنووبەوە «ئاکرێ» پاڵی پێوە داوە، لە ڕۆژئاوایەوە «ئامێدی و دهۆك» گرتوویانەتە باوەش.

چاندنی گەنم و جۆی کەمە، میوەی زۆرە، هاتوچوویان لەگەڵ «مووسڵ»دایە.

بەرزانیەکان زۆر شەڕکەر و ئازان، بە هەموو مەعنایەك ژێردەستەن بۆ شێخەکانی خۆیان، قسە شکاندنی ئەوان بەلای بەرزانیەوە نابێ، بەرزانی درۆ نازانن، زۆر پابەندی دیانەتن، هەموو شافیعی مەزهەبن. لە بەرزاندا هەر کەسە جووت و بەراوی خۆی هەیە، شێخەکانیش لەم لایەنەوە هەر بە ئەندازەی مسکینەکانیان هەیە. شێوەی قسەکردنیان شێوەی کوردی بۆتانە. مۆسیقای قسەکردنیان ئاوازەیەکی هەیە. لە مێژە ناوی بەرزان و بەرزانی کەوتۆتە سەر کورسیەکانی سیاسەتەوە. کە واتە با تۆزێ بچینەوە بۆ دواوە:.

❋ ❋ ❋

لە پێش ئەم ئاوڕدانەوەدا ئەبێ ئەوە بزانرێ کە ناوی بەرزان لە، وشەی «بەرز»ەوە هاتووە، لەبەر ئەوە ئەو گوندە ڕێکەوتنی دروستکردنەکەی لە شوێنێکی بەرز و بڵندەوە بووە پێیان وتووە بەرزان.

هەندێ کەس ئەڵێن «بارزان» وە بارزان ئەبەنەوە سەر «پارسان» و ئەڵێن واتە عابیدان و زاهیدان لەسەر ئەو ئیعتیبارە کە ئەم شێخانە زاهد و خواناس بوون. ئەمە جارێ بێجگە لەوە کە ئەمە نە ئەبوا پارسان بوایە، بەڵکوو ئەبوا «پارسایان» بوایە و ئەویش بارزانیان بوایە، واتە موفرەدی وشەکە بارزانیان بوایە، ئەو وەختە «جەمعە»کەی ئەبوو بە «بارزانیانیان» وە یا «بارزانیانکان» ئەمەش دیارە شتێکی هەڵەیە. دیسان ئەوانە لە سەر ئەو ئیعتیبارە وا ئەڵێن کە گۆیا ئەمە لە خواناسی شێخەکانەوە هاتووە، لەگەڵ ئەوەدا ناوەکە هەیە لە پێش ئەوەدا کە ئەو شێخانە دەست بدەن بە شێخیەتیەوە، واتە لەگەڵی پێش زەمانی شێخ تاجەددینەوە ئەو گوندی بەرزانە هەیە و ناوی بەرزان بووە.

ئەمەش پێچەوانەی ئەوە نییە کە «بەرزان» ئێستە عەشرەتە و چۆن ئەبێ ناوی گوندبێ؟!. پێچەوانەی ئەوە نیە، چونکە هەموو عەشرەتێك ناوەکەی سەرەتا ناوی باپیرە گەورەیەکی وە یا ناوی ئەو شوێنە بووە کە لێ دانیشتوون، ئەمانیش [بەرزان] سەرەتا ناوی ئەو گوندە بووە و بە درێژایی زەمان بڵاو بوونەتەوە، تاوای لێ هاتووە بووە بە ناو بۆ عەشرەت و وڵاتەکانی شیروان، هەرکی، بەرۆژی و مزووری و هەموو ئەو وڵاتە.

❋ ❋ ❋

**گەڕانەوە بۆ سەرباسەکە:**

لە کاتێکدا کە «شێخ تاجەددین» خەریکی شێخیەتی بوو لەبەر ئەوە کە ئەو لە ئاخر و ئۆخری ژیانیا دەستی‌دابوو بە دامەزراندنی بنەماڵەی شێخیەتییەوە کۆڕی مریدان ئەوەندە پەرەی نەسەندبوو. کە ئەو کۆچی کرد شێخایەتی هاتە سەر «شێخ عەبدوسەلامی یەکەم». ئەم لەبەر بناغەدانانی باوکی و زیاد مانەوەی خۆی ناوێکی زلی دەرکرد و مورید و سۆفیەکی زۆری بۆ پەیدا بوو، بەم‌بۆنەوە دەسەڵاتێکی باشی پەیدا کرد، ئەم‌جۆرە دەسەڵاتە بۆ ئاغەکانی زێبار و وردە ئاغەکانی‌تری ئەو دەورە دەستی نەئەدا ـ وەکوو ڕەوشتی هەموو شێخەدێیەك ـ چاکی دوژمنایەتیان لێ بەلادا کرد بۆی. ئەم ناکۆکی بەینی زێباری و شێخانی بەرزانە تا زەمانی شێخ موحەممەدی کوڕی شێخ عەبدوسەلامی گەورەش هەر درێژەی کێشا و پاشان ئیتر سەریان بۆ دانەواندن و شێخانی «بەرزان» بەتەواوی سەرکەوتن.

لە دەورەی شێخ عەبدوسەلام و دەورەی ناکۆکیدا ئاغەکانی زێباری هەر جارە خۆیان لە کاربەدەستەکانی زەمانی عوسمانی نزیك ئەخستەوە بۆ ئەوە سەرکەون، بە هەموو جۆر زمانیان لە بارەی نالەباری شێخەکانا ئەگێڕا. کاربەدەستانی دەوریش سەری تەلیان ئەگەیاندەوە بە ئەستەمۆڵ و «بابی عالی»، ئەیانوت ئەم شێخانە یاخی بوون!. لە ڕاستیشا وانەبوو بەڵکوو هەر ئەوەندە بوو ساردییەك لە بەینی بابی عالی و شێخانا پەیدا بووبوو.

ئیش کە درێژەی کێشا ناچار «شێخ عەبدوسەلام» بە ئاشکرا داوای هەندێ شتی لە «بابی عالی» کرد. یەکێك لەو داواکردنانە لابردنی هەندێ لەو کاربەدەستانە بوون کە بووبوون بە مایەی فیتنە لە بەینی ئەو و «بابی عالی»دا. دیسان هەندێ کاروبار ڕێك‌خستنیش لە وڵاتی کوردەواری ئەو شوێنەدا وەکوو لابردنی هەژاری و چاك‌کردنی ئابووری وڵات و کردنەوەی قوتابخانە و خوێندن بە کوردی تیایاندا.

حوکوومەتی ئەستەمۆڵ کە چاوی بەم قسانە کەوت ئەوەندەی‌تر شێت بوو! وتی ئەم جۆرە داواکردنانە هی شێخێکی تەریقەت نییە، بەڵکوو ئەمە تێوەژەندنێکە لە لایەن کۆمەڵە کوردییەکانەوە کە ئەیانەوێ حوکوومەتێکی لامەرکەزی بۆ کورد دروست بکەن!. بێجگە لەمەش دیسان خەڵك و خوا وایان لە [بابی عالی] گەیاندبوو کە ئەمانە لە

ژێرەوە لەگەڵ ڕووسا قسەیان هەیە بۆ دروستکردنی حوکوومەتێکی کوردی بۆیان!.

هەموو ئەم شتانە بوون بە هۆی ئەوە کە حوکوومەتی ئەستەمۆڵ بە هەموو جۆر خەشم و قین لە «بەرزان» و بەرزانیەکان هەڵبگرێ و خەریکی ئەوەبێ کە لەناویان بەرێ.

ئەمە و دیسان لە بەربەرەکانیەکانی «حیزبی ئیتتیحاد و تەرەقی» و «حیزبی حوریەت و ئیئتیلاف» لە ئەستەمۆڵ هۆیەکی‌تر پەیدا بووبوو بۆ ناکۆکی بەینی شێخ عەبدوسەلامی بەرزان و حوکوومەتی ئەستەمۆڵ.

«حیزبی ئیتتیحاد و تەرەقی» شێخ عەبدوسەلامیان بەوە دائەنا کە ئاو لەوان لێڵ ئەکا و سەر بە بەرەی «حوریەت و ئیئتیلاف»ە. کە حیزبی ئیئتیلاف هاتە سەر حوکم، بە هۆی «ناظم پاشا»ی والی بەغداوە عەفواتێکی گشتی بۆ ئەو و بۆ هەموو بەرزانییەکان لە ئەستەمۆڵ دەرچوو، سەرباری ئەمەش هەر «ناظم پاشا» داوای ئافەرینێکی لە «بابی عالی» کرد بۆ «شێخ عەبدوسەلام».

لە پاش ئەم ماوەیە زۆری پێ نەچوو دیسان بەرەی «ئیتتیحاد و تەرەقی» هاتنەوە سەر حوکم، «ناظم پاشا»ی والی بەغدا ـ کە لە پاشا بوو بە وەزیری جەنگ لە ئەستەمۆڵ ـ بە دەسیاری بەرەی ئیتتیحاد و تەرەقی کوژرا. ئەم حیزبە دیسان دەستیان دایەوە بە توند و تیژیەوە. «سلیمان نظیف»ی کوڕی سەعید بەگی دیاربەکرییان کرد بە والی «مووسڵ».

جاری پێشوو کە حیزبی ئیتتیحاد و تەرەقی لە باوا بوون بە سەرۆکی «مەحموود شەوکت پاشا» وەزارەتی ئەستەمۆڵیان دامەزراند و حوکمیان خستە دەست خۆیان. لەم کاتەدا مەحموود شەوکەت پاشا کوژرا و وەزارەتەکەیان کەوت. حیزب کوشتنی مەحموود شەوکەتیان خستە ئەستۆی «سەفوەت بەگ» قایمقامی عەسکەری ـ کە ئەندامێکی بەکار و گەورە بوو لە [حیزبی حوریەت و ئیئتیلاف]دا ـ کە سەر لە نوێ بەرەی ئیتتیحاد و تەرەقی هاتنەوە سەر حوکم «صفوت بەگ» لەبەر ئەوە کە لەو سەردەمەدا لە «مووسڵ» بوو هەڵات و خۆی خستە لای «شێخ عەبدوسەلام».

کە «سلیمان نەزیف» لە لایەن ئیتتیحادیەکانەوە کرا بە [والی مووسڵ] هەموو جۆرە دەسەڵاتێکی درایە؛ کوشتن، بڕین، حەپس، هەموو شتێك. لێرەدا هات داوای [سەفوەت بەگ]ی لە [شێخ عەبدوسەلام] کرد، شێخیش سەفوەت بەگی نەدا بە دەستەوە. ئەمجا

«سلیمان نەزیف» لەشکری کێشایە بەرزانەوە، لە پاش شەڕ و شۆڕێکی زۆر [شێخ عەبدوسەلام] وڵاتی خۆی بەجێ هێشت و ڕووی کردە وڵاتی ئێران. لەوێ بوو بە میوانی «سید طه»ی سەید سدیقی شێخ عوبەیدیللای نەهری لە نزیکی «ورمێ». پاش ماوەیەك ویستی دیدەنییەك لە «سمایل ئاغای سمکۆ» بکا ـ کە ئەو سەردەمە سمایل ئاغا لەسەر سنووری ئێران و تورکیادا بوو ـ دیدەنی کرد و گەڕایەوە بۆ «نەهریە». وە ئەم دیدەنییەی بۆ چ مەبەستێك بوو دوور نییە هەموو کەس بیزانێ!.

لە گەڕانەوەیا هەندێ کەس سەری ڕێیان پێگرت کە ئەبێ بچێت بۆ لایان و گوندەکەی ئەوانیش پیرۆز بکا. گۆیا ئەم دەستەیە لە لایەن «سۆفی عەوڵای فەنەك» ناوێکەوە نێرابوون ـ کە ئەم ئەوڵایە لە ڕواڵەتدا خۆی بەیەکێ لە دۆستەکانی شێخ ئەزانی ـ شێخ گەلێ بیانووی بۆ نەچوون هێنایەوە بەڵام پیاوەکانی وازیان نەهێنا و وتیان: «کاك عەوڵا» وتوویەتی ئەگەر شێخ نەیەو ماڵەکەم پیرۆز نەکا ماڵەکەم ئەسووتێنم!.. گۆیا ئەم «کاك عەوڵا»یەش سەرۆکی هۆزێکی شکاك بووە لە خاکی تورکیادا. شێخ ناچار ئەبێ بە ڕۆیشتن و دڵیان ناشکێنێ.

کە شێخ بە ناوی بانگێشتن و میوانەوە ئەڕوا و پاش دانیشتن، عەوڵا پێی ئەڵێ من تۆم بۆ ئەوە هێناوەتە ئێرە کە بتگرم و بتدەم بە حوکوومەتی تورك!. هەرچەندە شێخ لەم ڕووەوە قسەی لەگەڵ کرد و ویستی لەو فیکرەی پەشیمانی کاتەوە کەڵکی نەبوو. ناچار سەری کڕنۆش بۆ چارەنووس دائەنەوێنێ. پیاوەکانی شێخ ویستیان دەست بکەنەوە شێخ نەیهێشت، لەگەڵ ئەوەش دوو پیاویان هەر خۆیان نەگرت، چەند کەسێکیان کوشت و پاشان ئەوانیش هەر لەوێدا کوژران.

شێخ گیرا و برا درایە دەست حوکوومەت، لەوێوە بردیانە «وان»، لەوانەوە بۆ «دیاربەکر» و لە دیاربەکرەوە بۆ مووسڵ. سلیمان نەزیف بە ئاواتی خۆی گەیشت!. لە پاش موحاکەمەیەکی سەرزارەکی گۆیا بەناوی ئەوەوە کە وەختی خۆی لەشکری شەشەمی عوسمانی ویستوویە بچێ بۆ جەنگی ڕووسیا شێخ سەری ڕێ پێ گرتوون و شەڕی لەگەڵ کردوون حوکمی خنکاندنیان دا بەسەر ئەو و سێ کەسیتر لە هاوڕێکانیا کە یەکێکیان «موحەممەداغای هیشتی»یان پێ ئەوت، سەرۆکی عەشرەتی «ڕێکان» و

پیاوێكی پیربوو. یەكێكیان «عەبدیاغای مزووری» و دیسان ئەویش چوو بووە ساڵەوە، یەكێكیشیان عەلی كوڕی حەمەدئەمیناغای مزووری، ناو بوو كوڕێكی گەنجی شایان بوو.

لە یەكی كانوونی یەكەمی (١٩١٤) ئەم چوار كەسە لەسەر داواكردنی حەقێكی خوراوی خۆیان هێنرانە بەر سێدارە و خنكێنران. [شێخ عەبدوسەلام] لە پێش ئەوەدا بچێتە بەر تەنافەكە دەستنوێژێكی شۆرد، هەندێ قورئانی خوێند و پاشان چووە پێشەوە وتی: «ئەم كوژرانەی من بەم جۆرە وەنەبێ بۆ حوكوومەت قازانج بێت» ئەمەی وت و پەتەكەی كردە ملی خۆیەوە.

[عەلی حەمەدەمیناغا] كە برایە بەر سێ دارەكە وتی: «قوڕ بەسەر حوكوومەت، وەنەبێ لە نەمانی ئێمە [بەرزان] لە ناو بچێت. با حوكوومەت بزانێ كە بەرزان نامرێ!.» و ئەویش سەری كرا بە پەتەكەوە!..

هەروەها لەسەر ئەم باسە ئەڵێ: لەسەر ئەو داخوازییانە كە كرابوون سلیمان نەزیف شێخ بەهائەددینی بامەڕنێ، شێخ عەبدوسەلام و شێخ نوورموحەممەدی گەورە ـ بریفكانی ـ ئەمانەی گرت و هێنانیە مووسڵ. شێخ «بهاءالدین»ی ناردەوە، «شێخ عەبدوسەلام»ی خنكاند، «شێخ نوورموحەممەد»ی خستە زیندانی خنكاندنەوە، لە پاش پێنج ڕۆژ لەبەر نەخۆشی بردیانە خەستەخانە و زۆری پێنەچوو لەوێدا مرد، لە پاشان نەیهێشت كەس‌وكارەكەی تەرمەكەی بەرنەوە هەر لە مووسڵا نێژرا.

ئەمە پەردەی یەكەمی دەوری شۆڕشی «بەرزان» بوو.

❁ ❁ ❁

شەڕی (١٩١٤ ـ ١٩١٨) دوایی هات و شەڕەنگێزەكان ڕێكەوتن، لە [٥ی تشرینی دووهەمی ١٩١٨]دا ئینگلیز چووە مووسڵەوە. كە ئەمە ڕووی دا بەرزان و شێخەكانی [بەرزان] پەلیان بڵاو كردەوە و دەستیان كێشا بەسەر عەشایەرەكانی ئەو ناوەدا، سیاسەتی ئەو وەختەی ئینگلیزیش دەنگ‌نەكردن بوو. بەم هۆیەوە ئەمان هەر بەهێزتر ئەبوون، بە تایبەتی وڵاتی «مێرگەسوور» كە عەشرەتی «شیروان»ی لێ دائەنیشت بوو بە پارچەیەكی تەواو لە «بەرزان». كە عێراق كەوتە ژێر حوكمی حوكوومەتی عێراقیەوە بەرزان زیاتر هیوای بەخۆی پەیدا كرد و كەوتە سەرئەوە كە بەتەواوی قسەی خۆی لە

هەموو ئەو وڵاتانەدا بڵاو بکاتەوە، ناوچەی حوکمی گەیشتە بناری «ڕواندز».

تا ئەو سەردەمە لەهەر لایەکەوە ئەگەر یەکێك بەرەنگاریان ببوایە لایەنی شێخەتیەکەی ئەمان لایەنی عەشرەتدارییەکەیانی بەهێز ئەکرد و ئەو بەرەنگارە ئیتر هیچی پێ نەئەکرا و سەری کرنۆشی دائەنەواند.

کە کەوتنە وڵاتی ڕواندز و «برادۆست»ەوە «شێخ ڕەشیدی لۆلان» خۆی لە بەریانا ڕاگرت و بوو بە کۆسپێکی زل لە ڕێگەی پێشکەوتنیانا. «شێخ ڕەشید»یش خۆی بە شێخ ئەزانی و ناوچەیەکی بەهێزی موریدین و مەنسووبینی هەبوو[1]. ئەو هێزە مەعنەوییە کە شێخەکانی [بەرزان] داوایان ئەکرد ـ وەکوو شێخیەتی بێ ـ شێخ ڕەشیدیش خۆی بە خاوەنی عەینی هێز ئەزانی و عەینی قسەی بەسەر خەڵکا هەبوو. دیارە شیر لە شیر کار ناکا!..

[شێخ ڕەشید] کەزانی لەگەڵ ئەم هەموو شێخیەتیەشا دەستی ئەو دەستی شێخەکانی بەرزان هەر ناشکێنێ پاڵی دا بە حوکوومەتەوە و ئەمجا هێزێکیتری بۆ خۆی زیاد کرد. کە شێخەکانی [بەرزان] ئەمەیان زانی ـ شێخی قسەڕەواش لە شێخەکانی بەرزانا هەر شێخ ئەحمەدی براگەورەی مەلاموستەفا بوو ـ عێلجاریان کرد و وڵاتی «شێخ ڕەشید»یان بەتەواوی داگیر و شێخیان بەجارێ کز کرد.

کە ئیش گەیشتە ئەم شوێنە حوکوومەت کەوتە سەر ئەوە کە بەتەواوی بچێتە مەیدانەوە. وڵاتی بەرزانیش هەمووی شاخ و داخ و هەڵدێرە، لەبەر ئەوە حوکوومەت ئەمەی پێ ناکرێ کە ڕاستەو ڕاست لەشکر بنێرێ.

ئەو سەردەمە «بزنانە» وەرئەگیرا، وڵاتی بەرزان لە ساڵا لە گۆترە هەندێ پارەی ئەدا بە حوکوومەت لەباتی هەموو بزنانە و مەڕانەی هەموو وڵاتەکە. حوکوومەت وتی من

---

١. «برادۆست» ناوچەیەکی فراوانە لە وڵاتی «ڕواندز» و پاڵیداوە بە ئێران و تورکیاوە، لە پشتەوە هەمووی شاخ و چیایە. مەرکەزەکەشی گوندی «سیدەکان»ە. لە ناوچەی برادۆستدا بێجگە لە عەشرەتی برادۆست خۆی عەشایەرەکانی «پیرهسنی، ڕەواندۆك و خواکورك»یش دائەنیشن.

ناوچەی نفووزی شێخایەتی [شێخ ڕەشید] وەکوو لەناو ئەم عەشرەتانەدا بڵاوبووبووەوە گەیشتبووە عەشرەتەکانی «خەیلانی، هەرکی و مامەساڵەی»یش. ئەمە لە عێراقا. لە ئێران و تورکیاشا عەشرەتەکانی هەرکی جێنشین، مامەش، زەرزا، گەردی، سیدای گرتبووەوە تا ئەچووە وڵاتی جۆلەمێرگ.

ئەڵێن «شێخ ڕەشید» لە سەرەتای ژیانیا ڕێگر بووە، پاشان بە همەتی پیرانی «تەریقەت» پێ گەیشتووە و بووە بە شێخی ئیرشاد. تەریقەتەکەشی تەریقەی نەقشبەندی بووە.

ئەمەوێ سەرژماری تەواو بۆ ئەم بزنانەیە بكەم و بەپێ سەرژمار پارە بدرێ، لەبەر ئەمە ئەبێ نوختەی پۆلیس و دائیرەی حوكوومەت لە بەرزان دروست بكرێ. «شێخ ئەحمەد» وتی ئەمە ڕەوشتێك بووە تا ئێستە نەبووە، چ لە دەوری توركیا، چ لە دەوری ئینگلیزا. ئەم وڵاتە لەبەر گەرمیانی و كوێستانییەكەی دانیشتووەكانی هەر بە چاوی كۆچەرایەتی لەلایەن باج و بزنانەوە سەیر كراون، چەشنی ئەو كۆچەریانەی‌تر كە لە عێراقا هەن، چۆن ئەوان هەروا بە گۆترە شتێكیان لێ وەرگیراوە، بەرزانیش هەروابووە. كە واتە پێویست بە دوست‌كردنی بنكەی حوكوومەتی ناكا لەم وڵاتەدا، چیمان داوە ئەیدەین و بە هیچ جۆرە لە هیچ وەختێكدا نافەرمانی و سەرپێچی لە ئیشی حوكوومەت لە ئێمەوە ڕوونادا.

حوكوومەتی ئەو دەورە وەزارەتی یەكەمی «تۆفیق سویدی» بوو، ئەم وەڵامەی «شێخ ئەحمەد»ی بەلاوە باش نەبوو بە یاخی‌گەری دانا، بۆیەش وای‌دانا چونكە وەكوو بۆمان دەركەوت لە بیانوو ئەگەڕا. فەرمان درا كە لەشكر بچێتە سەر «بەرزان». بەڵام لەو سەردەمانەدا ئیش‌كردن بۆ جێ‌بەجێ‌بوونی پەیمانی (١٩٣٠) لەكایەدا هەبوو لە هەموو عێراقا. ئەمە لە لایەكەوە لە لایەكی‌تریشەوە هەرای ئەیلوولی (١٩٣٠) سولەیمانی و بزووتنی شێخ مەحموود لە «پیران» و پەلاماردانی بۆ عێراق حوكوومەتی شڵەژاندبوو، بەم‌بۆنەوە وازهێنرا لە ناردنی لەشكر بۆ سەر بەرزان تا كەوتە دەوروبەری تشرینی (١٩٣٢).

ئەمە هەبوو، لەسەر قسەی «ئەمین زەكی بەگ»یش كە ئەو سەردەمە وەزیری جەنگ بوو ئەڵێ:

«فەرمانێكم لە لایەن «جەنەڕاڵ لۆخ» موستەشاری وەزارەتی جەنگەوە بۆ هات بۆ ئیمزاكردن بۆ ناردنی لەشكر بۆ سەر بەرزان. وتی داوای دۆسییەكانی پێش ئەمەم كرد هیچ شتێكی وام لەو دۆسیانەدا بەرچاو نەكەوت. لەم ڕووەوە قسەم لەگەڵ «رئیس الوزرا»دا كرد ئەویش بۆ ئەم مەسەلەیە ئاگای لە هیچ نەبوو. قسەم لەگەڵ «مەلیك»دا كرد ئەویش هەر بێ‌ئاگا بوو!. وتی ئیتر منیش كە زانیم وایە فەرمانەكەی موستەشاری بەریتانیم گێڕایەوە و ئیمزام نەكرد.».

❋ ❋ ❋

لە شۆڕشی دەوری دووهەمی بەرزاندا «فەلە ـ دیان» و «تەیاری»یەکان هۆی هەرەگەورە، بەڵکوو تاقە هۆ بوون بۆ هەڵگیرساندنی ئەو شۆڕشە. لەبەر ئەوە پێویستە ئاگادارییەك بەسەر کارەساتی ئەم فەلانەدا پەیدا کەین بۆ ئەوە بۆمان دەرکەوێ کە بە چەجۆر ئەمان بوون بە یەکەم هۆ بۆ ئەو شۆڕشە؟.

تەیارییەکان وا چووبووە دڵیانەوە کە لە پاشماوە و نەتەوەی «ئاسووری»یەکانن. ئەمانە لە «جۆلەمێرگ» و دەوروبەری «وان» لە نزیکەی سنووری ئێران و ڕووسدا دائەنیشتن، هەموویان بە جۆرە سەربەخۆییەکی زاتی لە ژێر فەرمانی [مارشەمعوون] ـ سەرۆکی ڕۆحانی گەورەیانا ـ ڕایانئەبوارد. «مارشەمعوون» لەقەبێکە بۆ ئەو ڕەئیسە گەورە دینیەیان کە ئیدارەیان ئەکا.

لەشەڕی (١٩١٤ ـ ١٩١٨) ڕووس پەلاماری «ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵاتی»دا و وڵاتی «وان»ی گرت و چاوێرییەکی باشی ئەرمەنییەکانی ئەوێی کرد و جبەخانە و هەموو جۆرە چەکێکی دانێ. ئەمانە بەرانبەر بە تورك یاخی بوون و دەستیان کرد بە جۆرە کردەوەیەك لە کوشتن و بڕینی ئەهلی ئەو ناوە نەفسی ئینسانی بێزی ئەهاتەوە لەو کردەوانە. حوکوومەتی تورکی ناچار بوو بە تەمێ‌کردنیان، ئەویش لە کوشتن و بڕینیان هیچ درێغی نەکرد، تەنانەت «کوشتاری ئەرمەنییەکان» بوو بە تەئریخێك. ئەمجا ئەوانەیان کە لە کوشتن ڕزگاریان بوو ڕووبەڕووی وڵاتی ئێران بوونەوە و لەگەڵ «نەستووری»یەکانی ئەوێدا قسەیان کرد بە یەك بۆ دۆزینەوەی ئیشێك بۆ خۆیان.

لە سەرەتای ئەو شەڕی (١٩١٤ ـ ١٩١٨)دا «لێژنەیەکی ڕۆژهەڵاتی بەریتانی» دروست بوو بۆ ئەوە کە بکەوێتە ئیش‌کردن بۆ تەگەرەدان لە کاروباری «حوکوومەتی عوسمانی» و یارمەتی ئەو کەسانانەی ئەدا کە دوژمنن بە حوکوومەتی تورك!.

لەو سەردەمەدا ئینگلیز دەستەیەکی عەسکەری بە سەرۆکی «جەنەڕاڵ ویسترفیل» نارد بۆ «ورمێ» بۆ ئەوە نەستوورییەکانی ئەو دەورە هەڵخرێنن بۆ بەگژا چوونی تورك. ئەمانە چوون و لە کانوونی دووهەمی (١٩١٨)دا بە ئارەزووی خۆیان گەیشتن، هەموو سەرۆکەکانی نەستووری ئەو ناوەیان کۆ کردەوە و قسەیان لەگەڵ کردن بە یەك. لە تەمووزی ئەو ساڵەدا کاروانێکی چاك جبەخانە و چەکیان بۆ ناردن. تورکەکان لەم

کارەساتە ئاگادار بوون، لە پێش ئەوەدا چەك و جبەخانەکە بگاتە دەست ئەوانە، تورکەکان هێرشیان بردە سەر «ورمێ» ئەوی بشێ و نەشێ پێیان کردن. ئینگلیز لێرەدا هیچی بۆ نەمایەوە تەنها ئەوە نەبێ ئەوانەی کە لە کوشتن دەرباز بوون بیانهێنێ لە دەوروبەری «باقوبە» دایانبنێ لەسەر ڕووباری «سیروان» و لەوێ بیانخاتە ئیشەوە!.

لە ماوەیەکی کەمدا بە «گاریە» هەمووی هێنانە ئەوێ و چادری بۆ هەڵدان. ئەمانە بوون بە نزیکەی (٥٠) هەزار کەسێك. (١٣/٥٠٠)یان لەو ئەرمەنیانە بوون کە لە وڵاتەکانی «وان، قەوقاس، بتلیس، غالیسیا، ئازەربایجان و ئەستەمۆڵە»وە هێنابوونی. (٢٥) هەزار نەستووریشیان تیدابوو ـ کە (١٥) هەزار لەمانە لە کێوەکانی کوردەوارییەوە هاتبوون ـ (١٠) هەزارەکەی تریشیان لە وڵاتەکانی «سەڵماس» و «سڵدوز»ەوە هێنرابوون. ئەم (١٠) هەزارە، کە شەڕ بڕایەوە حوکوومەتی ئێران قسەی دا بە گەڕانەوەیان بۆ ئێران. مایەوە (١٥) هەزارەکە، کە لە کێوەکانی کوردەوارییەوە هاتبوون. ئەمانە بوون بە مایەی دژواری؛ تورکەکان لە پاش ئەو هەموو خراپەیە کە لێیانەوە دیبوویان وەریان نەئەگرتنەوە، کوردەکانیش لێیان دڵنیا نەبوون تا ڕێگەیان بدەن و بچنە وڵاتەکەیانەوە. ئینگلیز لە پێناوی ئەو پیاوەتیەدا کە لەگەڵی کردبوون و بەوجۆرە سەری بردبوون بە قوڕا هەر ئەوەی بۆمابووەوە کەنان و بەرگیان بداتێ!..

ئینگلیز لێرەدا چارناچار چوارچاو بووەوە و کەوتە سەر فیکری ئەوە کە ئیشێکیان بۆ ببینێتەوە. لە پاشەرۆکی قۆمیتەیەکی زۆردا «کۆلونیل لەچمەن» ئەم ڕێگەیە دۆزییەوە کە:

«حوکوومەتی بەریتانی بێنێ کوردە موسوڵمانەکان لە دێهاتەکانی خۆیان دەرکا و بیاندا بە دەست نەستوورییەکانەوە، بۆیەش ئەمە بکا چونکە ئەمانە گەلێ جار عەزیەتی ئینگلیزیان داوە، بەتایبەتی کە «کابتان ویلی» و «لفتننت مەکدوکل» دوو حاکمە سیاسییەکەی ئینگلیزیان کوشتووە داخی ئەوانە هەر لە دڵ دەرناچێ!. ئەمە و دیسان لەسەر سنووری تورکیا زەوی و زارێکی باش هەیە بۆ ئەوە کوردەکانی لێ دابنرێن.»».

«کۆلونێل ئی. تی ولسن» وەکیلی حاکمی گشتی لە عێراقا ئەم پێشنیارەی پەسەند کرد و لە ئابی (١٩٢٠)دا بە تەلگراف ئەم خەبەرە خۆشەی گەیاند بە وەزارەتی جەنگی بەریتانی و خۆیشی ئەمەی خوارەوەی خستە سەر:

«ئەمە هەلێکی باشە بۆ ئەوە کە ئێمە حەقی ئاسوورییەکان بدەینەوە بە خۆیان، لام وایە بەم ئیشەمان هەم ئەفکاری شەعبی بەریتانی و هەم ئەفکاری هەموو ئاورووپا لە لایەن حەق و عەدڵەوە ڕازی ئەکەین. هەروەها کە ئەمەمان کرد مەعنای وایە گرێکوێرەیەکی زۆر چەتوونمان لە لایەن ئەقەلیەتی دینی و جنسی لە کوردستانا کردۆتەوە و ڕزگاریشمان ئەبێ لەو ترسە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان شیمالی [فورات] ئاژاوەی تێکەوێ و ئاشتی نەمێنێ. لە عەینی وەختیشا بەم ئیشەمان توانیمان تۆڵەی ئەو کەسانە بدەینەوە کە لە ئامێدی و ئەو دەورەدا ئاژاوەکەیان نایەوە. ئەمە هەلێکە نابێ بە سەریا بچین، چونکە جارێکی‌کە ئەمەمان بۆ ناگەڕێتەوە!.».

هەروەها حاکمی گشتی دانی بەوەدانابوو کە بەریتانیا ئەم فیکرەی پەسەند کردووە و ئەیەوێ لە سەری بڕوا، تەنانەت دوکتۆر «ویکرام»یشی بۆ جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە تایین کردووە. بەڵام کنەکردنی تورك لەناوچەی مووسڵ و کوردەواریدا و نەتوانینی ئینگلیز لەم ڕۆژەدا بۆ گواستنەوەی «فەلە»کان لە «باقوبە»وە بۆ ئەو وڵاتە پەکی هەموو ئیشەکەی خست.

ئینگلیز کە ئەو پرۆژەیە بۆ نەچووە سەر مەعنای ئەوە نەبوو کە ئیتر وازی هێناوە، بەڵکوو لە ڕوویەکی‌ترەوە گەلێ زیاتر خەریك بوو؛ هێنای نزیکەی دوو هەزار کەسێکی لێ کردن بە سەرباز و ناوی نان «سەربازی لیوی» و ئەیکردن بە گژ هەموو جۆرە [فتنە]یەکا؛ شەڕی بەرانبەر بە تورك لە شیمالی [عێراق]ەوە پێ ئەکردن، ئاژاوەی پێ هەڵئەگیرساندن. کارەساتەکانی مووسڵ و کەرکووك ـ کە سەربازی لیوی کردنیان ـ ئەگەر بە پشتیوانی ئینگلیزەوە نەبوایە چۆن ئەوانەیان پێ ئەکرا؟!.

لە ڕۆژی [١٥ی ئابی ١٩٢٣]دا لە شاری مووسڵ شەڕێکیان نایەوە (١٨) کەس کوژراو و بریندار کەوتە ئەوناوە، لە [٤ی مارسی ١٩٢٤]دا لە کەرکووك هەرایەکیان هەڵگیرساند کە نزیکەی (٢٠٠) کەسی کوژراو و بریندار کەوتە ئەو دەشتە. ئەمانەی پێ ئەکردن و ئەوانەشیان کە تفەنگ بە دەست نەبوون بە جاسووسی و شتی ترەوە خەریکی ئەکردن.

بەڵگەش بۆ ئەم جۆرە پشتیوانی‌کردنەش ئەوەیە کاتێ: کە [ئاغەپەترۆس ]سەرۆکی «فەلە»کان کەوتە سەر ئەوە کە گۆیا لە شیمالی «مووسڵ» لە بەینی سنووری عێراق

و [تورکیا]دا حوکوومەتێکی ئاسووری دائەمەزرێنێ، ئینگلیز ئەمەی بە موژدەیەکی زۆر گەورە وەرگرت و بڕیاری دا کە بە هەموو جۆر یارمەتیان بدا. لەم یاریەدانەدا هەم ئامانجەکانی خۆی پێیان پێك دێنێ، هەم لە چنگ بەخێو کردن و نان و بەرگەکەشیان ڕزگاری ئەبێ!.

زۆری پێ نەچوو لە نزیکی ڕووباری «خازر» لە بەینی «مووسڵ» و «ئاکرێ»دا سەربازخانەیەکی نایابیان بۆ دروستکرا و تا دە هەزار کەسێك لە وڵاتی «باقوبە» مابوو ڕەوانەی ئەوێ کران.

وەختێ خۆی ئەم فەلانە دوو تۆپیان لە کەشتی «مەرمەریس»ی تورکی بەهۆی ئینگلیزەوە دەست کەوتبوو. ڕۆژێك ئەچن بۆ «سەرعەقرە» و ئەم تۆپانە لەگەڵ خۆیان ئەبەن گۆیا لەوێ لەسەر کێوەکان تەقەیان پێ بکەن و بەمە چاوی کوردەکانی ئەو ناوە بترسێنن!. کە ئەشگەنە سەر کێوەکە، یەکێ لە تۆپەکان ئەکەوێتە ڕووباری «ئاکرێ» و پارچە پارچە ئەبێ و ئەویکەشیان نازانن چۆنی بتەقێنن!.

لە گەڕانەوەیاندا دەست ئەکەن بە گۆرانی وتن و بە توانج گرتن لە ئەهلی ئەوناوە. بەم کردەوەیەیان دڵی خەڵکەکە بەتەواوی برینـدار ئەکەن و ئیتر بۆیان دەرئەکەوێ هەر قسەیەك لەبارەی ئەمانەوە کراوە ڕاستە. هێشتا نەگەیشتبوونە سەر ڕووباری «زاب» بەرزانیەکان لێیان ڕاست ئەبنەوە، بەتەواوی شڕیان ئەکەن، ئەیانکوژن و تاڵانیان ئەکەن و بە جارێ کز ئەبن. لە پاش ئەم کارەساتە « ئاغاپەترۆس» ئەچێ بۆ پاریس و (١٩٣٢)دا لەوێ ئەمرێ، ئینگلیزیش ئاواتەکەی نەهاتەدی!..

❋ ❋ ❋

یەکەم دەوری وەزارەتی «ڕەشید عالی» بوو، ئینگلیز کە سەیری کرد تورکیا ڕێگە نادا بە چوونەوەی ئاسوورییەکان بۆ ئەوێ، فیکری هاتە سەر ئەوەکە بیانبا بۆ یەکێ لە دووڕگەکانی خۆی، ئەوەش هەر ڕێ نەکەوت. چاکتر ڕێگە کە دۆزییەوە دانانیانە لە شوێنێکی عێراق و چاویشی لێیان بێ!. بۆ ئەم ئیشە داوای لە حوکوومەتی عێراقی کرد، حوکوومەتیش لە [٩ی مارتی ١٩٢٨]دا بڕیاری‌دا کە ئەمانە لە دەوروبەری ناوچەی «برادۆست» و ڕواندزا دانیشن و خەریکی کشتوکاڵ بن. تەنانەت بە هەموو جۆر یارمەتیشیان بدا بۆ کاروباری

کشتوکاڵکردن. پاش ئەمەش دانی بەوەدا نا کە «مارشەمعوون» ببێ بە قشەیان و مانگی (٣٠٠) ڕووپیەشی بدرێتێ. وە «کاپتان فایکر» زابتی بەریتانی چاوێری ئیش و کاری نیشتەجێتی ئەمانە بگرێتە دەست، مانگانەی ئەمەش لە پارەی [عێراق] بێت بەڵام بۆ کاروفرمانی ئاسوورییەکان پرس و ڕا بە «معتمدی سامی» بکا!.

کاپتان کەوتە ئیش لە وڵاتی «ڕواندز» و «ئاکرێ» و «نەهلە» گەلێك لەمانەی حاوانەوە. مەسەلەی [فەلە] و ئاسووری گەلێ ئەدواریتری بەسەرا هات هەر لە عێراقا وەنەبێ ئەوە ئەوەندە مەبەستی ئێمەبێ. ئەوەی ئاشنایەتی بە باسەکەی ئێمەوە هەبوو هەر ئەوەندە بوو.

کە فەلەکان چوون و کەوتنە وڵاتەکانی نزیکی بەرزانەوە وڵاتی [بەرزان] و کوردەکانیتر لەم باسە هەموو سڵەمینەوە، چونکە ئەمە شتێکی ئاشکرا بوو کە لە ئاخردا کوردەکان لەوێ دەرئەکەن ئەمانەیان لە شوێن دائەنێن ـ وەکوو لە پێشەوە باسکرا ـ

شێخ ئەحمەد لێرەدا کەوتە خۆی و کەوتە سەر ئەو باوەڕە کە نەیەڵێ ئەم ئیشە سەربگرێ، چونکە پاشەڕۆژێکی خراپی بۆ خۆی و بۆ وڵاتەکەی هاتە پێش چاو. ئەم خراپییە نەوەك هەر کوردەکان کەوتە بەرچاویان بەڵکوو عەرەبە دڵسۆزەکانیش هەر لەسەر ئەو باوەڕەبوون کە لە ئاخردا ئیشێکی خراپ ڕوو ئەدا.

لەو سەردەمانەدا هەندێ لە زابتە کوردەکان وەکوو «جەمال عارف» و «مەحموود جەودەت» لە مووسڵ بوون، لە عەرەبەکانیش «مەهدی ڕەحال» لەوێ بوو، ئەمانیش لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە دانانی «فەلە» لەو وڵاتەدا بەو جۆرە نەوەك هەر بۆ کورد بەڵکوو بۆ حوکوومەتی عێراقیش زیانی زۆرە. «خەلیل شەوقی» خەڵکی ئامێدی بەناوی «بەرزان» و «شێخ ئەحمەد»ەوە هاتوچووی لای ئەم زابتانەی ئەکرد و باوەڕی هەموویان لەسەر ئەوەبوو کە ئەم ئیشە سەرنەگرێ بەڵام لە پێشا بە جۆرێکی هێمنی.

[جەمال عارف] و [خەلیل شەوقی] بە دەستیاری [شێخ ئەحمەد] کەوتنە سەر ڕێكخستنی «مەزبەتە»یەکی گەورە بۆ ئەوە بیدەن بە مەلیك و «دیوانی وزەرا» کە بوونی ئەم ئاسووریانە لەم وڵاتەدا تەنگ‌وچەڵەمەیەکی گەورەیە لە ڕێگەی حوکوومەتی عێراق و کورددا. [جەمال] و [خەلیل شەوقێ] هاتن بۆ بەغدا وێنەی مەزبەتەکەیان

ڕێك خست و بردیانەوە، لەوێ چوونەلای «شێخ عبدالرحمانی ئەتروشی» بۆ جێ بەجێ كردن و مۆر كردنی ئەم [مەزبەتە]یە لە لایەن سەرۆك عەشرەتەكان و ئەهالیەوە.

وەكوو «ڕەئیس جەمال» بۆی گێڕامەوە مەردایەتی و نیشتمان پەروەرییەك كە «شێخ عەبدوڕەحمان» بەو ڕیشی سپییەوە لەو كارەساتەدا نواندوویەتی تا ئێستە كەم كەس ئەو ئیشەی لە دەست هاتووە. بە یارمەتی شێخ عەبدوڕەحمان، خەلیل شەوقی و «ئەنوەر» ناو ـ كە سەربازكاتبێك بوو ـ هەموو ئەو ناوە گەڕان و لە هەموو لایەكەوە مۆری «مەزبەتە» كەكرا.

لە دەوری ئاخردا مەزبەتەیان هێنا بۆ وڵاتی «برادۆست» و بۆلای شێخ ڕەشید ئەویش مۆری كرد، گۆیا پاشان چووە خەبەری بە «كەریم بەگ» قائمقامی «ڕوانـدز» داوە كە ئەمانە شتێكی وایان كردووە!. قائمقام خەلیل شەوقی بەخۆی و مەزبەتەیەوە ئەگرێ و ئەینێرێ بۆ موتەسەڕیفی هەولێر (مەجید یەعقووبی). مەجید یەعقووبی سەیر ئەكا ئەم مەزبەتەیە وەنەبێ شتێك بێ لە خراپكاری حوكوومەت، هەرچەندە خەلیل تەوقیف ئەكا بەڵام وەنەبێ مەسەلەكەش زۆر بە توند بگرێ.

لەو سەردەمەدا جەمال دێت بۆ هەولێر بۆ خەبەری خەلیل، كە سەیری كارەسات ئەكا بە بێ پشوو خەبەر ئەنێرن بۆ شێخ ئەحمەد كە مەسەلە وای لێ هاتووە. شێخ ئەحمەد خەبەر ئەنێرێ بۆ حوكوومەتی «هەولێر» كە تا (٢٤) سەعاتی تر «خەلیل شەوقی» بەرەڵا نەكرێ من لێرەوە پەلاماری حوكوومەت ئەدەم. حوكوومەتی هەولێر كە ئەم خەبەرەی بیست خەلیلی بەرەڵا كرد و مەزبەتەش بە هۆی حوكوومەتەوە نێررا بۆ ئەو شوێنانە كە بۆیان نووسرابوو.

لە پێش ئەم شۆڕشە فیكریەدا «ئیبراهیم فەهیم» فەرماندەری «مەعەسكری غەزلانی» لە مووسڵ خەبەر ئەدا بە حوكوومەتی بەغدا ئەڵێ: «دوور نییە شێخ ئەحمەدی بەرزانی لە ڕووی حوكوومەتا هەرایەك هەڵگیرسێنێ، كە واتە پێویستە لە لایەن سوپای عێراق و «لیوی»یەوە پەلاماری بدرێ!». ئەمەش لە مانگی مارسی (١٩٢٩)دابوو. ئینگلیز لێرەدا كەوتە خۆی و چرپانی بەگوێ حوكوومەتا كە بەناوی «مەشق»ەوە سوپا و لەشكری هەر دوولا بنێرن بۆ ئەو وڵاتە.

کە ئەم لەشکرە گەیشتە ئەوێ ئەو وەختە زابتە باسکراوەکان تێگەیشتن کە هاتنی ئەم لەشکرە بۆ «تەمرین» نییە بەڵکوو بۆ بەرزانە. ئەوانیش ئەو وەختە دەستیان‌دا بەو مەزبەتە و هاتوچووکردنەوە. پاشان کەئینگلیز زانی مەسەلە وای لێ هات و بەرزان بەو جۆرە کەوتۆتە خۆی و کوردەکانی‌تریش یارییەی ئەدەن ئیشی وەستان و لە پەلاماردانەکە پەشیمان بووەوە.

وەکوو لەم قسانەوە بۆمان دەرکەوت ئاگری نانەوەی شۆڕشی دەوری دووهەمی بەرزان هەمووی گۆبەندی «فەلە»کان بوو کە وا ئینگلیز ئەو هەموو دەورانەی بەسەردا هێنان و شتی‌تر ئەخرایە ناوەوە بۆ بیانووی ئەم شەڕە.

❋ ❋ ❋

لەبەر ئەوشتانە کە باسکران و هۆی یەکەمیان دانانی «دیان»ەکان بوو لە ناوچەکانی بەرزانا، حوکوومەتەکانی ئەو وەختەی عێراق ئەو هەموو بڕوبیانوانەیان هێنایەوە بۆ ئەوە کە ڕێگەیەك بۆ خۆیان پاك بکەنەوە و بەو بۆنەوە بدەن لە بەرزانیەکان، دەمێك بەناوی باج و بزنانە و دەمێك بە ناوی یاخی بوونەوە هەموو جۆرە شتێکیان لەبارەی بەرزانیەکانەوە ئەخستە بەرچاوی خەڵك!.

ماوەیەك بەو جۆرە تێ‌پەڕی و ئەمجا حوکوومەت بۆی دەرکەوت کە سەرەی ئەوە هاتووە لێیان بدا. بە تایبەتی کە ئەو وەڵامەی لە «شێخ ئەحمەد» وەرگرتەوە کە مەیدانی دروستکردنی نوختەی پۆلیس نادا لەو ناوەدا ئیتر هەلی بۆ هەڵکەوت کە دەستی خۆی بوەشێنێ!. هێنای لە تشرینی دووهەمی (١٩٣١)دا ئەم بەیاننامەیە دەرکرد، کە:ـ

«لەبەر ئەوە شێخ ئەحمەدی بەرزانی پەلاماری هەندێ دێهاتی ئەو ناوەی داوە و لە تالان‌کردن و لە کوشتن هیچ درێغییەکی نەکردووە، حوکوومەت بڕیاری‌دا تۆڵەی لێ‌بکاتەوە، بەوبۆنەوە فەرمانی‌دا بە فەوجی سەربازی «بلە» بچێتە سەریان و تەمێیان بکات. لەپاش ئەوە کە لە ڕۆژی (٩)ی تشرینا بەرەنگاری یەك بوون، لە هێزی حوکوومەت (١٣) سەرباز و ئەفسەرێك کوژراو (٩) بریندار‌یش هەر لە سەرباز و پۆلیسەوە پەیدابوو. لە هێزی شێخ ئەحمەد (٣٠) کەس بریندار بوو (٢٠) کەسیش کوژرا. حوکوومەت هەر خەریکە بۆ لەناوبردنی ئەوانە وە بۆ گێڕانەوەی ئاسایش لەو ناوەدا.»

لەم بەیانەدا كە حوكوومەت دای چەند شتێكی دوور لە ڕاستیەوە تێدابوو؛ یەكەم مەبەستی بە تاڵان و كوشتنەكە لە دێهاتەكانا، ئەوە وانەبوو بەڵكوو هەراكەی بەینی [شێخ ڕەشید] و [شێخ ئەحمەد] بوو حوكوومەت وابەو جۆرە ناوی [شێخ ئەحمەد]ی پێ شكاند، دووهەم كوژرا و لە دەستەی [شێخ ئەحمەد] یەك كەس بوو (٢٠) كەس نەبوو. سێهەم حوكوومەت ماوەیەكی زۆری پێچوو ئەو وەختە كەوتە خۆی. ئەو فەوجەش كە لە «بلە» بوو، ئیشی بە جێ‌هێشت و گەڕایەوە بۆ دەوروبەری «ئاكرێ». هۆی ئەمەش ئەوە بوو كە ئەو ماوەیە [شێخ مەحموود] لە وڵاتی سولەیمانی دەستی دابووەوە بە شۆڕشەوە، حوكوومەت لەبەر ئەولا، نەیئەپەرژایە سەر ئەم لا.

ئەبێ ئەوەش بزانین لەم ماوانەدا گەلێ جار «شێخ ئەحمەد» ئەیناردە لای حوكوومەت بۆ ڕێككەوتن بەڵام لەبەر ئەوە پیاوەكانی حوكوومەتی ئەو دەورە كەوتبوونە شوێن قسەی ئینگلیزەكان بۆ دانانی ئاسوورییەكان لەو وڵاتەدا گوێیان بە قسەكانی «شێخ ئەحمەد» نەئەدا. مەسڵەحەتی ئەو پیاوانە لەوەدابوو كە بە قسەی ئینگلیز بكەن نەوەك بە قسەی [شێخ ئەحمەد]ێك كە ئەیویست بژیت لە وڵاتی خۆیاو پێ نەنێن بەسەریا!.

بزووتنەوە و هەرای «شێخ مەحموود» لە وڵاتی سولەیمانی دوایی‌هات، حوكوومەت ئەمجا پشووی پێا هاتەوە بۆ ئەوە بە دڵنیایی و بە بێ‌ترس ئاور بداتەوە بەلای پەلاماری [بەرزان]ەوە. لە نیسانی (١٩٣٢)دا هێزی پۆلیس و سەرباز بە پشتیوانی هێزی هەوایی بەریتانیەوە هەموو دەوروبەری [بەرزان]یان تەنییەوە و ئەمجا ئەم قسانەی بڵاو كردەوە:-

«لەبەر ئەوە كە حوكوومەت ئەیویست ئەم بەینە خۆی كۆكاتەوە، وە لەبەر ئەوە كە داوای لە حوكوومەتی بەریتانی كردبوو بۆ هێزی هەوایی، ئەم ماوەیە تۆزێ شەڕی دواخست بەرانبەر بە بەرزانییەكان. ئێستە كە هەموو شتێكی ئامادە كرد بڕیاریدا كە هێزی هەوایی بەریتانی لە ڕۆژی [٢٦ی نیسانی ١٩٣٢]دا بۆم بۆردمانی وڵاتی بەرزان بكات. فڕۆكەكان لە پێشا بەیاننامەیان فڕێدایە خوارەوە بۆ دێهاتەكانی بەرزان كە یارمەتی شێخ ئەحمەد نەدەن!.».

پاش ئەمە دەستیان كرد بە بۆمبا هاویشتن بە سەر گوندەكانا بە تایبەتی گوندەكەی [شێخ ئەحمەد]، ژن و منداڵ و پیاوی پیر كە نەیانتوانیبوو دەرچن هەموو لە ژێر بۆمبای

حوکوومەتە ئیسلامیەکەدا! پارچە پارچە بوون. لە [٢٧ی نیسانی ١٩٣٢]دا هێزی بەرزان فڕۆکەیەکیان خستە خوارەوە فڕۆکەوان و پاسەوانی فڕۆکەکەیان بە دیل گرت و هەموو جۆرە خزمەتێکی جوانیان کردن. پاسەوانەکە، شانی شکابوو، «شێخ ئەحمەد» ناردیەلای ئینگلیزەکان کە پزیشکێکی بۆ بنێرن بۆ ئەوە دەرمانی بکا.

بەم بۆنەوە بۆمباباران وەستێنرا، «کاپتان هۆڵت» سکرتێری باڵوێزخانەی ئینگلیز لەگەڵ پزیشکێکا چوون بۆ [بەرزان] و بوون بە میوانی «شێخ ئەحمەد». ئەمجا «کاپتان هۆڵت» کەوتە بەین بۆ ئەوە حوکوومەتی عێراقیش شەڕ بووەستێنێ بەڵکوو لە ئاخردا بگەن بە ئەنجامێکی باش. لە [٢ی مارسی ١٩٣٢]دا شەڕ، کە، لە دەوری «ڕۆی کووچەك» بوو وەستێنرا تا (٢٤)ی مارس. لەم ماوەیەدا «کاپتان هۆڵت» گەڕایەوە بۆ بەغداو قسەی لەگەڵ حوکوومەت کرد. حوکوومەت هەر لە سەر قسەی خۆی بوو کە ئەیوت ئەبێ چەکەکانیان بدەنە دواوە و نوختەی پۆلیس و قایمکاری ئەبێ لەو وڵاتەدا دابمەزرێ. لەگەڵ ئەوەدا «شێخ ئەحمەد» ئامادەبوو بۆ ڕێکەوتن بەڵام بە جۆرێك نە شیش بسووتێ و نەکەباب.

لە ڕۆژی [٢٤ و ٢٦] مارسدا بەیاننامە بەهۆی فڕۆکەوە بڵاو کرایەوە بەسەر ئەو ناوچەیە و جنووبی ڕۆژهەڵاتی «مزووری باڵا»دا کەبێن خۆیان بدەن بە دەست حوکوومەتەوە. سەیرتر ئەوەبوو لە ڕۆژی (٢٥) مارسدا فڕۆکەکانی هێزی هەوایی بەریتانی بۆم بۆردمانی دێهاتەکانی ئەو ناوەی ئەکرد، زەلام و ماڵات و هەرشتێکی بەرچاو بکەوتایە بە هێزی چەکداری بەرزانی ئەزانی و ئەیکوشتن، کەچی ڕۆژی پێش و پاشی ئەو ڕۆژی (٢٥)ەش بە بەیاننامە بە زمانی کوردی و بە میکرووفون دڵسۆزی لەگەڵ ئەنواندن کە بێن خۆیان بدەن بە دەستەوە!!.

چەند ڕۆژێك بەم جۆرە شەڕی ژیان و مردن درێژەی کێشا و هێزی بەرزان لە پێشەوە بوو، حوکوومەت ئەوەندەی‌تر هێزی هەوایی و تۆپ و تفەنگی زیاد کرد. ڕۆژی (٢٧)ی مارس ئاگری شەڕ لە هەموو ڕۆژەکانی پێشوو زیاتر بڵێسەی سەند. ئەوەی کە زۆریش هێزی میللی ئەشڵەژاند فڕۆکەکانی ئینگلیز بوون. لەم ڕۆژەدا ناچار هێزی [بەرزان] پەنایان بردە بەر ئەشکەوتەکان، ژن و مناڵ لەو ناوەدا لەبەر بۆمبای فڕۆکە

بەسەریەکدا ئەکەوتن!. لە ڕۆژی (٣١)دا هەندێ لە خێزان و منالّی گوندی «بەڕۆژ» هاتنەوە ناو ئاواییەکانیان و خۆیانیان تەسلیم کرد.

ئەم جۆرە کوشتارە بێ‌ڕەحمانەیە بەرانبەر بە بێ‌گوناح و ژن و منالّی [بەرزانی] درێژەی کێشا تا ڕۆژی [٩ی حوزەیرانی ١٩٣٢]. لێرەدا ناچار [شێخ موحەممەد سدیق] لەبەر ئەوە کە ئەو ژن و منالّە بێ‌گوناحانە لەوە زیاتر لە ژێر «بۆمبا»دا پارچە پارچە نەبن فیکری هاتە سەرئەوە کە خۆی بدا بە دەستەوە و کۆشش بکا بۆ ئەوە کە شەڕ بووەستێنرێ. نە ئینگلیز و نە حوکوومەتی عێراقی هیچیان ئەم قسەیەیان وەرنەگرت!. شێخ ئەحمەد ناچار مایەوە خۆی و برای و هەندێ لە پیاوە دڵسۆزەکانی چوونە خاکی تورکیا و لە [٢٢ی حوزەیرانی ١٩٣٢]دا خۆیان تەسلیم بەوان کرد و نیشتمانی خۆیان بەجێ‌هێشت! حوکوومەتی تورکیاش ناردنی لە «ئەدرنە» دانیان.

ئەمجا حوکوومەت بە باوەڕی خۆی بە هەموو دڵنیاییکەوە ئەوەی ویستی، لە وڵاتەکانی «مزووری باڵا» و «بەڕۆژ» و «بەرزان» جێ‌بەجێ کرد و بە ئارەزووی خۆی لەشکر و قایمکاری تیا دانا و تیاکرد. بەڵام ئایا لە ڕاستیدا وابوو؟. بە ڕۆیشتنی شێخ ئەحمەد و مەلا موستەفا هەموو ئیش بڕایەوە و ئاو کرا بە ئاگرا؟. نەء، وانەبوو؛ چونکە:

ئەو وڵاتە لەلایەکەوە لەبەر پابەندییان بە شێخانی بەرزانەوە، لە لایەکەوە لەبەر زۆروستەمی حوکوومەتی وەخت ـ کە چووە سەریان ـ ئەوەندەی‌تر دڵیان پڕ بووبوو، بەڵکوو زیاتر لە هەوەڵجار ئەرەوێنەوە؛ هەوەڵجار تا حوکوومەت ڕێ نەکەوتبووە ئەو ناوە بە قسەی لووس و بە «دەنگی دهۆڵ لە دوورەوە خۆشە!» هیوا هەبوو لەو بڕوایەدا بێ کە ئەگەر ئەو دەورە بگۆڕنەوە بە دەورێکی‌تر دوور نییە چاکتر بێ بۆیان، کە دەورەکەیان گۆڕییەوە سەیریان کرد هەر قسەیەکیان کە بۆ کراوە و هەر پەیمانێك کە پێیان دراوە هەمووی درۆ و دەلەسە بووە!. بەڵکوو لە باتی ئەوە چاکەیان لەگەڵ بکەن «تەماع» ئەکەنە هەموو شتێکیان و جنێو پێدان و سووك‌کردنەکەشیان با بووەستێ!..

«خەلیل خۆشەوی» ئەمانەی پێ هەڵنەگیرا و، بە یادی شێخ ئەحمەد و مەلا موستەفاوە دەستی دایە تفەنگ و لە شوێنی ئەوان کەوتە بەربەرەکانێ‌کردن لەگەڵ حوکوومەتا. بەرەبەرە ئەهلی ئەو وڵاتە دەوریان لێ دا و لێ کۆبوونەوە، بە یادی

تۆڵەسەندنی شێخانی بەرزان ـ کە لە ئاو و خاکی خۆیان بەزۆر دوورخراونەتەوە ـ سەریان لە هێزی حوکوومەتی ئەو ناوە تێکدا و لە هەموو لایەکەوە هێزی حوکوومەتیان شڵەژان.

لە ماوەی ڕۆیشتنی شێخ ئەحمەد و مەلا موستەفاوە تا ئەم مێژووە حوکوومەت تووشی دەردی وەزارەت گۆڕین بووبوو؛ لە ڕۆیشتنی ئەوانەوە تا دەوری خۆشەوی (٩) جار وەزارەت گۆڕابوو!. ئەمجارەیان هی «یاسین هاشمی» بوو، ئەمیش کەوتە خۆی. لەولاوە خەبەریان نارد بۆ تورکیا کە سەر سنوور بگرێت و لەشکر بێنێت، لەم لاوە خۆیشی بێجگە لەو هێزەی کە لەو وڵاتەدا هەیبوو هێزێکی زۆری هەوایی و سەرزەوی ڕژاندە بەرزانەوە. بەمانەش وازی نەهێنا لە [٥ی ئابی ١٩٣٥]دا ئیعلانی ئەحکامی عورفی لە هەموو ناوچەکانی بەرزاندا کرد و بە هەموو جۆر هەموولایەکیان لێ تەنین!.

دیوانی عورفی کەوتە ئیشەوە بە گوناح و بێگوناح ئەگیرا و حوکم ئەدرا!. هەندێك لە سەرۆکەکانی ئەو ناوە، وەکوو «عمر کوران، مەلازادە ئیسماعیل، موحەممەد مەحموود، فارس عەلی» و چەند کەسێکی تریش بەبێ ئەوە شتێکی وایان لەسەر بدۆزنەوە فەرمانی خنکاندنیان دا بەسەریاندا و خنکێنران، وە زۆرێکی زۆریشیان هەر لەو ناوە گرت و فەرمانی حەپسیان دا بە سەریانا. «ئیدارەی عورفی» بەمە وازی نەهێنا، بە پێ قسەی موتەسەریفی مووسڵ و قائمقامی زێبار ئاژاوەچییەکان وەختێ قبووڵ ئەکرێنەوە کە:

«١ـ سەرۆکەکان هەموو بدرێن بە دەستەوە بۆ محاکمە، ٢ـ لەو وڵاتەدا جامانەی سوور لابەن و جامەدانەی شین لەسەر بەستن! ٣ـ ئەوانەی کە وا یاخییەکان پەنا ئەدەن ئەبێ تۆڵە بدرێنەوە!.»

کە فەرمانی دیوانی عورفی گەیشتە ئەم شوێنە لە [٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٥]ی لابراو گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی. تەنها نزیکەی (٣) مانگ ئەم عورفیە مایەوە بەڵام لە کوشتن و خنکاندن و حەپس کردن هیچ درێغی نەکرد. «مەلا سدیقی کۆیی» و «سدیق تایەریش» دوو ئەندامی عورفیەکە بوون.

هەرای خۆشەوی هەر لە ناودابوو عورفی لابرا، لە هەموو لایەکەوە بەناکاوانە پەلاماری هێزی حوکوومەتی ئەدا، ئەمجا حوکوومەتی عێراقی لەگەڵ حوکوومەتی تورکیادا ـ کە زانی خۆی بە تەنها چاری ناکا ـ قۆڵیان کرد بە قۆڵی یەکا بۆ لەناوبردنی!.

لە ڕۆژی (١٩٣٦/٣/٧)دا بە هەردوولاوە پەلاماریان دایە، خۆشەوی و هاوڕێکانی لەناو ئەو دوو ئاگرەدا مانەوە، لەگەڵ ئەمەشا شێرانە سنگیان هەر بۆ پێشەوە ئەنا و خۆیان نەئەدا بە دەستەوە. ئەم شەڕی مردن و ژیانەیان درێژەی کێشا تا ڕۆژی (١٩٣٦/٣/١٣)، لێرەدا خۆی و «سەلیم خۆشەوی» و چەند کەسێکی‌تر لە پێناوی ئازادیا شەهید بوون و حوکوومەت تەرمەکەیانی دەست کەوت!

● ● ●

لەولاوە شێخ ئەحمەد و مەلاموستەفا و دڵسۆزەکانیان کە لە (١٩٣٢)دا خۆیان خستبووە کۆشی تورکیاوە و ئەوە بوو حوکوومەتی تورکی بردنی لە «ئەدرنە» داینان. لە پاش نزیکەی ساڵێك تورکیا هەستی بەوە کرد کە ئینگلیز دیسان کەوتۆتەوە سەر ئەو فیکرە کە ئاسووریەکان لەو سەرسنووری ئەو و عێراقەدا نیشتەجێ بکا. لەبەر ئەمە دەستەی شێخی لە ئەدرنەوە گواستەوە بۆ «کۆبان» ـ کە ئەم شوێنە لە زەوی و زاری خۆی و لەسەر سنووری بەرزانەوە بوو ـ ئینگلیز کە ئەمەی زانی دیسان ئاگر چووەوە کەوڵیەوە!. هیچ چارێکی نەدۆزیەوە بێجگە لەوە نەبێ: کە ئەو و عێراق و تورکیا قسەبکەن بەیەك بۆ دانەوەی ئەمانە بە حوکوومەتی عێراق بە مەرجی لێخۆشبوونیان و گێڕانەوەیان بۆ وڵاتی خۆیان.

ئەم پەیمانە کرا و بەرزانییەکان ـ کە (٨٦) کەس بوون ـ درانەوە بە حوکوومەتی عێراق، بەڵام حوکوومەت لە باتی ئەوە بیانباتەوە بۆ وڵاتی خۆیان بردنی لە [مووسڵ] داینان. پاش ئەوە بردنی بۆ «ناصریە» پاشان بۆ «حلە» بۆ «دیوانیە» بۆ «کەرکووك» بۆ «پردێ»!. چوار ساڵێك لەم ناوانەدا مانەوە؛ پاشان لەبەر ئەوە کە ئەمانە خەڵکی وڵاتێکی کوێستانی بوون، ئەم ماوەیە کە لەم وڵاتانەدا بوون هەموو تووشی نەخۆشی و زەردووی و تاولەرز بووبوون، بەم بۆنەوە گوێزرانەوە بۆ شاری «سولەیمانی». سولەیمانی بوو بە شوێن ژیانی حەوساڵیان کە بە خراپتر و چەوسانەوەتر ژیان لەوێ بەهۆی پیاوەتی پیاوەکان حوکوومەتەوە ڕایانبوارد!. حوکوومەت ئیشێکی وای کردبوو کە لەوێدا تەنانەت ئەهالیش نابێ لە گەڵیانا قسەبکەن!. لە برسا و لە ڕووتییا «مەجووس» بەزەیی پیانا ئەهاتەوە بەڵام حوکوومەتە موسوڵمانەکەی مامی «عبدالإلە» و کاربەدەستەکانی پیاوی عەبدولئیلاه بەزەییان پێیانا نەئەهاتەوە!. ئەمەبوو حوکوومەتە ئیسلامییەکە کە

پڕوپاگەندەچییەکانی ئەیانوت بەرزانییەکان لە ڕووی حوکوومەتی ئیسلامیدا شیریان کێشاوە ئەبێ بە شەرعی ئیسلام بکوژرێن!!!.

❋ ❋ ❋

شەڕی دووهەمی گەورەی گیتی بوو، دنیا لە هەموو لایەکەوە تێکچووبوو، کارەساتی (١٩٤١)ی «ڕەشید عالی» لە عێراقا جۆرە باوەڕێکی‌تری خستبووە ناوەوە، لەبەر ئەوە شەشەم وەزارەتی «نووری سەعید» بوو لە عێراقا، شێخ موستەفای قەرەداغی موتەسەڕیفی سولەیمانی بوو. دەستەی «مەلا موستەفا» و «شێخ ئەحمەد» هەر ڕۆژە بە جۆرێك لە سولەیمانی بە فەرمانی پیاوانی حوکوومەت تۆڵەیان لێ ئەکرایەوە. «مەلا موستەفا» هیچی بۆ نەمابووەوە تەنها دەرس خوێندنی فەقیان نەبێ لە مزگەوتی «شێخ سەلام»، هەموو شتێك لەدڵیا پەنگی خواردبووەوە. کەوتە سەر ئەوە کە کۆتی دیلی بپچڕێ و بناغە بۆ سێهەم شۆڕشی «بەرزان» دابمەزرێنێتەوە، بەسە ئیتر لە گۆشەی شاراندا بە کەساسی کەوتن.

لە [١٧ی حوزەیرانی ١٩٤٢]دا بە دەسیاوی ئەو حیزب و بەرەیە کە لەو سەردەمەدا لقێکی بەهێزی لە سولەیمانی هەبوو، خۆی و «مامەند شیروانی» و «شێخ موستەفا» بە پڕ، چەکەوە بەبێ‌دەنگ و بە پێیان لە سولەیمانی دەرچوون بە ڕێگەی پێنجوێن ـ بانە ـ سەردەشت ـ پەسۆی ـ لاجان ـ ناودەشت ـ سیلکە ـ سرێشمە. بەماوەی تاقە حەفتەیەك خۆی گەیاندەوە جێگە هێلانەی باو باپیری ـ کە بەرزانە ـ

نەمانی «مەلاموستەفا» و دەرچوونی لە سولەیمانی حوکوومەتی سولەیمانی و نووری سەعیدی بەغدای شڵەژان!. وەختێ خەبەریان بووەوە مەلا لە بەرزانە و نێچیر لە تۆڕ بەرەڵا بووە!.. ئاخ و داخ کەڵك ناگرێ. یەکەم شت کە حوکوومەت کردی، گواستنەوەی [شێخ ئەحمەد] بوو بە (٨١) بەرزانییەوە لە سولەیمانی بۆ «حلە» لە ترسی ئەوە نەوەك ئەمانیش ئەو زنجیرە بپچڕێنن و بچن بۆلای [مەلا موستەفا]!.

ئەمجا پاش ئەوە کە «مەلا موستەفا» گەیشتەوە بەرزان و تۆزێ حەسایەوە، وەپاش ئەوە کە حوکوومەتی هەموولایەك بە سۆز کەوتە شوێن هەڵگرتنی ئەم دوژمنەی. مەلا، قاپی قسەکردن و کاغەز نووسینی لەگەڵ حوکوومەتا کردەوە کە مەبەستی لەم هەڵاتنەی

یاخی‌گەری و پیاوخراپی نییە، بەڵکوو تەنها پیاوخراپی کاربەدەستانی حوکوومەت وایان لێ کرد کە بەم جۆرە دەشت بگرێتە بەر. ئێستە هەر مەبەستی ئەوەیە لە وڵاتی خۆیا و لە ناو خزم و کەس و کاری خۆیا بە هێمنی و ئاسایش دانیشێ، بێجگە لەمە هیچ مەبەستێکی‌تری نییە.

حوکوومەت گوێ خۆی لەم قسانەی ئاخنی و وتی شتی وام زۆر گوێ لێ بووە!. بە پێچەوانەی ئەوە فەرمانی کردە سەر هێزەکانی وڵاتی [بەرزان] کە ڕاوی نێن و بیگرن!. ئەوەندە هەبوو مەلا خۆی نەئەدا بەدەستەوە، شوێن گۆڕکی ئەکرد و خۆیشی لەشەڕ ئەپاراست.

کە ئیتر زانی بە هیچ جۆر حوکوومەت لە گەڵیا ڕێ ناکەوێ، ئەمجارە بەدڵ چاکی لێ کرد بەلادا و دەستی کرد بە گەڕان بە ناو عەشایرەکانی ئەو دەورەدا و تێیانی گەیاند کە ئەو هیچ مەبەستێکی نییە تەنها لابردنی زۆر و ستەمی حوکوومەت و ئەمن و ئاسایشی ئەو ناوە نەبێ. نەوەك هەر ئەوەندەش بەڵکوو ئەیەوێ شۆڕشێك بنێتەوە، وڵاتی کوردەواری ئازاد ببێ و لە ستەمی کاربەدەستانی حوکوومەتی ئەو دەورەی عێراق ڕزگاریان ببێ.

بەم گەڕانەی و بەم ئیشەی ڕووی دڵی خەڵکی ئەو ناوەی هەموو کردە خۆی و ڕۆژ بە ڕۆژ لە شوێنانی دوور لە وڵاتی بەرزانیشەوە - واتە لە شوێنەکانی‌تری کوردەواری - باقە باقە نامە و کاغەزی بۆ ئەچوو کە لە هەموولایەك بەگیان و بە دڵ پشتیوانی ئەم باوەڕە پیرۆزەی ئەکەن.

سەرەتای پەلاماردانی گرتنی نوختەکانی «شاندە» و «خیرزوك» بوو، بەرە بەرە و یەك لە دوای یەك نوختەکانی ئەچنیەوە. لەماوەیەکی زۆر کەمدا (٢١) نوختەی پۆلیسی لەو ناوەدا داگیر کرد و هەموو ناوچەکانی «شیروانی مەزن» و «مێرگەسوور» کەوتە ژێر فەرمانیەوە. چەك و جبەخانەیەکی زۆری دەست کەوت، ناوبانگی بە هەموولایەکدا ڕۆیشت، بەغدا هێزی سەیاری پۆلیسی نارد ئەویش هەر باشارَی نەکرد و سەرکەوتن بوو بە بەشی [مەلا موستەفا]. ناچار حوکوومەت دادی بردە بەر عەسکەر، عەسکەر بە جبەخانە و هێزی تەواوە پەلاماری‌دا، دیسان هێزی مەلا، پەکی ئەمیشی خست و بە جارێ ئیتر حوکوومەتی بەغدا هەراسی پێ هەڵگیرا!. ناوچەکانی [ڕواندز] و [هەولێر] و [مووسڵ] وایان لێ‌هات لە ئیمڕۆ سبەیدا بوو کە لە دەست حوکوومەت دەرچن.

لەم بزووتنەوانەدا و لەم ئاوازانەدا هەموو کوردستانی «عێراق» خەبەریان بووەوە و هەموویان ڕووی دڵیان کردە [مەلا موستەفا] وە وڵاتی بەرزان. نەوەك هەر کوردەکان، بەڵکوو شۆڕش و سەرکەوتنی یەك لە دوای یەکی مەلا موستەفا دیواخانە سیاسیەکانی بەغدا و وڵاتەکانی جنووبی عێراقی پڕ کرد. تەنانەت حیزب و ڕۆژنامەکانی عێراقی لەم ڕووەوە، لەم شۆڕشە هەموو سەریان سڕما.

❋ ❋ ❋

حیزبێکی نهێنی کورد هەبوو بە ناوی «حیزبی هیوا»وە. ئەم حیزبە بە گەورەتر و بە، بەهێزتر تەنانەت حیزبە ئاشکراکانی عێراقیش دائەنرا، خوێندەوارانی کورد، ئەفسەران، سەرۆکەکانی عەشایر، کاربەدەستان لە ناو جغزی ئەم حیزبەدا بەشیان هەبوو. مەرکەزی حیزب لە بەغدا بوو، پەلی بۆ هەموو وڵاتەکانی کوردەواری هاویشتبوو، تەنانەت بۆ ئێران و [سووریا]ش. ئەتوانرێ بوترێ ئەم حیزبە تا ئەو تەئریخە لە گەورەتر حیزبێکی کوردی بووە.

حیزب، کە تێ‌گەیشت بزووتنەوەی [مەلا موستەفا] بزووتنەوەیەکی میللیە و مەبەستی ڕزگار کردنی کوردستانی گەورەیە بەبێ هیچ گیروگرفت و دوو دڵیەك پشتیوانی [مەلا موستەفا]ی کردو هەموو باوەڕی خۆی تەسلیم کرد و پاڵی پێوەدا. ئەمجا هات ئەمیش لە بەغدادا دەستی کرد بە ئیش‌کردن، بە زمان و بە نووسین و بە «بڵاوکراوە». بیروباوەڕی هەموو عێراقی تێ‌گەیاند کە بزووتنەوەی [مەلا موستەفا] بۆ لابردنی ئەو زوڵم و جەورەیە کە حوکوومەتەکانی عێراق لە شەعبی عێراقی ئەکەن. ئەمجا هات داخوازییەکانی کورد و «مەلا موستەفا»ی خستە سەر قاقەز و ناردی بۆ سەفارەتە بێگانەکان لە عێراقا کە ئەوانیش لەم ڕووەوە حوکوومەتەکانی خۆیان تێ‌بگەیەنن، هەروەها لە بن دەست ئەوانەشەوە حوکوومەتی عێراقی لە هەموو زوڵم و زۆرێك کەتا ئەو دەورە نواندوویە بەرانبەر بە کورد و بە شەعبی عێراقی تێ گەیاند. بە تایبەتی بەتەواوی گوێچکەی سەفارەتی بەریتانی زرنگاندەوە و داوای حوکوومەتێکی لامەرکەزی کرد بۆ کورد لە ژێر سێبەری ئەم بزووتنەوەی [مەلا موستەفا]دا.

ئەم بڵاو کراوانە و گورج‌وگۆڵی [حیزبی هیوا] لەم‌لاوە و پێش‌کەوتنی یەك لە سەر

یەکی هێزی [مەلا موستەفا] لەولاوە بە جارێ حوکوومەتی عێراقی و سەفارەتی بەریتانی بەغدای هێنایە سەر ئەوە کە گوێ قوڵاخ بوەستن و چاوی سەرسامی ببڕنە ئەم کارەساتە ناوەختە بەرانبەر بەوان ـ واتە ئینگلیز و حوکوومەتی عێراقی ـ.

ڕاستە ناوەخت بوو چونکە جۆش و گەرمەی شەڕی گەورەی دووهەم بوو، ئەڵمان لەولاوە وەکوو غەزەبی خوا ڕۆژ بەرۆژ لە پێش‌کەوتنا بوو. ڕووس هاوپەیمانی ئینگلیز بوو، تورکیا لەو ناوەدا بە بێ لایەنگری مابووەوە و نەیدابووە پاڵ کەس، ئەم مانەوەیە لەو ناوەدا بەو جۆرە ئینگلیز بەخێری خۆی نەئەزانی! لەوە ئەترسا ئەگەر تورکیا هەروا بمێنێتەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەوڵەتەکانی «محوەر» و نازی ڕووی لێ بنێن بە ناوی دۆستایەتی و دراوسێتیوە کە ڕێگەیان بدا بە وڵاتەکەی ئەوا تێپەڕن بۆ پەلاماردان بە سەر هاوپەیمانەکانا. وەکوو ئەمان ئەو ڕووەیان نا لە ئێران و ئێران سەرەتا ڕێی نەدان، پاشان بە «زۆر ئەزانێ قەواڵە لە کوێیە!.» ڕێگەیان بۆ خۆیان پێ کردەوە و داگیریشیان کرد!. ئەڵمانیش ئەو چەشنە بکا لەگەڵ تورکیادا، سەرەتا ڕێگەی نەدا و پاشان بەزۆر دایگرێ. ئەو وەختە ئەمانیش ـ واتە هاوپەیمانەکان ـ شتێکی وایان بە دەستەوە نییە کە بچن لە سەر تورکیا بکەنەوە و نەیەڵن «محوەر» لەوێوە پەلاماریان بدا. هەروەها هاوپەیمانەکان ناشتوانن سووراوسوور بە تورکیا بڵێن: تۆ وەرەلای ئێمە وە یا ئیعلانی شەڕ بکە لە سەر «محوەر». ناتوانن ئەمەی پێ بڵێن چونکە ئەو وەڵامیان بەوە ئەداتەوە کە حوکوومەتێکی سەربەخۆیە و قازانج و زیانی خۆی، خۆی ئەیزانێ و قازانجی لەوەدایە کە هەروا بەبێ لایەنگری بمێنێتەوە.

ئەم هەموو فیکرانە لە مێشکی ئینگلیزا دەوری ئەکردەوە و هەستانی [مەلا موستەفا] ی دیارە لەم وەختەدا بەخێر و چاکەی خۆی ـ واتە ئینگلیز ـ نەئەزانی. بۆیەش نەیئەزانی ئەیوت نەوەك تورکیا بکەوێتە سەر ئەو باوەڕە بڵێت: «بەرزان» لە خاکی عێراقایە و عێراقیش وا لە ژێر چنگی ئینگلیزا، کە مادام ئینگلیز لەم سەر سنوورەی منا ئەم شۆڕشە هەڵئەگیرسێنێ و شۆڕشێکی واش پێچەوانەی خێر و چاکەی منە، لە ڕقی ئەوا من ئەچم پاڵ ئەدەم بە «محوەر»ەوە!.

ئینگلیز کەوتبووە سەر ئەوە کە شۆڕشی «مەلا موستەفا» بووەستێنێ، بەڵکوو لە

وەستانی ئەم شۆڕشەدا تورکیا ئاگادار بێتەوە بەوە کە ئیعلانی شەڕ لەسەر «محوەر» بکا. واتە بەڵکوو ئەم پیاوەتییەی لە بەرچاوبێ کە لەبەر خێری ئەو شۆڕشێکی وا کە ئەو هەموو زیانەی هەیە بۆ تورکیا وەستانی!. خۆ ئەگەر لە ئاخرا «تورکیا» هەر سواری قسەی خۆی بوو ئیعلانی شەڕی نەکرد لەسەر ئەڵمانیا، ئەو وەختە ئەم دەست لەم وەستانی شەڕی «مەلا موستەفا»یە هەڵئەگرێ و ئەمجا چی ئەکا بیکا!.. هێنای لەبەر ئەمانە نامەیەکی بۆ «مەلا موستەفا» نووسی و وتی:

«پێویستە کە شەڕ بووەستێنی و دەستی لێ هەڵگری و لەگەڵ حوکوومەتی عێراقا رێکەوی ئەگەر خۆ هەر لەسەری برۆی مەعنای وایە ئەمە، تۆ شەڕ لەگەڵ بەریتانیا ئەکەی و ئەمەش پێچەوانەی خێر و چاکەی ئێمەیە!.».

حوکوومەتی عێراقیش لەچەشنی ئەم نامەی ئینگلیزە نامەی بەسەر هەموو دائیرەکانی ئەو دەورەدا بڵاو کردەوە کە «مەلا موستەفا» لە خۆڕایی بەیداخی ئەم یاخیگەرییەی هەڵکردووە. ئەبێ شەڕ بووەستێنێ و بێت داوای لێخۆش‌بوون لە حوکوومەت بکات.

کە مەلا ئەم نامە و بەیاننامانەی وەرگرت بە چاوەڕێ ئەوە کە بزانێ ئاخری کار چۆن ئەبێ فەرمانیدا بە وەستانی شەڕ و بە ئاگاداری‌کردنی ئەو شوێنانە کە تا ئەو وەختە کەوتبوونە ژێر چنگیانەوە.

❋ ❋ ❋

وەزارەت، وەزارەتی «نووری سەعید»بوو، کەوت و پاشان بڕیاردرا کە هەر ئەو دابنێتەوە، لە (١٩٤٣/١٢/٢٥)دا سەرلەنوێ بۆ جاری هەشتەم دایمەزراندەوە. چۆنیەتی وڵاتی کوردەواری و «مەلا موستەفای بەرزان» وا بە پێویست ئەزانێ کە یەکێکی کوردی کوڕی کوردی شارەزا بە وڵاتی [بەرزان] لە وەزارەتا بێت و بپلکێ بە ئیشی ئەوانەوە. لەم ڕووەوە گەلێ فیکر کرایەوە، لە ئاخرا باوەڕی نووری سەعید لەسەر «ماجد موستەفا» گیرسایەوە، بانگی کرد و هەموو شتێکی پێ‌وت. ماجد وا دیار بوو شارەزای «ئەدەبیاتی فارسی» بوو بۆیە لەو وەختەدا ئەم شیعرە فارسیانەی ئەخوێندەوە:

**آتش بەجان افروختن — از بهر جانان سوختن**

**باید ز من آموختن — کار من است این کارها!.**

بەڵام «پاشا»! بەڵێ ڕاستە کە من لە ساڵی (١٩٣٠)دا قایمقامی ئامێدی بووم و بە هەموو جۆرە شارەزای ئەو ناوچەیە هەم، وە ئەمەش ڕاستە کە من لەم دەوری دواییەدا موتسەڕیف بووم لە وڵاتەکانی جنووب و پاشان و پێنج ساڵ لە ئیش و کار دوور خرامەوە، ئێستە چۆن ئەبێ من بچم بۆ شوێنێکی وا و قسەبکەم و هیچ ناو و نیشانێکی حوکوومەتی بە منەوە نەبێ تا من بە پشتیوانی ئەوەوە قسە بکەم!. من وای بە باش ئەزانم کە بۆ ئەم ئیشە ئێوە وەزیرێکی تایبەتی دابنێن تا ئەو وەزیرە بە ناوی حوکوومەتەوە گفت بدا و هەموو کاروبارێك ببڕێنێتەوە. لام وایە ئەو وەزیرەش نابێ من بم، چونکە من لەبەر ئەوە کە بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە کار دەرهێنراوم ئیتر قانوون ئەو ڕێگەمە ناداتێ کە تا ماوەکەم بە سەرنەچێ من بچمەوە ئیشی حوکوومەت، ماوەش تازە پێنج شەش مانگی ڕۆیشتووە!.

«پاشا»، کە گوێ لەم قسە بەڕێوجێیانە بوو وتی: ئەوە تۆ ئەڵێی چی و قانوون ئەڵێ چی؟. قانوون چییە؟ من دان بە قانوونا نانێم، وەرە یەڵڵا وەزیر بە!. ئەمجا بە ناوی «وەزیری بیلا وەزارە» و بۆ ئیشی کوردەواری خرایە ناو لیستەی وەزیرەکانەوە.

ئینکار ناکرێ «ماجد موستەفا» پیاوێکی ڕووخۆشی وردبینی بازیکەری سیاسییە، ئەتوانێ لەسەر سێ چوار تەناف یاری بکا، لەوانەیە بە قسە و بە زەردەخەنە، ویستەی خۆی بە دۆست و دوژمنی بسەلمێنێ و تێبگەیەنێ کە ئەو ڕاست ئەکا!. لێرەدا حوکوومەت ئەوی هێناوە بۆ کاروباری کوردەکان، لەم وەختەدا واش چپێنراوە بە گوێشیا کە ئەمانە هەمووی یاری سیاسییە. لەولاشەوە «حیزبی هیوا» بە دەستەیەکی زۆر لە خوێندەوارانەوە پشتیوانی بزووتنەوەی «مەلا موستەفا»ن. ئەم خۆی نەچووەتە حیزبەکەوە، ناشیەوێ لەبەرچاوی ئەم حیزبە و کوردەکانەوە پیاوخراپ ببێ. کە واتە وەکوو کوردەکە ئەڵێ «دارێکی بە دەستەوەیە هەر دوو سەری..!»... زیاتر کە تێکڵاوی وەزارەتی «نووری سەعید» بووە ئەمە ئەوەندەیتر دوور نییە، دووریخاتەوە لە کوردەکان.

لەبەر ئەمانە ئەمەی بەلاوە لە هەموو شت ڕێکوپێکتر بوو کە بێنێ بەهەر جۆر بووە خۆی لە حیزبی هیوا نزیك خاتەوە بۆ ئەوە بەتەواوی بتوانێ ئەنجامەکانی پێك بێنێ!. بەڵێ خۆی نزیك خستەوە، بەڵام ئەم نزیكبوونەوەیە ئایا باوەڕی هەموو حیزبی

هیوای ڕاکێشا؟. بڕوا ناکەم ڕایکێشابێ، بەڵکوو [حیزبی هیوا] لە ژێرەوە دوو باوەڕی بۆ پەیدابوو؛ یەکێ لە لایەن هەندێکیانەوە ـ ئەوانەی کە شتی دووریان ئەخوێندەوە ـ بیروباوەڕیان ئەوەبوو کە تێکلاوبوونی «ماجد» لەم وەختەدا بە وەزارەتی نووری سەعید و نزیك‌بوونەوەی بەو جۆرە بێ پەردەییە لە کاروباری «بەرزان» و کورد و «حیزبی هیوا»، ئەیانوت ئەم کاسەیە بێ‌ژێر کاسە نییە!.

باوەڕی دووهەمیش لە لایەن هەندە کەسی‌ترەوە، ئەوە هەر ڕواڵەت‌پەرستی بوو هیچی‌تر؛ واتە لەبەر ئەوە ماجد وەزیرە خۆشەویستە، نەوەك «ماجد» ئەگەر بەردێکیش وەزیر بوایە هەر خۆشەویست ئەبوو!. کە وابوو ئەم دەستەیە بڕوایەکی وا نەئەکرایە سەر بیروباوەڕەکەیان، چونکە لە غەیری ئەو دەورەشا هەر وەزیرێکی کورد هاتووە ـ با هەر جۆر بووبێت ـ هەر خۆشەویستی ئەو دەستەیە بووە!..

«ماجد» لە پاش ئەوە کە نزیك بووەوە لە حیزبی هیوا و لە پاش ئەوە کە پێی‌وتن من لەبەر قازانجی کورد ئەم وەزارەتەم وەرگرتووە، داوای لە حوکوومەت کرد کە سێ ئەفسەری کورد لە ئەفسەرەکانی عێراق بە ناوی «زابتی ئیرتیبات»ەوە بنێرێ بۆ وڵاتی [بەرزان]، حوکوومەتیش بڕیاری داخوازییەکەی دا. ئەمجا بە حیزبی وت ئێوە سێ ئەفسەر لە خۆتان هەڵبژێرن و بێت تا قسە بکەین. حیزبی هیوا ئەمەی زۆر پێ‌خۆش بوو. «ئەمین ڕواندزی، عیزەت عەزیز و سەید عەزیز سەید عەبدوڵڵا»ی هەڵبژارد و ناردنیە لای ماجد. ماجد لە پاش قسەو گفتوگۆ لە گەڵیانا هەرسێکیانی بە ناوی «زابتی ئیرتیبات»ەوە نارد بۆ مێرگەسوور کە چاویان بە «مەلا موستەفا» بکەوێ و قسەی لەگەڵ بکەن. لەم لاشەوە حیزب دیسان خەبەری دا بە «مەلا موستەفا» کە ئەفسەرەکانی خۆمانن ـ واتە حیزبی هیوا ـ هاتوون بۆ لات، بوخچەی دڵت بەتەواوی بۆیان بکەوە.

کە ئەمانە ڕۆیشتن و پاش چاوپێ‌کەوتنی «مەلا موستەفا» و قسەکردن لەگەڵیا فیکری هەردوولایان هاتە سەر ئەوە کە داخوازییەکانی مەلا موستەفا ئەمانەی خوارەوە بێ. کە ئەمانە جێ‌بەجێ کران ئەو وەختە ئەویش چەك فڕێ ئەدا:

(١ـ دروست‌کردنی وڵاتێکی تایبەتی کوردستان کە بێ بە پێنج لیواوە؛ کەرکووك، هەولێر، سولەیمانی، خانەقی، دهۆك.

٢ـ دانانی وەزیرێکی کورد هەموو وەختێك لە وەزارەتا بۆ ئەوە کار و فرمانی ئەم وڵاتانەی کورد ببینێ.

٣ـ دانانی کوردێك بە معاونی وەزیر لە هەموو وەزارەتەکانا.

٤ـ زمانی کوردی ببێ بە زمانێکی ڕەسمی و لایەنی ئابووری و کشتوکاڵی وڵاتی کوردستانیش بەتەواوی ڕێکوپێك بکرێ. بەڵام لایەنی سەرباز و پۆلیس و دارایی ئەوە هەر وەکوو خۆی بمێنێتەوە.)

ئەم داخوازییانە لە لایەن هەموو سەرۆك عەشرەتەکانیتر و حیزبی هیواوە پەسەند کرا و دران بە حوکوومەتی عێراقی و بە ئینگلیز.

پاش گەیشتنی ئەم داخوازییانە بڕیار درا کە «ماجد موستەفا» بچێت بۆ «بەرزان» و ڕووبەڕوو لەگەڵ [مەلا موستەفا]دا بکەونە قسە لە ئیشی کورد و بە جۆرێکی جوان بیبڕێننەوە.

شەوی (١٩٤٤/١/٧) شەوێکی سەیر بوو لە بەغدا لە سەر ئێستگەی شەمەندەفەری کەرکووك. [ماجد موستەفا] بۆ خزمەتی کوردایەتی ئەچوو بۆ [بەرزان]! هەچ کوردێك هەبوو لە بەغدادا بەهەموو قوتابی دانشکەدەکانەوە هاتبوون بۆ ئێستگە بۆ ڕەوانەکردنی «ماجد موستەفا» چونکە بۆ ئیشی کوردایەتی ئەچێ!. ئەم کۆبوونەوە و ڕەوانەکردنەش بە قسەی «حیزبی هیوا» بوو.

ماجد ڕۆیشت و لەگەڵ مەلا موستەفادا لە «مێرگەسوور» چاویان بە یەك کەوت و لەسەر ئەم شتانەی خوارەوە ڕێك‌کەوتن و پاش حەفتەیەك گەڕایەوە بۆ بەغدا. شتەکانیش ئەمانە بوون:

(١ـ گێڕانەوەی [شێخ ئەحمەد] و ئەوانەی لەگەڵیان بۆ بەرزان.

٢ـ چوونی «مەلاموستەفا» بۆ بەغدا بۆ ئەوە بە دەستەوەدانی خۆی بنوێنێ.

٣ـ کاروباری دایەرەکانی [بەرزان] ئەو کاربەدەستانە ببینن کە بە پیاوچاکی ناوبانگیان دەرکردووە.

٤ـ کردنەوەی قوتابخانە و دروست‌کردنی جادە و چاوێری‌کردنی باری ئابووری و تەندروستی لە وڵاتی بەرزان.)

[ماجد] ئەمانەی کرد بە نووسراوێك و لیژنەیەك هەر بۆ کاروباری بەرزان لە پێشترا حوکوومەت دایناب‌وو. نووسراوەکەی ماجد و لەسەر بڕیارەکەی لیژنە، دیوانی وزەرا لە (١٩٤٤/١/٢٥)دا باوەڕی هاتە سەر ئەم شتانە:ـ

(١ـ ئیدارەیەکی تازە لە قەزاکانی زێبار، ڕواندز، ئامێدی، دەوروبەری [مێرگەسوور]، شیروانی مەزن و بەرزان دروست بکرێ و کاربەدەستانی باشی بۆ دابنرێ، ئەگەر پێویستیش بوو بە ناوی «زابتی ئیرتیبات»ەوە ئەفسەریان بۆ بنێرێ.

٢ـ دروستکردنی نوختەی پۆلیس لە هەموو ئەو وڵاتانەدا، لە خەڵیفان و ڕێزانەوە تا دیانە و کانیڕەش.

٣ـ کردنەوەی ڕێگە لە بەینی نوختەکاندا.

٤ـ دوورخستنەوەی «مەلا موستەفا» لە وڵاتی «بەرزان».

٥ـ گێڕانەوەی [شێخ ئەحمەد] و بەرزانیەکان بۆ بەرزان، هاتنی «مەلاموستەفا» بۆ بەغدا بۆ خۆبەدەستەوەدان. بەڵام بڕیار لە سەر ئەم دووشتە واتە ـ چوونی شێخ و هاتنی مەلا ـ ئەمە ئەکەوێتە دەست وەزارەتی داخلیە وە یا [وەزیری بیلا وەزارە]، هەر وەخت ویستیان بڕیاری لەسەر ئەدەن!.

٦ـ ئەوشتانە کەوا [مەلا موستەفا] و هاوڕێکانی لە حوکوومەتیان داگیر کردووە لەگەڵ چەکەکانی خۆیانا بیاندەنە دواوە بە حوکوومەت.

٧ـ حوکوومەت ڕازی بێ بەوە کە موافقە بکا بۆ لێخۆش‌بوونی گشتی لە بەرزانیەکان بێجگە لە چەك هەڵگرەکان و ئەو کاربەدەستانە کە لە حوکوومەتدا بوون و پاشان چوونەتەلای «مەلا موستەفا». ئەمەو کاتێ لێخۆش‌بوونەکەشی ئەوە حوکوومەت خۆی ئەیزانێ، هەر وەخت ئارەزووی کرد ئەو وەختە بڵاوی ئەکاتەوە!.

٨ـ هەر وەزارەتێك چی لە ئەستۆدایە جێ‌بەجێ بکا.)

لەم کاتەدا [ماجد] ڕووی کردە حوکوومەت و حیزبی هیوا کە ئەفسەرە ئیرتیباتەکان کەمن، ئەبێ زیاد بکرین و هەموویش ئەبێ لە «حیزبی هیوا» بن. بەڵێ با زیاد بکرێن!. ئەمجا بە باوەڕی هەر سێ لا ـ واتە حوکوومەت، ماجد، حیزبی هیوا ـ ئەمانەی خوارەوە هەڵبژێران و نێران بۆ شوێنەکانی خۆیان!:

(١)ـ فوئاد عارف زابتی ئیرتیباتی پشدەر. (٢) مەجید عەلی زابتی ئیرتیباتی ئامێدی (٣) سەید عەزیزی سەید عەبدوڵلا بۆ مێرگەسوور و برادۆست. (٤) ئەمین ڕواندزی بۆ ڕواندز و بەرزان. (٥) میرحاج ئەحمەد بۆ ئاکرێ. (٦) موستەفا خوشناو بۆ بەرزان. (٧) عیزەت عزەیز بۆ بلە.

هەروا هەندێ شتیش وەکوو ڕێگە و مێگە و شتە بۆ دەست بڕین لە وڵاتی «بەرزان» کرا!. پاشان شێخ ئەحمەدیش لە [حلە]وە هێنرایەوە بۆ «بەغدا» و برایەوە بۆ «حلە» و پاش چەند ڕۆژێکی‌تر هێنرایەوە بۆ بەغدا و لە (١٩٤٤/٢/١٢) نێرایەوە بۆ [بەرزان].

لە (١٩٤٤/٢/٢٢)دا «مەلا موستەفا» هات بۆ بەغدا بۆ ئەوە پێشانی حوکوومەتی بدا کە خۆی‌داوە بە دەستەوە، لە ئوتێلی «شط العرب» دابەزی‌بوون. ئەمانە بە چەکەوە بە ناوشارا ئەسووڕانەوە، هەندێ لە ڕۆژنامە بەکرێ‌گیراوەکانی ئەو سەردەمە کەوتنە تەقەکردن کە چۆن ئەبێ مەلا و پیاوەکانی بە چەکەوە بەسەر جادەکانا بسووڕێنەوە؟ ئاخر نازانن خەڵکی زەنەقی ئەچێ!!. حوکوومەتیش ئەم قسانەی چووبوو بە گوێچکەدا، لە پاش حەفتەیەك مەلا وای بە باش زانی کە بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆی و ئیتر گەڕایەوە.

لەم ماوانەدا [ماجد] لەگەڵ هەموو لایەك قسەی ئەکرد؛ لەگەڵ حوکوومەت، حیزبی هیوا، مەلا موستەفا، سەرۆکی عەشایرە کوردەکان. لە هەموویانی وا ئەگەیاند ـ بێجگە لە دەستەی حوکوومەت ـ کە ئەم هاتوچوو و کۆششەی بۆ خزمەتی کوردە!. بەم ناوەوە و لەبەر ئەمانە زۆر چاك لە کوردەکان نزیك کەوتبووەوە، وە بەڵکوو بووبوو بە هێلانەی بڕوای گەلێ کەس!.

تەنانەت بۆ ئەوە کوردایەتییەکە بەتەواوی سەربگرێ لە مارتی (١٩٤٤)دا لەگەڵ «نووری سەعید»ی سەرۆك وەزیر چوون بۆ کەرکووك، لەوێ زۆرێکی زۆر لە پیاوماقووڵ و سەرۆك عەشرەتەکانی کورد کۆکرابوونەوە لە «یانەی کاربەدەستان» نووری سەعید لە گەڵیان کەوتە قسەکردن و وەکوو مامۆستایەکی دڵسۆز فێری ئەوەی ئەکردن کە چۆن کوردایەتی بکەن؟! و چۆن داوای حقووقی کورد بکەن؟ و چۆن ئەگەر حوکوومەت بە پوختی لەگەڵیان نەهاتە پێشەوە دەست بنێنە بینا قاقەی؟! لە ڕاستیدا ئەم کۆبوونەوەیە زۆر سەیر بوو!!. هەر زۆر سەیر بوو!!.

ئەم کردەوانەی «ماجد» و ئەم جۆرە هاتوچووکردنەی بۆ کوردایەتی بەتەواوی دڵی حیزبی هیوای کرد بە دوو کەرتەوە؛ کەرتێکی هەر لەسەر ئەو باوەڕەبوون کە ئەم ئیشانەی بۆ کوردایەتییە کەرتکەی‌تری ئەیانوت مافی بە کوردایەتییەوە نییە و خزمەتی حوکوومەت ئەکا. ئەم جۆرە دوو دڵییەبوو، کەبوو بە بناغە بۆ تێکچوونی [حیزبی هیوا] و نەکەوتنەوە سەر خۆی، بۆیەش وای لێ‌هات ڕۆژ بەرۆژ شتی‌تری ئەهاتە سەر.

* * *

لە جۆشی گەرم و گوڕی ئەم کوردایەتیەدا؛ واتە لە [٧ی نیسانی ١٩٤٤]دا کوتوپڕ نووری سەعید وەزارەتی دایە دواوە و کابینەکەی کەوت. ئەم کەوتنە ناوەختییە دڵی کوردەکانی لە زۆر لاوە کرمێ کرد، کە ئەو قسانەی پێشوو لەچی و ئەم کەوتنە ناوەختییە لەچی؟!.

لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە ناوی وەکالەتەوە مانەوە تا لە [٣ی حوزەیرانی ١٩٤٤]دا «حەمدی پاچەچی» بۆ جاری یەکەم وەزارەتی لەو وەرگرت و خستیە ژێر دەستی خۆیەوە، دیارە ماجدیش لە وەزارەت دەرچوو. ئیش وردە وردە سەرەولێژی ڕووی تێ کرد!.

مەسەلەش عیبارەت بوو لەمە، کە! شەڕی گەورەی دووهەمی گێتی بۆنی ئەوەی لێ هات کە لە دوایی هاتنە، بە تایبەتی - وەکوو لە پێشەوە باسکرا - ئەو ئامانجەی کە ئینگلیز هەیبوو بەرانبەر بە تورکیا ئامانجەکەی پێك هات؛ پێك‌هاتنێکی وا، نەوەك هەر ئەوەندە کە تورکیا نەداتە پاڵ ئەڵمانیا، بەڵکوو دایە پاڵ ئینگلیز و ئیعلانی شەڕی لەسەر «محوەر» کرد!. ئیتر چە ئامانجێك لەمە خۆشترە بەرانبەر بە ئینگلیز؟!. کە مەسەلە وای لێ هات ئیتر پێویست نییە کوردەکان کوردایەتی بکەن چونکە بۆ ئینگلیز بڤەیە!. نووری سەعید و ماجد موستەفاش وتوویانە بیکەن، کەواتە هیچ چار نییە غەیری ئەوەنەبێ کە کابینە بکەوێت و کابینەی دوایی چی ئەکا ئەوە ئارەزووی خۆیەتی!.

لەڕاستیدا کە وەزارەتی پاچەچی هاتە پێشەوە وردە وردە توند و تیژی دەستی پێ کرد؛ حیزبی هیوا باوەڕیان بەوە هێنا کە کوردایەتیەکەی دەوری نووری سەعید و ماجد موستەفا گاڵتەیەکی سیاسی بوو، جا ماجد خۆی لە باوەڕی خۆیا هەر نەهادێکی بووبێ خەڵکەکە کەوتنە سەر ئەو مەفکوورەیە کە هاتنی ئەو زیانی بە «حیزبی هیوا»

گەیاند. زابتە ئیرتیباتەکان ئیش و کارەکانیان دوایی پێ هێنرا و بەڵکوو هەندێکیان هەر نەهێنرانەوە بۆ سوپا، تازە وەزارەت بڕیارەکانی وەزارەتی پێشوو بەرانبەر بە کورد و بە «بەرزان» بە پوولێك نەکڕی، بەڵکوو وەزارەتی جەنگ خۆی کەوتە تەقە لەو ئەفسەرانە کە لە وەزارەتی پێشوودا بە ناوی زابت ئیرتیباتەوە نێراون بۆ کوردەواری. بە کورتی کوردایەتیەکەی «نووری سەعید» و «ماجد موستەفا» وەکوو سەرچۆپی جوولەکە بەرەودوا ئەگەڕایەوە!!..

ئەفسەرەکان کە ئیشی «بەرزان» و وڵاتی کوردەواریان دوایی هات هاتنەوە بۆ بەغدا. «میرحاج» و «موستەفا خۆشناو» کە سەیریان کرد کاروباری حیزبی هیواش تێکچووە لەم ڕووەشەوە دڵگرانییەکی زۆریان پەیدا کرد، لەگەڵ «عیزەت عەزیز» هەریەکە دوو مانگ ئیجازەیان وەرگرت، «میرحاج» و «موستەفا خۆشناو» چوون بۆ وڵاتی موکریان بۆ چاوپێکەوتنی کۆمەڵەی «ژ.ك»- کە لەو دەورەدا لەو وڵاتە ناو و ناوبانگێکی پەیدا کردبوو- بۆ ئەوە هەر دوو کۆمەڵە کۆششی خۆیان بکەن بەیەك بۆ ئازادکردنی کوردستانی گەورە. «عیزەت عەزیز»یش چووبۆ سووریە، ئەویش بۆ ئەوە لەگەڵ کۆمەڵەی «خۆیی بوون»دا یەك بگرن و تەقەلایان بکەن بەیەك. دیارە چوونی ئەمانە بۆ هەر دوو شوێنەکە دوور نەبوو بە ڕا و تەگبیری «حیزبی هیوا» بۆبێت.

ڕۆیشتنی ئەمانە دڵی حوکوومەتی لە عاستیان کرمێ کرد بە تایبەتی لە عاستی «میرحاج» و «موستەفا خۆشناو»، ئەمانیش تۆزێ لە باوەڕی حوکوومەت بەرانبەر بە خۆیان تێگەیشتن. بڕیاریان دا کە «میرحاج» بگەڕێتەوە بۆ بەغدا و موستەفا لە بەرزان بێ بۆ ئەوە ئەگەر شتێکی خراپ ڕوی دا با هەر دووکیان تووش نەبن و «میرحاج»یش ڕۆژ بە ڕۆژ موستەفا لە دەنگوباسی بەغدا ئاگادار بکا.

لەسەر ئەم پەیمانە لەیەك جیا بوونەوە، «میرحاج» کە هاتە بەغدا بۆنی هیچ شتێکی خراپەی بەرانبەر بە خۆیان نەکرد و بە پێچەوانەی ئەوە چووەوە سەر ئیش و کاری ئەفسەری و نامەشی بۆ موستەفا نووسی کە ئەویش بێتەوە. موستەفاش هاتەوە تا نزیکەی مانگێك هەر دووکیان چوونەوە سەر ئیش. کوتوپڕ هەردووك لە لەشکر دەرکران و میرحاج گیرا و نێرا بۆ «عەمارە»، موستەفاش بڕیاردرا کە بگیرێ، بە ڕێکەوت

لەو وەختەدا لە مووسڵ بوو، لە لایەن هەندێ لە دۆستانەوە ئەم خەبەرەی پێ‌درا. هەر لەوێوە خۆی گەیاندەوە «بێتواتە»و نەبوو بە دارەوە.

«عیزەت عەزیز»یش کە چووبوو بۆ سووریە و لەوێشەوە بۆ «میسر» وا لە وەزارەتی جەنگ گەیەنرا کە بۆ چاوپێ‌کەوتنی کوردەکانی ئەوێ و قسەکردن لەگەڵیانا چووە، دیارە فیکری گیرانی ئەویش کرا بەڵام هەرکە گەیشتەوە بەغدا بەم حاڵەی زانی و لە پاش چاوپێ‌کەوتنی هەندێ کەس لە بەغدا و کەرکووکدا خۆی گەیاندەوە «بەرزان» و خەبەری بۆ «موستەفا خۆشناو» نارد کە ئەویش بچێت بۆ بەرزان. پاش مانەوەی (٤٥) ڕۆژ لە «بێتواتە» ئەویش خۆی گەیاندە «بەرزان».

* * *

دیارە لە تێکچوونی کاروبارەوە تا ئەم تەئریخە ماوەیەکی باشی خایان. هەندێ لە ئەفسەرەکان ئەوەبوو لە [بەرزان] کۆبوونەوە، «بەکر عەبدولکەریم» ـ کە ئەویش یەکێك بوو لە ئەفسەرە ئازادەکان و وەکوو عیزەت و ئەوان پەڕاگەندە بووبوو ـ لە بەرزان لەگەڵیان یەکی گرت. بە موحەممەد مەحموودەوە ـ کە لە پاشا چوو ـ ئەوەندە ئەفسەر لە «بەرزان» کۆبووەوە:

(١) موستەفا خۆشناو. (٢) عیزەت عەزیز. (٣) عەبدولحەمید باقر. (٤) موحەممەد مەحموود. (٥) شەوکەت نوعمان. (٦) ئەحمەد ئیسماعیل. (٧) بەکر عەبدولکەریم. (٨) «حفظُ اللّه» ئیسماعیل.

ئەمانە بێجگە لە «موحەممەد مەحموود» کۆمەڵێکیان لە ژێر سەرۆکی «مەلا موستەفا»دا داناو ناویان نا «کۆمەڵی ئازادی». هێنایان بەیاننامەیەکیان نووسی کە عیبارەت بوو لە:

داخوازەکانی کورد و مەبەست لە شۆڕشی «بەرزان». ناردیان بۆ سەفارەتی ئینگلیز لە بەغدا و بۆ حوکوومەتی عێراقی و بۆ «حیزبی هیوا».

حیزبی هیوا کە ئەم بەیاننامەیە پێ‌گەیشت وەکوو بڵێت لە خەو خەبەری بووەوە و لە (١٩٤٥/٢/١٠)دا بڕیاریان‌دا کۆششی خۆیان سەرلەنوێ لەگەڵ [بەرزان ]بکەنەوە بەیەك و مەبەستەکەیان خستە سەرقاقەز و بە «موحەممەد مەحموود»دا ناردیان بۆ

[مەلا موستەفا]. دەستەی بەرزان كە سەیری گورجوگۆڵی حیزبی هیوایان كرد لە ڕۆژی (١٩٤٥/٢/١٢)دا كۆبوونەوە و ئەم بڕیارانەیان دا:

(١) یەك بوونی هەموو عەشایری كوردەواری.

(٢) ڕێكوپێككردنی هێزی چەكدار.

(٣) ڕزگاركردنی كوردستانی «عێراق» لە زوڵم و جەور، بەڵام لە ڕێگەیەكی سیاسی هێمنەوە.

(٤) داخوازە سیاسییەكانیان بگەیەنن بە سەفارەتەكان.

(٥) یەك گرتن لەگەڵ كۆمەڵە ئازادی خواهەكانی كورددا.

(٦) بەهۆی چاپەوە پڕوپاگەندەكردن بۆ خۆیان.

(٧) بەربەرەكانێ كردنی سیاسەتی ئیستعماری عێراق.

ئەمجا ماوەیەكی باش هەیئەتی بەرزان و [حیزبی هیوا] لەبەینی یەكا كەوتنە قاقەز نووسین و ڕێگە بەیەك پیشاندان و ئاگادار كردنی سەفیر بێگانەكان لە حاڵ و ئەحواڵی كورد و لە چۆنیەتی مەبەستی «بەرزان». حوكوومەتیش لەم لاوە بەهەر جۆر و لەهەر ڕێگەیەكەوە بوو، خەریكی كارقایمی خۆی بوو، بەڵكوو ئاگاداری هەموو كوردەكانی دەستەی بەرزان و [حیزبی هیوا]ش بووا.

كوتوپڕ لە سەرەتای مانگی مارتی (١٩٤٥)دا خەبەرێك لە حیزبی هیواوە بە بەرزان گەیشت كە فەوجی (٤)ی عێراق كە لە «باپشتیان»ە ڕۆژی پێنجی مانگ فیكری پەلاماردانی هەیە، ئاگادار بن!.

كە ئەم خەبەرە وەرگیرا ئەمانیش قایمكاری خۆیانیان كرد و بەم جۆرەی خوارەوە خەتی شەڕیان دامەزراند:

خەتی بەشی ڕۆژهەلات: «شێتنە، مێرگەسوور، ناوچەی برادۆست» لە ژێر فەرماندەیی «موستەفا خۆشناو» و «موحەممەد مەحموود»دا.

خەتی بەشی ڕۆژئاوا: «ئامێدی و ناوچەی ڕێكانی» لە ژێر فەرماندەیی «عیزەت عەزیز» و «عەبدولحەمید باقر»دا.

خەتی جنووب ناوچەی «ئاكرێ» لە ژێر فەرماندەیی «شێخ سلیمانی»ی «شێخ عەبدوسەلام»دا.

ئەمانە هەموو شوێنەکانی خۆیانیان گرت و بە هەموو جۆر خۆیان ئامادەکرد بۆ گێڕانەوەی ئەو هێرشانە کە بەسەریانا ئەگەر بکرێ. لەگەڵ ئەمەشا فەرماندەی گشتی - موستەفا بەرزانی - دەستووراتی پێدابوون کە تا ئەتوانن بە هێمنی بزووونەوە و ڕێگەی ئاشتی بگرن. وە لە (٤)ی مانگدا ئەم نامەشیە بۆ سەرۆکی هەموو سوپای ئەو ناوەی عێراق - ڕەفیق عارف نووسی:

«... وەکوو بۆمان دەرکەوتووە فیکرتان وایە ڕۆژی (٥)ی مارت بە ناوی مەشق و مناوەرەوە لە شوێنی خۆتان پێشکەون. لە ڕووی ئەم فرمانەی ئێوەوە ئەگەر هەر زیانێك ڕووی‌دا ئۆباڵ لە ئەستۆی ئێمەدا نییە!.».

لە ڕۆژی دوایی‌دا وەڵامی سەرلەشکر هاتەوە کە ئەمان هیچ ئەو نیازەیان نییە پێشکەون.. دیاربوو پێش دەستی کردنی دەستەی [بەرزان] سەرۆکی لەشکری عێراقی هێنابووە سەر ئەو قسەیە کە گۆیا ئەوان فیکری هیچیان نییە!.

ڕۆژی (٧)ی مانگ [موحەممەد مەحموود] بە فەرمانی سەرۆکی گشتی نێرا بۆ ناوچەی «برادۆست» و «باڵەك» بۆ کاروباری هەندێ فەرمانی ئەو ناوە. کە چوو و هاتەوە ئەو ڕێگەیە بۆ فەرماندە دانا کە خۆی بچێت و لەو ناوەدا گەشتێك بکاو ئەگەر ناکۆکییەك لە بەینی عەشایرەکانا هەبێ لای‌بەرێ و دیدەنییەکێشیان بۆ تازەکردنەوەی پەیمان لەگەڵ بکا. فەرماندە قسەکانی بیست و پاش ئەوە کەوتە گەڕان. ڕۆژی (١٣)ی مانگ فەرماندە چوو بۆ خەتی ڕۆژهەڵاتی لەشکری خۆی، ڕۆژی (٢٤) لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی خۆیانا چوون بۆ «هەودیان».

بزووتنەوەو قایمکاری [بەرزان] بەتەواوی بڵاو بووەوە، حوکوومەتی عێراق و ئینگلیز ئاگایان لە هەموو کەین‌وبەینێك پەیدا کردبوو. بە تایبەتی ئینگلیز کە ئیشی لە هەموو لایەکەوە بۆ ڕێك کەوتبوو، لەمانەوەی ئەم کارەساتی بەرزانە بەم جۆرە وەکوو مووی لووتی هەڵکێشن وابوو!. لەبەر ئەمە خەبەردرا کە ڕۆژی (٢٥)ی مانگ «کاپتان ستوکس» موشاوری سیاسی ئینگلیز دێت بۆ «هەودیان» بۆ چاوپێ‌کەوتنی [مەلا موستەفا]. فەرماندە لەوێدا مایەوە و «ستوکس»یش هات. ئەنجامی قسە ئەمە بوو کە، ستوکس وتی:

«لەبەر ئەوە نەیرووی عێراق ناشارەزای هەندێ کاروباری شەڕن، نەیرووی ئینگلیز

بڕیاری داوە لە نزیکی ئەم وڵاتی بەرزانەوە عێراقییەکان فێری ئەو جۆرە شەڕە بکات و ئەمەش غەیری مەشق‌کردن و مناوەرە نەبێ هیچی‌تری تێدا نییە، نابێ ئێوە بکەونە پەرۆشەوە بۆی، کەوابوو پێویستە فەرمانەکانی حوکوومەتی عێراق وەربگرن و ئەو ئەفسەرە کوردانە کە لە لای ئێوەن و ئێستە لە خەتی شەڕدان بچنەوە بۆ [بەرزان] و شەڕ و شۆڕ بەجێ بێڵن، هەر شوێنێ کە خۆیان ئارەزوو ئەکەن لە عێراقا تێدا دانیشن و پاشان لەگەڵ ئەو ئەفسەرانەدا کە هەر هێشتا لەبەرزانن هەموو بچنەوە لای حوکوومەت و بچنەوە سەر ئیشی خۆیان لە نەیرووی عێراقا!.».

ئەم قسە لووسانە وا دیار بوو فەرمانـدەی لە خشتە نەبرد!. بەڵکوو پێی‌وت: «ئێمە دوو شتمان لە پێشە؛ یا مردن، یا ئازادی کورد. چونکە بۆمان دەرکەوتووە کە حوکوومەت وەنەبێ نیهادێکی باشی لەگەڵ ئێمەدا هەبێ، تا ئێستە هەزار قسەی کرد و هیچی بە ئەنجام نەگەیاند. چوونەوەی ئەفسەرەکانیش ئەوە کەوتۆتە دەست وەزارەتی جەنگ، ئەگەر بە ئاسانی لەگەڵیان بیزوێتەوە ئەچنەوە، بۆچ ناچنەوە؟.» پاش ئەم قسانە ستوکس گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی.

ڕۆژی (٣٠) مانگ موتەسەریفی هەولێر - سەعید قەزاز - لەگەڵ مودیری پۆلیس چوون بۆ «مەزنە» هەر بۆ چاوپێکەوتنی فەرماندە، لەبەر ئەوەکە لە وەڵامەکەی ستوکس زیاتریان وەرنەگرتەوە، گەڕانەوە بۆ هەولێر و فەرماندە و ئەفسەرەکانیش چوونەوە بۆ «شێتنە».

ڕۆژی (٣١)ی مانگ نامەیەك لەلایەن ڕەئیس عەشیرەتەکانی «باڵەك»ەوە گەیشتە دەست فەرماندە کە ئەیانەوێ بێن بۆ دیدەنی و بۆ پەیمانی زیادە ئاشنایی. فەرماندە گوندی «شێتنە»ی بۆ دانان. هاتن و چاویان بە یەك کەوت و گەڕانەوە. لە ڕۆژی [٢ی نیسانی ١٩٤٥]دا نامەیەك لە لایەن ئامر فەوجی ڕواندزەوە درایە دەست فەرماندەی لەشکری [بەرزان] کە «ڕۆژی (٥)ی مانگ «مێجەر مور» موشاوری سیاسی «مووسڵ» ئەیەوێ بێت بۆ لاتان و لە [بلە] چاوی پێتان بکەوێ. بەوبۆنەوە ئەگەر ڕێك ئەکەوێ ئێوە و [شێخ ئەحمەد] و هەموو ئەفسەرەکان بچنە [بلە] بۆ ئەم چاو پێ‌کەوتنە». ڕۆژی پێنج ئەمان هەموو لە [بلە] کۆبوونەوە بەڵام «مور» نەهات!.

دیسان ڕۆژی (٢٠)ی نیسان خەبەرێك لە لایەن موتەسەڕیفی هەولێرەوە درا بە [مەلا موستەفا]ی فەرماندار کە «مێجەڕ مور» ئەیەوێ لە [حەریر]ـ عیزەت عەبدولعەزیز ـ ی چاو پێ بکەوێ. فەرماندار دەستووری‌دا بە عیزەت کە لەگەڵ [موحەممەد مەحموود] بچن بۆ ئەو چاو پێ‌کەوتنە. تا ئەمان چوون گۆیا [مور] چووبوو و گەڕابووەوە، ئیتر یەکتریان نەبینی!.

ڕۆژی (٢٢)ی نیسان دیسان لە لایەن مودیری ناحیەی «باتاس»ەوە خەبەر درایەوە بە فەرماندار کە «ئیسماعیل نامق» وەزیری جەنگ ئەیەوێ عیزەت عەبدولعەزیزی لە «پیرمەم» چاو پێ بکەوێ. فەرماندار فەرمانی دایەوە بە [عیزەت عەزیز] کە لەگەڵ [موحەممەد مەحموود] بچن بۆ پیرمەم و ئەم چاو پێ‌کەوتنە بکەن. تا ئەمان چوون [ئیسماعیل نامق] گەڕابووەوە بۆ بەغدا، [ساڵح سائب] سەرۆکی هەموو لەشکری عێراق لەوێ بوو، ئەو لەباتی وەزیری جەنگ تا چوار سەعاتێك بە بێ‌دەنگ لەگەڵ [عیزەت عەزیز] قسەیان کرد، بە مەرجێك کە هەر دوو، هەر دوو بە دوو بوون! تەنانەت [موحەممەد مەحموود]یشیان لەگەڵ نەبوو. ئێستەش نەزانرا قسەوباسی دانیشتنی ئەو دوو کەسە چی بوو؟!.. ئەوەندە هەبوو، عیزەت کە لەلای ساڵح سائب دەرچوو وتی کاروبارێکی پاش هاتۆتە پێشەوە ئێمە ئەتوانین بە بێ‌ترس بچین بۆ هەولێر و لەگەڵ [حیزبی هیوا]دا هەندێ قسەوباس بکەین. هەر لەو کاتەدا لەگەڵ [موحەممەد مەحموود] ڕووبەڕووی هەولێر بوونەوە و ئەم باسی گەڕانەوەی خۆیانە ـ واتە ئەفسەران ـ بۆ نەیرووی عێراق خستە بەردەستی حیزب. هیواش ئاخر قسەی هاتە سەر ئەوە کە ئەوان خۆیان سەربەستن بۆ گەڕانەوە وەیان نەگەڕانەوە.

هەر لەو سەروبەرەدا [مێجەڕ ولسن] موعاونی موشاوری سیاسی کەرکووك ـ یش هاتبووە هەولێر فیکری «حەریر»ی هەبوو، عیزەت و موحەممەدیش ئیشی خۆیان لە حیزبی هیوای هەولێر جێ بەجێ کردبوو ئەوانیش ئەیانویست بگەڕێنەوە، لەگەڵ [ولسن] هەر سێکیان لە ئۆتۆمۆبیلێکدا چوون بۆ «حەریر». کە چوونە ئەوێ زۆری پێ نەچوو [مێجەڕ مور]یش گەیشتە حەریر. [عیزەت عەزیز] توانی چاو پێکەوتنێکی دووبەدوویش لەگەڵ [مور] پێك بێنێت!.

ڕۆژی (٢٥)ی نیسان [مور، عیزەت عەزیز و موحەممەد مەحموود] چوون بۆ بەرزان، [مور] ئەیویست [شێخ ئەحمەد]ی چاو پێبکەوێ چونکە چوونەکەی بۆ ئەوەبوو. کە چوون، ئەو چووە لای شێخ ئەحمەد و پێی وت: «سەفیری بەریتانیا ئەڵێ ئەبێ فەرمانی حوکوومەتی عێراق بەجێ بێنن و چەکەکانتان بدەنە دواوە و بە کشتوکاڵەوە خەریك بن!.».

[شێخ ئەحمەد] بەم قسەیە زۆر تێك چوو وتی: «هەر وەخت لە ئاسوورییەکانی دراوسێمان و عەشایرەکانیتر چەك وەرگیرایەوە ئێمەش ئامادەین بۆ دانەدواوەی.» ئەم قسەیە کرد و لە کۆڕەکە هەستاو موریش بە شوێنی خۆیا گەڕایەوە بۆ دواوە.

ڕۆژی (٣٠)ی نیسان «کۆمەڵی ئازادی» کۆڕێکیان بەست لە بەرزان بۆ قسەکردن لەوە کە ئایا ئەم ئەفسەرانە بگەڕێنەوە نەیرووی عێراق یان نەء؟. میرحاجیش کە وەختی خۆی ئەوەبوو گیرابوو و نێرابووە [عەمارە] هەڵاتبوو ئەویش لە ئەندامی کۆڕەکەبوو. پاشان قسە هاتە سەر ئەوە کە عیزەت عەبدولعەزیز، موحەممەد مەحموود و ئەحمەد ئیسماعیل بگەڕێنەوە سەر ئیشی خۆیان لە سوپایی عێراق، موستەفا خۆشناو و میرحاجیش [بەرزان] بە جێبێڵن و بچن لە شوێنێکیتر دانیشن. ئەم هەیئەتی ئازادییەش بۆیە ئەم بڕیارەیاندا فیکری دواڕۆژێکیتریان کردەوە بەڵام دواڕۆژ دەریخست کە ئەو دواڕۆژە هیچ کەڵکێکی نەبوو!.. تەنها موستەفا خۆشناو و میرحاج بە پوختی تێگەیشتبوون کە ئەو دواڕۆژە لە باتی ڕووناك بێ تاریك ئەبێ!.

ئەمجا هەر ئەو ڕۆژە موستەفا و میرحاج بەرزانیان بەجێ هێشت، ڕۆژی دوایی، واتە ڕۆژی (١٩٤٥/٥/٢) فەرماندەی گشتی ـ مەلا موستەفا ـ عیزەت عەزیز، موحەممەد مەحموود، ئەحمەد ئیسماعیلی هەڵگرت و بە ئۆتۆمۆبیلی «مێجەر ولسن» هاتن بۆ [هەولێر]. ڕۆژی ٥/٥ هەرسێ ئەفسەر چوونە کەرکووك و چاویان بە «ولسن» کەوت، پێی وتن کە ئەبێ بچن بۆ بەغدا، لەوێ ئەگەر پێویست بوو لە باڵوێزی بەریتانی «مێجەر مور» ببینن.

ئیتر لەوێوە بەڕێکەوتن بۆ بەغداو پاش دوو ڕۆژ چوون بۆ وەزارەتی جەنگ و خۆیاندا بەدەستەوە، بەڵام زۆری پێنەچوو، واتە لە پاش بیست ڕۆژ وەزارەتی جەنگ

دانی بە مەحکەمەی عەسکەری، گۆیا ئەم دانەیان بە مەحکەمە شتێکی ڕواڵەتییە ئەگینە وەنەبێ شتێکی تێدابێ!. ئەم کردەوەیە دڵی هەندێکیانی کرمێ کرد، لەبەر ئەمە «موحەممەد مەحموود» لە ڕۆژی ١٩٤٥/٦/٥دا هەڵات و «جەلال ئەمین مەحموود» ـ کە ئەویش ئەفسەرێکی‌تر بوو لە نەیرووی عێراقا و دۆستی موحەممەدبوو ـ ئەویشی لەگەڵ خۆی برد و پێکەوە بەرزان بگرەو هاتم.

ڕۆژی [١٧ای حوزەیرانی ١٩٤٥] موتەسەڕیفی هەولێر «سەعید قەزاز» خەبەری نارد بۆ مەلا موستەفا کە لەگەڵ «کاپتان چاکسن» موعاونی موشاوری سیاسی کەرکووك ئەیانەوێ لە «مێرگەسوور» چاویان پێی‌بکەوێ و پێکەوە هەندێ قسەبکەن. لەبەر ئەمە لە ڕۆژی (٢٠)دا هەموو لە مێرگەسوور کۆبوونەوە و کەوتنە قسەکردن. قسەکانی سەعید قەزاز و مەلا موستەفا زۆر لەیەك دووربوون. «سەعید قەزاز» بە ناوی کاربەدەستێکی بەهێزی حوکوومەتەوە لێ‌ئەخوڕێ، مەلا موستەفاش بە خۆی ئەوت تا ئێستە سەری بۆ کەس دانەنەواندووە ئێستە چۆن ئەم قسە تیژانەی «سەعید قەزاز» هەڵبگرێ؟! دیارە هەڵی‌ناگرێ، لەبەر ئەمە بەینیان تێك‌چوو، بەڵکوو ئەگەر «چاکسن» نەبوایە ئیش زۆر خراپ تێك‌ئەچوو!. ئیتر بەو بۆنەوە بە ساردی لە یەك جیابوونەوە.

❁ ❁ ❁

کاروبار ڕۆژ بەڕۆژ بەلای خراپیەوە ئەڕۆیشت، حوکوومەت گوێچکەی لە عاستی عەدالەت و حەقپەرستی ئاخنی بوو، پیاوانی حوکوومەت غەیری ڕۆژانی ڕەش نەبێ هیچی‌تریان پیشان نەئەدا. [بەرزان] لە لایەکەوە بە دەست برسێتیەوە چەوسابووبووەوە، لە لایەکەوە بە دەست توند و تیژی کاری کاربەدەستە نارەواکانەوە هاتبووە تەنگ، داد و عەدڵ وا دیار بوو تۆپێکی منالان بوو بە دەست هێزەوە بە هەموو لایەکا هەڵی‌ئەسووڕان! [بەرزان] لەم ڕۆژەدا کە هەر چواردەوری بە لەشکری زوڵم گیراوە و بە زنجیری بێ ویژدانی وڵاتەکەیان بەستۆتەوە ئەبێ چ‌بکا؟. چاری نییە ئەبێ کۆشش بکا بۆ لابردنی ئەو زوڵمە و بۆ پساندنی ئەو زنجیرە.

لێرەدا فەرمانداری گشتی ـ موستەفا بەرزانی ـ لە ڕۆژی ١٩٤٥/٦/٢٥دا سەرانی لەشکر و «موحەممەد مەحموود» و «جەلال ئەمینی» دانا و کەوتنە قسەکردن. ئاخر قسەیان

هاتەسەر ئەوە کە بە وڵاتەکانی دهۆك ـ ئامێدی ـ ئاکرێ ـ شێخان و سنجارا لەم لاوە، وە لەولاشەوە بە، ڕواندز ـ کۆیە ـ دزەیی ـ ڕانیە ـ هەڵەبجە و خانەقیا گەشتێك بکەن و هەموو سەرۆك عەشایرەکانیان چاو پێبکەوێ و قسەیان لەگەڵ بکەن بۆ دەستدانە شۆڕشێکی قەومی کوردەوە. ئەمجا لە ڕۆژی (٢٧)ی ئەو مانگەدا کەوتنە گەڕان بۆ بە ئەنجام گەیاندنی مەبەستەکەیان. ئەم گەڕانەیان تا نزیکەی ئاخری مانگی ئاغستوزی ١٩٤٥ درێژەی کێشاو هەموو سەرۆك عەشرەتەکان بە گیان و بە دڵ قسەیان دایە و دڵنیایان کرد.

کوتوپڕ هەر لەو ڕۆژەدا لە کاتێکدا کە مەلا موستەفا لە دێی «مرەبا» بوو ـ کە چوار ڕۆژە ڕێگە لە بەرزانەوە دوورە ـ کاغەزێکی لەلایەن موتەسەڕیفی هەولێر (سەعید قەزاز )ەوە بۆ نووسرابوو، بۆ «بەرزان». تێدا نووسیبوو:

«پێویستە لە ئێستەوە تا سێ ڕۆژیتر خۆت و هەموو سەرۆك عەشرەتەکانی [بەرزان] خۆیان بدەن بە دەستەوە ـ واتە بە دەست حوکوومەتەوە ـ ئەگەر وا نەکەن ئۆباڵی هەموو کوشتن و زیانێك ـ کە لەم بە گوێ نەکردنەدا ڕوودا ـ ئەچێتە ئەستۆی تۆ!.».

هەر لە عەینی ڕۆژدا کاغەزێکی «کۆلونێل مید» موشاوری سیاسی مووسڵ گەیشت، ئەویش ئەڵێ: «ئەگەر بە گوێ حوکوومەتی عێراق نەکەیت لە هەموو چاوێرییەکی ئێمە بێبەش ئەبیت!».

هەر لە ئەم ڕۆژەدا [مەلا موستەفا] کاغەزێکی «شێخ ئەحمەد»ی براشی وەرگرت کە نووسیبووی:

«شۆڕش لە بەینی هێزی [بەرزان] و حوکوومەتدا دەستی پێکرد، بەرزانییەکان گەلێ لە نوختەکانی پۆلیسی حوکوومەتیان لە بەرزان گرت، [مێرگە سوور] گیرا، «ئاڵوبەگ»ی خاڵمان کوژرا، کە واتە هەر زوو بگەڕێوە!.».

کارەساتی [ئاڵوبەگ]یش ئەوەبووە کە لەگەڵ دوو سێ پیاوی خۆیا ئەچن بۆ نوختەی «مێرگەسوور»، ئەمانەش تفەنگیان پێ ئەبێ، پۆلیس پێیان ئەڵێ تفەنگەکانتان دانێن ـ ئەم جۆرە قسانەش فەرمانێك بووە کە موتەسەڕیفی هەولێر کردوویەتە سەر هەموو نوختەکان وتوویە ئەگەر بەرزانییەکان هاتن، چەکیان لێ وەربگرنەوە و ئیش و کاری دائیرەی حوکوومەتیشیان بۆ مەڕوێنن! ـ

ئەم چەك فڕێدانە بەرانبەر بە عەشرەت شتێکی سووکە. هەرچەند بە خۆشی قسە ئەکەن کەڵك ناگرێ، لە ئاخرا لەگەڵ پۆلیسەکان ئەبێ بە شەڕیان، «ئاڵوبەگ» و پیاوێکی ئەکوژرێن، لەولاش چەند پۆلیسێك ئەکوژرێ و نوختە چۆڵ ئەکەن.

ئەم کارەساتی یەك لە دوای یەکانە کە [مەلا موستەفا] لە ماوەیەکی کەما هەمووی بیست، خستیە عالەمێکی ترەوە!. بە تایبەتی ئەو لەو باوەڕەدا نەبووە کە ئەگەر ئەو لە «بەرزان» نەبێ ئاگری شەڕ بەو جۆرە هەڵگیرسێ. فیکری هاتە سەر ئەوە کە ئەمە دوور نییە ئەم دوورکەوتنەوەی ئەوە لە بەرزان بووبێ بە هەل بۆ ئەو کەسانە کە ئەیانەوێ بە هەر جۆر بووە شەڕ هەڵگیرسێ!. لەگەڵ ئەمانەشاوە لەگەڵ ئەوەشا کە هێشتا نەخشەی گەڕانەکەی ـ کە دابنابوو ـ بەتەواوی پێکی نەهێنابوو، ناچار بوو بە پەلە لە ڕۆژی [١٩ی ئاغستوزی ١٩٤٥]دا خۆی گەیاندەوە «بەرزان».

* * *

لێرەدا بۆ ئەوە خوێنەر بەتەواوی لە هەموو کارەساتەکە تێبگا پێویستە توزێ فیکری خۆی بە زانینی ئەم شتانەی خوارەوە ڕوونتر بکاتەوە:

«بەرزان» ئەم بزووتنەوەیە کە کردی نەوەك بزووتنەوەیەك بوو تەنها بۆ خۆی، بەڵکوو ئیشێکی وای کرد، بوو بە هۆی بزووتنەوەیەکی قەومی لەناو هەموو کورددا، لەبەر ئەوە کە ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو بزووتنەوەی قەومیە بەهێزتر ئەبوو دیواخانە سیاسیەکانی حوکوومەتی عێراقی زۆر خراپ شڵەژاندبوو؛ بە جۆرێك شڵەژابوون لایان وابوو وەکوو ئاگر ئەمە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ئەتەنێتەوە، کە واتە بەهەر جۆر و بەهەر کوشتن و بڕینێك بێ ئەم ئاگری بزووتنەوەیە ئەبێ ئاوی پیا بکرێ و بکوژێنرێتەوە!. لەگەڵ ئەم کۆششەی ئەملاشدا «بەرزان» بە هەموو هێزێکیەوە ئەیویست خۆی لەشەڕ بپارێزێ و بە هێمنی و لەسەر خۆیی ئیشی خۆی بکا. دیارە ئەم باوەڕە باوەڕی مەلا موستەفا بوو، هەتا ئەو لەبەرزانا بوایە بڕوا نەئەکرا کە بتوانن بە هۆی شەڕەوە بەرزان لەناو بەرن، چونکە مەلا، شەڕی نەئەکرد، دەرچوونی ئەو چەند ڕۆژانەی ئەو لە بەرزان مەیدانی بۆ ئەو کەسانە چۆڵ کرد کە ئەو فیکرەیان هەبوو، وە توانیان بە هەموو جۆر کار بکەنە سەردڵی «شێخ ئەحمەد» و چی ئارەزوو ئەکەن بێبکەن.

بێجگە لەمە چوونی عیزەت عەبدولعەزیز ـ بەیەك ڕۆژ پێش هەڵگیرسانی شەڕ ـ بۆ بەرزان و قسەکردن لەگەڵ شێخ ئەحمەدا و کار تێکردنی ـ لەگەڵ باوەڕی «شێخ ئەحمەد»دا کە هەموو شت ئەبێ بە جەنگ ببڕێتەوە، ئەمەش دیسان ئاگردانێك بۆ ئەوە کە ئاگری شەڕی تێدا هەڵگیرسێ. ئەمە و هەروەها بەدەرچوونی «مەلا موستەفا» لە بەرزان وە فەرماندانی حوکوومەت بە هەموو دائیرە و نوختەکانی وڵاتی بەرزان بەوە کە هەر بەرزانییەك چووە لایان لە چەك ڕووتی بکەنەوە و ئیش و فرمانیشی بۆ جێبەجێ نەکرێ. لە لایەکیتریشەوە پڕکردنی هەر چواردەوری «بەرزان» لە نیروی حوکوومەت بۆ کوشتنی بەرزان ئەمانە هەموو ئەکەنە کارێ کە ئەگەر «مەلا موستەفا» بشگەڕێتەوە بۆ بەرزان هەر تووشی ئەوە ببێ کە شەڕ هەڵگیرسێ!..

وەکوو لەم قسانەوە بۆمان دەرکەوت ئەگەر پیاوانی حوکوومەت و کاربەدەستە گەورە و بچووکەکانی حوکوومەت دڵسۆز بوونایە بەرانبەر بە حوکوومەت و بە میللەت، نەیان‌ئەکردە کارێ لەبەر ئەوە کە ئینگلیز ئیتر ئیشی نەماوە، بێنن میللەت بدەنە بەر بارانی گوللەی مەترەلۆز و بیانکەن بە خۆراکی بۆمبای فڕۆکەکان و لە پێناوی ئەمەدا زیانێکی زۆریش ڕوو بکاتە حوکوومەت!. کاربەدەستەکان ئەمەیان هەموو بۆ ئافەرینێك کرد کەچی ئافەرینەکانیش هیچیان کەڵکێکی نەبوو بۆیان!..

ئەمە! کەی ڕەوای هەق بوو پیاوێکی وەکوو «ئاڵوبەگ» سەرۆکی عەشرەتی شیروان لەگەڵ دوو پیاویدا بچنە نوختەی «مێرگەسوور» بۆ وەرگرتنی ئەو شەکر و چاو کووتاڵە کە گۆیا حکوومەت بۆی بڕیونەتەوە کەچی ئەڵێ لە باتی ئەوە شتەکانیان بدەنێ پێیان بڵێن ئەبێ چەکەکانتان فڕێدەن و خۆشتان بگیرێن!. دیارە ئەمە سەر ئەکێشێ بەلای ئەوەوە کە لەملاوە «ئاڵوبەگ» و لەولاوە مەئموور مەرکەز و چوار پۆلیس بکوژرێت و لە ئاخرا نوختەی «مێرگەسوور» لە دەست حوکوومەت دەرچێ!.

وەیا «ئەسعەد خۆشەوی» بۆ ئیش و کاری تایبەتی خۆی بچێتە نوختەی «زێبار» کەچی پۆلیسی حوکوومەت گەمارۆی بدا و بیەوێ ڕووتی کاتەوە!. ئەسعەد ناچارە بە هەر جۆر بێت ـ با چەند کەسێکیش بکوژێ ـ هەر خۆی دەرباز کا!.

وەیا لە لایەکیترەوە هەندێ بەرزانی بچنە نوختەکەی [بەرزان] بۆ وەرگرتنی تەعینات،

کەچـی نوختـە بیـەوێ بیانگرن! بێگومان ئەمانە ئەم جەورە هەڵناگرن، ئاخری کار ئەبێ وای لێ بێ کە نوختەکە لە ژێر دەستی حوکوومەت دەرێنن!.

❁ ❁ ❁

لـە پاش ئـەوە کە ئەم کارەساتانە قەوما و حوکوومـەت ئەوەندەیتر چوار دەوری بەرزانی تەنیەوەو لە پاش ئەوە کە مەلا موستەفا ـ ش گەڕایەوە، هیچ چارێك نەدۆزرایەوە بێجگە لەوە نەبێ کە قۆمیتەیەك لەگەڵ [شێخ ئەحمەد] و ئەفسـەرەکانا بگرن و دەرمانێك بۆ ئەم دەردە بدۆزنەوە. ئاخر قسەیان هاتە سەر دوو شت؛ یەکەم قایم کردنی خەتی خۆپاراستن، دووهەم تێگەیاندنی حوکوومەتی عێراق و هەموو سەفارەتەکان لەم ئیشـە ناڕەوایە کـە بەرانبەریان ئەکرێت. لەبەر ئەوە هێنایان لە پێشا بەم جۆرەی خوارەوە ناوچەکانیان قایم کردەوە:

١ـ خەتی ڕۆژهـەڵات لەژێـر فەرماندەیی [شـێخ موحەممەد سـدیق]دا بە یاریـەدانی فەرماندەیـی [عیزەت عەبدولعەزیـز].

٢ـ خەتی ئاکرێ ـ جنوبی ـ لەژێر فەرماندەیی [مەلا موستەفا] خۆیدا بە یاریـەدانی فەرماندەیـی «جەلال ئەمین» و «موحەممەد مەحموود».

٣ـ خەتی ڕۆژئاوا ـ باڵندە ـ لە ژێر فەرماندەیی «ساڵح عەبدولعەزیز»ی برای عیزەتدا.

ئەمجا مەلا موسـتەفا بە مێژووی [٢٠ی ئاغسـتوزی ١٩٤٥] وێنەی چەند نامەیەکێشـی کە وەکوو لەخوارەوە باس ئەکرێ ـ نارد بۆ ڕەئیسـی وزەرای عێراق و بۆ سەفیرەکانی ـ چین، فەرەنسە ـ ئەمریکا ـ سۆڤیاتی ـ ئینگلیز لە بەغدا. نامەکەش لە وێنەی ئەم شتانەی تێدا نووسیبوو:

(.... ئێمـە کـە شۆڕشـەکەی دوو سـاڵ لەمەوپێشـمان وەسـتان لەبـەر ئەوەبوو پیشـانی هەمـوو کەسـێکی بدەین کە ئێمـە نامانەوێ ڕووبەڕووی حوکوومەت بووەستین، [نووری سـەعید] بڕیاری گەلـێ قسـەی چاکـە و یارمەتـی پێدایـن و پاشـان خـۆی ڕۆیشـت و هیچـی نەکـرد، کـە «حەمـدی پاچەچی» هاتە پێشـەوە وتی من بۆتان ئەکـەم. ماوەیەکی زۆر چاوەڕێمان کرد هیچمان دەست نەکەوت، بەڵکوو بە پێچەوانەی ئەوە حوکوومەت هێنـای [بـەرزان]ی پڕ کـرد لـە نوختـە و پۆلیـس و سـەرباری ئـەوەش هـەر چـوار دەوری [بـەرزان]ی بـە هێـزی هەوایـی و نەیرووی سـەرزەوی تەنیـەوە. ئەمەشـی گـۆیا بەناوی

مناوەرەوە هێناوە کەچی لەگەڵ ئەوەدا بۆ مناوەرە نییە بەڵکوو بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئەم شتانەی خوارەوە بوو:

١ـ سەرۆکی عەشایرەکان لە وەختی خۆیدا دیدەنی منیان کردبوو، بەڕێوشوێنی عەشایری منیش ئەبێ دیدەنیان بکەمەوە، لەبەر ئەمە من چوومەوە بۆلایان، کەچی حوکوومەت فەرمانێکی بۆ دەرکردم گۆیا من نابێ لە شوێنی خۆم ببزووم، بەڵام من لەبەر ئەوە کە قانوونی عێراق شتێکی وای تیدا نییە نەیەڵێ پیاو دیدەنی لە کەس و کاری بکا گوێم نەدایە و ڕۆیشتم.

٢ـ کە من لە «بەرزان» دەرچووم موتەسەڕیفی هەولێر فەرمانی کردبووە سەر نوختەکانی [زێبار] و بەرزان و مێرگەسوور کە هەر بەرزانییەك بۆ ئیش و کار هاتە لاتان بیگرن و ئیشی بۆ جێبەجێ مەکەن!.

٣ـ «ئاڵوبەگ» ـ کە خاڵی ئێمەیە و یەکێکە لە سەرۆکی عەشایرەکانی «بەرزان» ـ بە ئیشی تایبەتی ئەچێتە نوختەی «مێرگەسوور»، بە بێ ئەوە ئاگای لە هیچ بێ لە لایەن یەکێ لە پۆلیسەکانەوە ئەکوژرێت. سێ کەسی کە لە گەڵابووە بە ناچاری بۆ ئەوە ئەوانیش نەکوژرێن دەست ئەکەن بە شەڕکردن، لە ئاخرا پۆلیسەکان هەندێکیان ئەکوژرێن و ئەمان نوختەکە ئەگرن.

٤ـ لەبەر ئەو فەرمانەی موتەسەڕیفی هەولێر کە کردبوویە سەر نوختەکانی «بەرزان» لە لایەن گرتنی ئەو بەرزانیانەوە کە ئەچن بە شوێن ئیش و کاری خۆیانەوە لە دایەرەکانی حوکوومەت ئەبێ بگیرێن، «ئەسعەد خۆشەوی» کە ئەچێ بۆ زێبار، پۆلیس ئەیەوی بیگرێ، ئەمیش ناچار بە شەڕکردن خۆی لە دەستیان دەرباز ئەکا.

٥ـ حوکوومەت نەیرووی عەسکەری لە ئاکرێ و باپشتیان و هێزی پۆلیسی لە ناوچەی «ڕێکانی» کۆکردۆتەوە، بەبێ ئەمە کە هیچ لەبەینا هەبێ ئەیەوێ ئاگری شەڕ هەڵگیرسێنێ و ئەم کوردە بێگوناحانەی ئەم ناوە لە ناو بەرێ.

جەنابی سەفیر! لە کاتێکا کە من ئەم نامەیەتان بۆ ئەنووسم ژن و مناڵی دێهاتی ئەم ناوە لە ژێر بۆمبای حوکوومەتی عێراقیدا ئەپلیشێنەوە. لەبەر ئەمە تکا ئەکەم کە حوکوومەتی خۆتان لەم کارەساتە تێ بگەیەنن، بۆ ئەوە بەندەکانی پەیمانی «ئەتلەنتێك» بهێنرێنەوە یاد؛

ئەو پەیمانە کە ئەڵێ هەر قەومێ ئەبێ ژیانی خۆی لە دەست خۆیا بێ، وە بۆ ئەوە کە نەیەڵن دیکتاتۆری جانەوەرانەی عێراق ئەم جۆرە شتانەمان لەگەڵ بکەن. ئیتر هیوادارم ئەو دەوڵەتانەی کە چاوێری حقووقی قەومە بێهێزەکان ئەکەن هەر بژین!).

❁ ❁ ❁

ئەوەبوو فەرماندەری خەتەکان هەریەکەیان چوونە سەر ئیشی خۆیان، «مەلا موستەفا»ش لە ڕۆژی (٢١) ئاغستوزدا بە خۆی و شەست کەسەوە چوو خەتی ئاکرێ قایم کرد، لە ڕۆژی دواییدا لە گوندی «سفتە» بوون لە لایەن هێزی هەوایی حوکوومەتەوە بۆردمانێك کران. لە ڕۆژی (٢٤)ی مانگدا «مەحموود ئاغای زێباری» بە خۆی و (٤٠) کەسەوە لە ئاوایی «هەرند» دایەپاڵی و پێکەوە گەیشتنە کێوی «پیرس». ڕۆژی دوایی بەسەر پیرس دا تێپەڕین و چوونە دێ «گۆبیش». لەم کاتەدا خەبەر وەرگیرا کە گۆیا فەوجی (٥) لە ئاکرێ، وە فەوجی (٤) لە ڕواندزەوە فیکریان وایە ڕۆژی (٥)ی ئەیلوول بدەن بە سەر ئەم هێزەی «مەلا موستەفا»دا!..

گومانی تێدا نەبوو کە ئەم دوو فەوجە لەو دوو خەتەوە بهاتنایە هێزی «مەلا موستەفا»یان ئابلۆقە ئەدا و بەتەواوی شپرزەیان ئەکرد؛ چونکە ناچار ئەبوون بەوە کە ئەمانیش لە دوولاوە شەڕ بکەن، دیارە بەرگەی شەڕکردنی هەر دوولاشیان نەئەگرت. لێرەدا فەرماندەی گشتی ـ مەلا موستەفا ـ پسپۆڕی باری جەنگی خۆی خستە کار؛ هێنای «موحەممەدئەمین میرخان، قرتاس زێباری، عەزیز ئاغای زراری و ڕەشید زێباری» بانگ کرد و هەر یەکە «دە» تفەنگچی دانێ، پێی‌وتن شەوی (٢٧)ی ئاغستوز بچن لە دەوروبەری کێوی «ئاکرێ» هەموو بە یەکجار لە یەك کاتدا شێلیك بکەن بە سەر ئەو فەوجی پێنجەدا کە ـ کێوی ئاکرێ گرتووە ـ بە مەرجێکیش کە، یەکێ لە چوار فیشەك زیاتر نەتەقێنن، پاشان بە بێ ئەوە چاوەڕێی دوایی بکەن بگەڕێنەوە!.

حەقیقەت ئەمانە بەو جۆرە کە فەرماندە پێ وتبوون ئیشی خۆیانیان کرد و فەوجەکەیان شڵەژاند، فەوجی سەرباز بە جۆرێ شڵەژا پێ نەکرا لە ڕۆژی (٥)ی ئەیلوولا وەکوو ئەو نیازە کە هەیانبوو لەگەڵ فەوجی چوارا یەك بگرن و هێزی قەومی [مەلا موستەفا] بخەنە ناو!

مایەوە سەر فەوجی (٤) کە لە خەتی ڕواندزەوە بەسەرکردەیی «قەیسەر هورمز» و گەلێك لە دەستەو دایەرەی «شێخ ڕەشیدی لۆلان»ەوە هاتبوون و گەیشتبوونە «بادلیان». ئەوەبوو ئیتر لەبەر ئەو تەگەرەیە کە کەوتە ڕێی فەوجی (٥) بۆی نەکرا بێت و بداتە پاڵ فەوجی چوار. سەرکردەی هێزی میللی ئەم خەتەش «شێخ موحەممەد سدیق» بوو. کەواتە با لە جەنگی «بادلیانا» ئەو نامەیە بخوێنینەوە کە «شێخ موحەممەد سدیق» لەم ڕووەوە نووسیویە بۆ فەرماندەی گشتی ـ مەلا موستەفا:ـ

«... فەوجی (٤)ی «باپشتیان» لە بەیانی (٢٥)ی ئاغستۆزدا لە ڕێگەی «دیانە ـ بادلیان»ەوە هات و فیکری وابوو لە «کۆنە گوند»ەوە بێتە پشتی «شێتنە» و پشتمان لێ بگرن!. فەرماندەی «کۆنە گوند» ـ «نووروشیروانی» بە، دە کەسەوە بەرەنگارییان بوو، جەنگێکی شەش سەعاتی لەگەڵ کردن، لە دەمە دەمی نیوەڕۆدا نزیکەی چوار هەزار هەنگاوێك چووینە دواوە و لەوێدا خەتی خۆپاراستنمان دانا، لەدەمە دەمی ئێوارەدا فەوجی چوار شکان و گەڕانە دواوە. ئەو زیانەی کە، لێیان کەوت بەم جۆرە بوو:

[قەیسەر هورمز]ـ فەرماندەی نەیروو ـ کوژرا. بریندارى فەوج (٣٠٠) کەس، کوژراویان (٢٠٨) کەس. ئەوشتانەشیان کە کەوتە دەست هێزی میللی خۆمان ئەمانە بوون:

(٥٠) تفەنگ، (٢٠) سندۆق فیشەك، هەندێ نارنجۆك، دوو خەمپارە ـ خەمپارە وەکوو تۆپێکی بچووك وایە ـ سێ مەترەلۆزی سووك، یەك مەترەلۆزی گەورە. دەزگایەکی لاسلکی.

لە ئێمەش تەنها دوو پێشمەرگە بریندار بووە، خۆیشم بە پریشکی تۆپی ئەوان تۆزێ بریندار بووم و ئێستە فەرماندەیی ئەم خەتەم داوەتە دەست «موحەممەد ئاغای مێرگەسوور». تا، تاقە پێشمەرگەیەك لە ئێمە بمێنێ لە ڕێگەی حەقپەرستیدا بە پشتیوانی خوا نایەڵین دوژمن بستێك پێش کەوێت.

«فەرماندەی خەتی ڕۆژهەڵات ـ شێخ موحەممەد سدیق!.»».

❋ ❋ ❋

«جەنگی نەهلە»: «نەهلە» دەشتێکی پڕ ئاو و بێ دارە، گەلێ گوندی تێدایە کە هی سوورچییەکانن، چەند گوندێکی ئاسووریشی تێدایە، کێوی «پیرس» لە شیمال و کێوی «ئاکرێ» لە جنووب دەشتەکەیان گرتۆتە باوەش. لای ڕۆژهەڵاتی عەشرەتی سوورچی

و لای ڕۆژئاوای عەشرەتی زێباری و «دەشتی»یە. لە کێوی «ئاکرێ»وە سێ ڕێگە دێتە خوارەوە لە نزیکی گوندی «گۆبیش» ئەبن بە یەك و لەوێ بە سەر کێوی [پیرس]دا ئەچێ بۆ زێبار. ئەم سێ ڕێگەیە تەنها یەکێکیان نەبێ بە کەڵکی ئەوە دێت کە وڵاخی پیا بڕوا ئەوانیتر بێجگە لە پیادە بە کەڵکی هیچیتر نایەن.

شەوی (٨)ی ئەیلوول فەرماندەی گشتی ـ مەلا موستەفا ـ موحەممەد ئەمین میرخان و عەزیز ئاغای بانگ کرد پێیوتن هەر یەکە لەگەڵ «دە» تفەنگا بچن ڕاست و چەپی کێوی ئاکرێ ـ ڕووبەڕووی دەشتی نەهلە ـ بگرن و خۆیان حەشاردەن، وە پێیوتن تا لە لایەن منەوە تەقە نەکرێ ئێوە هیچ تەقە مەکەن. «سەعیدی ئاڵۆبەگ»یشی بە «دە» تفەنگەوە ناردە لای دەستی چەپ ڕووبەڕووی دەستەی عەزیز ئاغا. خۆیشی بە (٢٠) تفەنگەوە لە داوێنی کێوی «پیرس»ەوە ڕووبەڕووی دەشتی نەهلە لێ دانیشت.

ئەمجا لە بەرە بەیانی ڕۆژی (٨)دا نەیرووی حوکوومەت بە تۆپ و فڕۆکە بۆ ڕێچکەشکاندن دەستی کرد بە بۆردمانی خەتی مەلا موستەفا و سەربازی پیادەش بە شوێنیەوە. ئەوەندە هەبوو لە لایەن دەستەی [مەلا موستەفا]وە هیچ تەقەیەك نەبوو!. [فەوج] لەمە، دڵنیابوو کە ڕێگەی بۆ چۆڵ کراوە و هیچ کۆسپێکی لەڕێدا نییە، بە بێترس ملی ڕێی گرت و بەتەواوی چووە ناوەوە. کە زانرا وا هەموو چوونەتە، ناوەوە، لە لایەن دەستەی فەرماندەی گشتییەوە شێلیکێکیان کرایە سەر!. سەرباز بە جارێ شڵەژاو بۆ ئەوە شوێنێك بۆ شەڕ بدۆزێتەوە گەڕایەوە بۆ دواوە، لە گەڕانەوەیا لە لایەن دەستەی «موحەممەد ئەمین میرخان»ەوە درانە بەر گوللە!. ناچار بەلای ڕاستا بای دایەوە، هەر کە بای دایەوە لەلایەن دەستەی [عەزیز ئاغا]وە دەستڕێژیان لێ کرا!. ئەمجا بۆلای چەپ لایان کردەوە لەویش دەستەی [سەعیدبەگ] دایاننەبەر!.

ئەم لەشکرە بەبێ ئەوە بتوانێ دەستێك بکاتەوە تا بانگی شێوان کەوتە ژێر ڕەحمەتی بارانی گوللەوە. ئەو ڕۆژە (١٥٠) سەرباز و (٣) ئەفسەر کوشتاریان دا لەگەڵ (٤٠٠) کەس برینداراا. لە هێزی قەومی نە، کوشتار هەبوو نە، بریندار. ئەو تاڵانەش کە کەوتە دەست هێزی میللی هەر لەو ڕۆژەدا ئەمانە بوون: تۆپێکی گەورەی کوێستانی، دوو مەترەلۆزی سووك، (٢٨) تفەنگ، دە صندۆق فیشەك (١٦٨) گوللە تۆپ، چوارسەد بار ئازۆخە و شتومەك بەوڵاخەکانەوە.

نەیرووی حوکوومەت تا سێ ڕۆژ بەو جۆرە بە ئابلۆقەدراوی مایەوە و هیچی پێ نەکرا، هەرچەند حوکوومەت بە هەڕەشە و بە فڕۆکە و بە خواهشت خەریك بوو نەیوروی پێ ڕزگار نەکرا و نەیروو کەوتە ژێر ڕەحمەتی خۆ بەدەستەوەدانەوە!. ئیش کەوتە دەقیقە و سەعات.

وەزارەتی «حەمدی پاچەچی» و وەزیر داخلیەی «موستەفا عەمری» بوو، ئینگلیز دەستێکی هێنا بە سمێلیا و سمێلەکەی بزواندەوە!. بزواندنەوەکەش ئەوەبوو مەسەلە کوردییەکەی وەرگرت کە «ئەگەر دارپوازی لەخۆی نەبێ شەق نابێ!.» بە قسەی ئەو، پارە و مەرحەبایەکی زۆر دانرا بۆ ئەوە کە [موستەفا عەمری] بە ئارەزووی خۆی لەو ناوەدا بڵاوی کاتەوە و کوردەکان هان بدا بۆ بە گژاچوونی مەلا موستەفا و بۆ ڕزگارکردنی نەیرووە ئابلۆقەدراوەکەی حوکوومەت!.

بە پەلەیەکی زۆر پەلە پارەیەکی بێ‌ژمار ڕژێنرایە ئەو ناوە، زمانەلووس و پووسەکەی موشاورە سیاسییەکانی ئینگلیزی بەغداو مووسڵ و کەرکووکیش فریاکەوت! لە عەشایری سوورچی و زێباری دەستەیەکی کۆك، کۆ کرایەوە، سەرۆك عەشیرەتەکانی ئەو ناوە، وەکوو: «عەبدوڵڵا شەرەفانی، مەجید حسەین ئاغا، شێخ جەلالی بریفکانی، ئەحمەد ئاغای زێباری و شەوکەت زێباری» قسەیان دا بە حوکوومەت کە فەوجی ئابلۆقەدرا و ڕزگار کەن!. ئەمانە بە هێزێکی زۆری عەشایرەوە ـ کە تا چوارسەد تفەنگ ئەبوو ـ کەوتنە جەنگێکی مردن و ژیان لەگەڵ هێزی میللی [مەلا موستەفا]دا. لە ئاخرا لە ڕۆژی [١٢ی ئەیلوولی ١٩٤٥]دا مەلا موستەفا سەیری کرد هەر گوللەیەك کە بیهاوێژێ بەرسنگی کورد ئەکەوێ!. بۆ ئەوە ئەمە ڕوو نەدا سەنگەرەکانی خۆی بە جێ‌هێشت و ماوەی سەعات و نیوێك هەر لە کێوی «پیرس» کشایە دواوە. لەم کشانە دواوەی ئەودا فەوجە نەیرووەکەی حوکوومەتیش لە ئابلۆقەدان ڕزگاری بوو. هەر لەو وەختەدا کە عەشایرەکان گوللەیان بە سنگی «مەلا موستەفا»وە ئەنا «مەحموود ئاغا»ی زێباری ـ کە تا ئەو وەختە لەگەڵ هێزی مەلادا بوو ـ ئەویش لێ کشایەوە و دایە پاڵ هێزی حوکوومەت!.

لە ماوەی ئەو پێنج ڕۆژە ئابلۆقەدانەدا هەر دوو هێزەکە حەوجار پەلاماری یەکیان دا. کارەساتی ئەم «نەهلە» و «پیرس»ە هەموو دایەرەکانی حوکوومەت و دیواخانە سیاسییەکانی بەغدای پڕ کرد و کەوتە دەم دانیشتووی وڵاتەکانی [بەغدا] و [بەسرە]ش.

زیانی کوژراو و بریندار لەم شەڕەدا لە هەر دوو لا بەم جۆرە بوو: ـ

لە هێزی حوکوومەت کوژراو (٣٨٠) کەس. بریندار (٤٥٠) کەس. لە هێزی میللی عەزیز ئاغای زراری ـ کە فەرماندەی خەتی ڕاست بوو ـ لەگەڵ چوار کەسی‌ترا شەهید بوون، برینداریش گەیشتە چوار کەس.

❋ ❋ ❋

شەڕی «هەودیان» و «مەزنە»: ڕۆژی [٢ی ئەیلوولی ١٩٤٥] فەوجی (٤) لە لای ڕاست و فەوجی (٣) لەلای چەپەوە لە ڕێگەی «باپشتیان»ەوە بۆ «مەزنە» بەڕێ‌کەوتن. نەیرووی میللی لە ژێر فەرماندەیی «موحەممەد ئاغا»ی مێرگەسوور و یارییەدانی «نوروشیروانی» بە خۆیان و بە هەندێ پەنابەرانەوە بۆیان لە ئەشکەوتەکانی هەودیانا ـ کە، لە مەزنەوە سەعاتە ڕێگەیەك ئەبوو ـ خۆیان حەشار دابوو. کە فەوجەکان تێ‌پەڕین ئەمان بۆیان دەرپەڕین و دەستیان دایە تفەنگ لێیان، هێزی هەوایی حوکوومەت کە بەمانەی زانی کەوتە بۆم بۆردمان کردنیان، گوێیان بەو بۆردمانە نەدا و وەکوو شێری برسی خۆیان دا لە نەیرووی حوکوومەت، هێزی حوکوومەت بە تۆپ و دەبابە بەرەنگاریان بوون. هێزی میللی لەبەر شاڵاوی دەبابەکان تۆزێ کشانەوە تا دەبابەکان وەستانەوە، ئەمجا پەلاماریان دانەوە بە شکاندنێکی زۆر خراپ شکاندنیان. زیان لەم شەڕەدا بەم جۆرە بوو:

کوژراو لە هێزی حوکوومەت (٣٠٠)، بریندار (٤٥٠). لە هێزی میللی تەنها دوو کەس بریندار بوو هیچی‌تر. تاڵانێ کە کەوتە دەست هێزی میللی: (٣) تۆپی کوێستانی، (٣) مەترەلۆز، (٤٨) گوللە تۆپ، (٢٠) سندۆق فیشەك.

❋ ❋ ❋

شەڕی «هەرن»: «هەرن» گوندێکە بە سێ سەعات ڕێگە کەوتۆتە ڕۆژئاوای بەرزانەوە. لێرەدا عەشایرەکانی زێبار و بادینان ـ کە حەوسەد تفەنگچییەك ئەبوون ـ لە ژێر فەرماندەیی چەند ئەفسەرێکی عێراقی و هەشت سەرۆك عەشایری [زێبار] و [بادینان]دا بۆ بەربەرەکانێ مەلا موستەفا و شەڕ لەگەڵ‌کردنیا خۆیان داکوتا بوو، وە بە تەلسزیش هەموو کاتێ کارەساتی خۆیان ئەگەیاند بە نەیرووی عێراقی.

لەبەر ئەوە کە «هەرن» کەوتبووە پشت کێوی «پیرس»ەوە، سەنگەرگایەکی بەهێز بوو بۆ ترساندنی هێزی میللی مەلاموستەفا. فەرماندەی گشتی ـ مەلا موستەفا ـ ئەمەی ئەزانی و ئەیویست پیلانێکی وا بێنێتە پێشەوە کە ئەمە لە ناوا هەڵگرێ. لەبەر ئەمە هێنای پیرس ـ ی بەجێ هێشت و لەگەڵ (٣٠) تفەنگدا بڕیاری پەلاماردانێکی هێزی «هەرن»ی دا و بە شێخ سلیمان ـ یشی وت کە ئەویش بە (٢٨) کەسەوە لە شوێن ئەمەوە بێت. لە شەڕی پێشوا تۆپێکیان بە تاڵانی لە هێزی دەوڵەتەوە دەستکەوتبوو، لەم وەختەدا ئەو تۆپەش لە دێ «هەرفتە» بوو ـ کە ماوەی بەینی هەرفتە و هەرن شەش هەزار یەردەیەك بوو. تۆپەکەش گوللەی بە ماوەی حەوت هەزار یەردە فڕێ ئەدا. لەبەر ئەمە پێویستییەکی وا نەبوو بەوە کە تۆپەکە لەو شوێنەی خۆی بگوێزرێتەوە بەڵکوو هەر تۆزێ چەخماخەکەی بهێنرایەتە خوارەوە ڕاست نیشانەکەی ئەبوو بە ناو دێ «هەرن» و هێزی حوکوومەت.

«مەلا موستەفا» بەعیزەتی وت لەو وەختەدا کە هێزی ئەم ئابڵۆقەی نەیرووی حوکوومەت ئەدا ئەویش ئەو تۆپە بگرێتە هەرن و هێزەکە، بەم جۆرە ئەتوانن هێزی حوکوومەت بشڵەژێنن و شەڕەکە بەرنەوە.

فەرماندە ئەم پیلانەی دانا و ئەمجا خۆی و هێزەکەی پەلاماری «هەرن»یان دا و عیزەتیش لەو لاوە دەستی کرد بە تۆپ هاویشتن، بەڵام بە هیچ جۆر گوللەی تۆپ نزیکی نیشان نەئەکەوتەوە؛ واتە هەر زۆر زۆر نزم بووا. فەرماندە خەبەری بۆ نارد کە تۆپەکە نزیك بخاتەوە چونکە لەو حاڵەدا بە هیچ جۆر کەڵکی نییە، ئەم خەبەرەی بۆ عیزەت نارد و خۆیشی بە چاوەڕێ گواستنەوەی تۆپەوە تا نزیکەی شەش سەعاتێك لە شوێنەکەی خۆیا خەریکی شەڕبوو، سەیری کرد هیچ خەبەرێك لە تۆپەوە نییە و بەڵکوو جاران تەقەیەکی لێوە ئەهات ئێستە ئەو تەقەیەش نەما!. هەر لەو کاتەدا خەبەرێکیشی وەرگرت کە نەیرووی حوکوومەت بە هەموو هێزی عەشایرەوە ئەیانەوێ لە [پیرس] بدەن. فەرماندە لە ترسی ئەوە نەوەك پیرسی لە دەست دەرچێ، وە لەبەر ئەوە کە هیچ دەنگێکیش لە تۆپەکەوە نییە ناچار ئابڵۆقەکەی بەرەڵا کرد و بە خێرایی خۆی گەیاندە «پیرس».

مایەوە سەر ئەوە کە ئایا «عیزەت عەزیز» بۆچ لە بە ئەنجام گەیاندنی فەرمانی فەرماندەدا درێغی کرد و بۆچ تەقەی لە تۆپەوە نەهێنا؟.

گۆیا لەو وەختەدا کە فەرمانی [مەلا موستەفا]ی پێ‌گەیشتووە بۆ نزیك خستنەوەی تۆپەکە خەبەرێکی‌تریشی وەرگرتووە کە مەلا موستەفا سەنگەر و ئابلۆقەکەی بەجێ هێشتووە و ڕۆیشتووە!. لەبەر ئەمە ئەمیش تۆپەکەی هەڵگرتووە و بەرەودوا بووەتەوە!!..

لەگەڵ ئەوەشا ئەو خەبەرەی ئەو ـ ئەگەر بیستبێتی ـ هیچ بناغەیەکی نەبووە و درۆبوو.

[تاریخ] ئەبێ ئەوە بزانێ ئەم کردەوەی [عیزەت عەزیز]ە گەورەتر بەلایەك بوو کە هاتەڕێی هێزی بزووتنەوەی قەومی ئەو ڕۆژە، جا ئەو ئیشەی بەهەڵەیی وە یا لە ڕووی شتێکەوە کردبێ، خۆ بوو بە هۆی شکاندن هێزی میللی و هێزی [بەرزان]، وەکوو کاسەیەك بوو کە شکا، ئەشکێ!!.

* * *

شەڕی کێوی «پیرس»: (٢٥)ی ئەیلوولی (١٩٤٥) بوو. فەرماندە لە کێوی [پیرس] بوو، لەگەڵ (٦٠) تفەنگچیەکی ئازادا بۆ خۆپاراستن لە ماوەیەکی پێنجسەد مەتریدا سەنگەرەکانی خۆیان قایم کرد. ئەمەیان کرد بەڵام کێوی [پیرس] لە لایەن دوژمنەوە لە هەموو لایەکەوە ئابلۆقە درابوو؛ عەشرەتی سوورچی بە (٣٠٠) تفەنگەوە لەلای چەپەوە هێرشیان کرد و «مەلا عەلی» ژاژۆکی ـ یان ـ کە لە لایەن هێزی میللیەوە پاراستنی ئەو خەتەی پێ‌سپێرابوو ـ گێڕاپایە دواوە. لەلای ڕاستەوە عەشایرەکانی برواری، براشی، شەرەفانی و دۆسکی بە پێنجسەد کەسەوە ئەوانیش پەلاماریان‌دا. لەلای جنووبەوە فەوجی (٥) بە یارمەتی هەشت تۆپ و بۆم بۆردمانی پێنج فڕۆکەوە سنگیان نایە پێشەوە. لە پشتیشەوە عەشرەتی زێباری بە چوارسەد تفەنگەوە دەستیان پێ کرد!. لەناو ئەم هەموو ئاگربارانەدا هێزە (٦٠) کەسییەکەی میللی تا بانگی شێوان بەرانبەری ئەم لێشاوانەیان کرد و نەیانهێشت پێش کەون. ئەمجا کە دنیا تاریك بوو شوێنەکەی خۆیانیان بەجێ هێشت و لە ڕووباری «مەزن» پەڕینەوە خۆیانیان گەیاندە «هەرفتە» و لەوێ خەتی خۆپاراستنی ژیان و مردنیان دامەزراند. هەر لەم کاتەدا [مەلا موستەفا] خەبەری نارد بۆ «شێخ ئەحمەد» بۆ ئەوە عەشرەتەکەی خۆیان لە بۆمبای فڕۆکە و گوللە تۆپی بێ‌ئامانی

دوژمن بپارێزن، ئەبێ هەر ئێستە گوندەکانی خۆیان چۆڵ کەن و بچنە پشت چیای «شیرین» و ناو عەشرەتی «شیروانی». لە ڕاستیدا هەر لەو شەوەدا ئەمانە هەموو کران!.

شەوی (٣٠)ی ئەیلوول خەبەرێك لە «سەید عەزیز سەید عەبدوڵلا»وە هات: کە لەگەڵ [سەید موسلح] و هەندێ تفەنگچیدا ئەوا لە سەر سنووری ئێران و عێراق لە «کانی ڕەش» چاوەڕێی فەرمانی فەرماندەی گشتی ئەکەن. فەرماندەش ـ مەلا موستەفا ـ خەبەری بۆ نارد کە ڕێگەی «کانی ڕەش کێلەشین» بپارێزێ و ئێمە ئەگەین.

هەرا هەتا ئەهات گەرمتر ئەبوو، تۆپ و فڕۆکە و گوللەی دوژمن هەتا ئەهات زیاتر پاڵی ئەنا بەو مێزە میللییە نەترسەوە، هەچ ڕێگەیەك هەبوو بۆ کوشتن و لەناوبردنی بەرزانییەکان هەموویان گرتبوو، لەگەڵ ئەمەشدا بەرزانی نەترس، بەرزانی کۆڵنەدەر هەچ ئاژاڵ و ماڵێکی هەبوو لەگەڵ ژن و مناڵ و خاوخێزانا بەدەم شەڕەوە گەیشتنە «کانی ڕەش». لەوێدا فەرماندەی گشتی بە دووسەد تفەنگچییەوە ئاخر کەس خێزان و ماڵاتی خستە پێش خۆیەوە و بەو هێزەوە لە بۆمبای دوژمن پاراستنی. دیسان لەگەڵ ئەوەدا کە هێزی دوژمن بە هەموو فڕۆکە و تۆپ و عەشایرییەوە کەوتە کۆششی ئەوە کە پێشیان لێ بگرێ و ڕێگەی «کێلەشین»یان نەداتێ، لەگەڵ ئەمەشا هێزی نەبەزی بەرزانی لە ڕۆژی [١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥]دا زۆری زاڵمان و ویژدانی ناڕەوای حوکوومەتی ئەو وەختەی عێراق پێیانی لە مەڵبەندی باو باپیریان بڕی و چوونە خاکی ئێرانەوە، بۆ ڕەوانەکردنیشیان لە دەنگی نرکەی گولله تۆپ و هاژە و گڤەی بۆمبای فڕۆکە نەبێ هیچی‌تر نەبوو!.. جارێ با ئەمان لە ئێران بمێننەوە بزانین لە عێراقا چی ڕووی دا؟:

❋ ❋ ❋

کە کەوتە سەرەتای ساڵی (١٩٤٥) وردە وردە ئەوە دەرکەوت کەوا هاوپەیمانەکان شەڕ ئەبەنەوە، سیاسەتی ئینگلیز لە کوردەواریدا بەتەواوی گۆڕا بە تایبەتی بە جۆرێکی‌تر سەیری بەرزان ئەکرا!. لەبەر ئەمە لە مارتی (١٩٤٥)دا پشتی مەتاڵ کرایە «مەلا موستەفا» و ئینگلیزەکان لە لایەك و نۆکەرەکانی لە لایەك ئەیانویست کاروفرمانی بەرزان بگۆڕن بە بارێکی‌ترا. ئەو هەموو دڵخۆشی و پەیمانانە کە تا ئەو وەختە دابوویان هەمووی وەکوو لەماڵی «فاتەی تەڵەمشك» دەرچووبێ وابوو هیچی نەبرایە سەر! لەگەڵ ئەوەدا

بە ئەنجامگەیاندنی زۆرتر لە پەیمانەکانیان لە نیوەی ئەو پارەیە زیاتری تێنەئەچوو کە «موستەفا عەمری» وەزیری داخلیە لە تەمووزی (١٩٤٥)دا تەرخانی کرد بۆ بەگژا چوونی بەرزانییەکان، وە یا بۆ گیرفانی هەندێ کەس کە لە ماڵی خۆیاندا دانیشتبوون!. دیسان چواریەکی ئەو پارەیەشی هەر نەئەویست کە حوکوومەتی [حەمدی پاچەچی] لە سەرەتای مانگی ئابی (١٩٤٥)دا داینا بۆ وەزارەتی جەنگ بۆ ئەوە بیدن بە «بۆمبا» و بە فیشەك بچن خوێنی کوردەکانی «بەرزانی» پێ بڕێژن!.

باش چاوشەکانی حوکوومەت هەریەکە لە لایەکەوە حەقایقیان ون ئەکرد و هەریەکە لە لایەکەوە خەریك بوون بۆ ئەوە کە ئیشی [بەرزان] بە جۆرێکی ناڕاستی پیشانی بدەن تا لە پێناوی ئەمەدا خۆیان تۆزێ پایەکەیان بەرز بێتەوە وە یا چوار پووڵ بخەنە گیرفانیانەوە!.

بەیاننامە، یەك لە سەر یەکەکانی موتەسەڕیفی هەولێر کە دەری ئەکرد و ئەیوت: حوکوومەت قانوونی لێخۆش‌بوونی گشتی بۆ بەرزانییەکان دەرکرد و وڵاتەکەیانی ئاوەدان کردەوە و بە خۆڕایی چەند هەزار تەنێ دانەوێڵەی بەسەریانا بڵاو کردەوە و هەمووی پۆشتە کردنەوە و تا بیناقاقایان شەکر و چای پێ‌دان و وڵاتەکەیانی پڕ کرد لە خەستەخانە و قوتابخانە و هەموو وڵاتەکەیانی کرد بە بەهەشت!. کەچی لەگەڵ ئەمانەدا «مەلا موستەفا» هەستا و شیری لەڕووی حوکوومەتا کێشا و قەدری ئەم ناز و نیعمەتەی نەزانی، کە واتە ئەبێ حوکوومەت بە هەموو هێزێکیەوە بدا لە بەرزان و داری بە سەر بەردیەوە نەیەڵێ!.

[موتەسەڕیف] ئەم قسە خۆشانەی بەم جۆرە ئەخستە بەرچاوی شەعبی عێراقی و بەم جۆرە قسانە باوەڕی [شەعبی عێراقی] ڕائەکێشا بۆ لای تاکی ترازووی حوکوومەت. بەڵام ئایا ئەوەی نەئەزانی کە بە هەزاران وە بەڵکوو بە ملیۆن هەیە کە بڕوا بەم قسەیە ناکا، چونکە ئەگەر دەیەکێکی ئەم قسانە ڕاست بوونایە [بەرزان] خوێنی خۆیانیانی لێ زیاد نەبوو بێنن وەکوو جۆگەلەی ئاو بیڕێژن!. ئەگەر پیاوانی حوکوومەت و کاربەدەستانی حوکوومەت دڵسۆز بوونایە بەرانبەر بە شەعب، هیچ ناکۆکییەك لە بەینی میللەت و حوکوومەتا ڕووی نەئەدا. مەسەلێکی کوردیە ئەڵێ «سەگ لە کولێرە ڕاناکا!.». دیسان هەر مەسەلێکی کوردیە ئەڵێ: «کاسە، کە پڕ بوو ئەڕژێ!.».

ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە پەیتا پەیتا [دیوانی وزەرا] بەیاناتی دەرئەکرد و هەموو خراپەیەکی نیسبەت ئەدایە پاڵ «مەلا موستەفا» و هەموو چاکە و عەداڵەت و خواناسی و نان بدەیێکیشی ئەدایە پاڵ خۆی! شاهدی ئەم قسەیەش بەیانەکەی [٨ی ئابی ١٩٤٥]یەتی کە دای و وتی: «حوکوومەت ئەیویست گەلێ چاکە بکا لەگەڵ [مەلا موستەفا]دا، بەڵام مەلا قبووڵی نەکرد، لەبەر ئەوە ناچارین ئەو وڵاتە بخەینە ژێر ئیحتلالی عەسکەرییەوە!.».

توخوا! ئەو کەسەی ئەم کتێبە ئەخوێنێتەوە، وە یا بۆت ئەخوێنرێتەوە کەس هەیە چاکە و پیاوەتی لەگەڵ بکرێ و نەیەوێ؟!.. مەلا موستەفا تا تاریخی [٨ی ئابی ١٩٤٥] قسەی هەزار چاکەیان پێدا چارەکەیەکێ تاقە قسەیەکیان بۆ نەهێنایە دی، ئیتر چۆن بڕوا بەم قسانە ئەکا؟!.

لە [١٣ی ئابی ١٩٤٥]دا لەسەر زمانی «مودیری دعایەی عامەوە» دیسان بەیان بڵاو ئەکرایەوە لە سەر چەشنی هێنەکان موتەسەڕیفی هەولێر کە حوکوومەت ئەو هەموو پیاوەتیانەی لەگەڵ [مەلا موستەفا]دا کرد و نیازی وابوو گەلێکی تریشی لەگەڵ بکا کەچی مەلا موستەفا هیچی پێ هەڵنەگیرا و پاڵی بە هەموویەوەنا. لەبەر ئەمە حوکوومەت ناچارە بۆ ئەوە شاباڵی پڕ خەت و خاڵی عەداڵەتی بەوناوەدا بڵاو کاتەوە!. بە پێویستی ئەزانێ لەسەر خۆی گوناحبارەکان لەناو بەرێ. زۆر سەیرە ئەتوت «موتەسەڕیفی هەولێر» و دیوانی وزەرا و مودیری دیعایە تفیان کردۆتە دەمی یەك!!..

ئەمجا لە ڕۆژی [١٩ی ئابی ١٩٤٥]دا دیوانی وزەرا بڕیاریدا بە دانانی دیوانی عورفی لە وڵاتی «زێبار» و دەوروبەری زێبار، هەر لە عەینی ڕۆژا فەرمانی شاهانەیان بۆ دەرکرد. پاش ئەمە قائیدی قواتی عەسکەری مووسڵ و هەولێر و کەرکووك زیاتر پەرەیدا بە «عرفیە»کەو وتی لە ئیعتیباری [٢٨ی ئابی ١٩٤٥]ەوە قەزا و شوێنەکانی هەولێر، ڕواندز، ئاکرێ، ئامێدی و دهۆکیش لە ژێر ناوی عورفیا بێت!.

بەم جۆرە عورفی دامەزراو هەموو هێزی عێراق ڕووی کردە وڵاتی بەرزان و پاش ئەمانە دەستی کرد بە بەلاغ و بەیان دەرکردن.

بۆ ئەوە بزانی بەیانەکان لە حەقیقەتەوە چەندە نزیکن پێویستە شتێکی هەر لێ بخوێنێتەوە.

بۆ وێنە ئەمە بەیانێکە کە لە [١٩ی ئەیلوولی ١٩٤٥]دا دەری کرد. دیارە ئەم بەیانە پاش هەرای «بادلیان، هەودیان و هەرن» کەوتبوو، ئەڵێ:

«زووتر حوکوومەت تێگەیاندن کە مەلا موستەفا و هاوڕێکانی لەبەر ئەوە دەستیان داوە بە یاخیگەری و خراپە کردنەوە ئەبێ تەمێ بکرێن. وە بۆ ئەوە کە [شەعب] ئاگادار بێ ئەمانە کرا:

(١ـ حوکوومەت بەینی کێوی ئاکرێ و کێوی پیرس ـی لە یاخیەکان پاك کردەوە و زیانێکی زۆری لێدان.

٢ـ حوکوومەت لە پاش چەند بەگژاچوونێك ناوچەی ڕۆژئاوای ئامێدی لە یاخیەکان پاك کردەوە.

٣ـ حوکوومەت یاخیەکانی لە پاش چەند بەگژاچوونێك لە ناوچەی «نیروریکان» پاك کردەوە و چووە بەرزانەوە.

٤ـ حوکوومەت یاخیەکانی لە «سیدەکان» دەرکرد و ئێستە ناوچەی برادۆست پاك بووەتەوە.

٥ـ حوکوومەت لە پاشتیانەوە پێش کەوت و هەموو ئەو ناوەی داگیر کرد و زیانێکی زۆری دا لە یاخیەکان.

٦ـ یاخیەکانی لای «مەلا موستەفا» لە هەموو لایەکەوە ئابلۆقە دراون، هیچ چاریان نییە یا تیاچوون، یا تەسلیمبوون!.

٧ـ عەشایرەکانی ئەو ناوە هەموو دوژمنی «مەلا موستەفا»ن و هەموویان سەر بە حوکوومەتن و بە هەر دوولاوە سەری مەلا موستەفا ـ یان خوارد!.).

ئەمە یەکێك بوو لە بەیان و بەلاغەکانی حوکوومەت، تۆ بزانە بەلای ئەوەدا چوو کە زیانی حوکوومەت لەم هەموو هەرایەدا چی بووە؟. وە یا هیچ قسەیەکی لە زیانی ماڵی ئەم هەرایەوە کرد کە لەو ماوەیەدا ڕووی دابوو؟!.

ئەی چەرخ!. ئایا ئۆباڵی خوێنە ڕژاوەکەی هەر دوولاو زیان و خەسارەتە ماڵیەکە ـ کەماڵی شەعب بوو ئەدرا بە گوللە و ئەنرا بە سنگی شەعبەوە ـ ئەچێتە ئەستۆی کێ؟!!..

* * *

لەو سەردەمانەدا كە جۆش و خورۆشێكی كوردایەتی هەبوو لەناوا، كوردەكانی بەغدا دلگەرمیەكی باشیان ئەنواند، «یانەی سەركەوتن» هەبوو لە بەغدا، هەموو قوتابیە كوردەكانی دانشگاه و دانشسەراكان و دانیشتووەكانی‌تری بەغدا هاتوچووی «یانە»یان ئەكرد و مەبەستیش لەیانەكە بڵاوكردنەوەی خوێندەواری و گیانی برایەتی بوو لەناو كوردەكانا. بە تایبەتی دەستەی گەنجەكان و قوتابییەكان ئەم هەستەیان زۆر پێ‌خۆش بوو، بە هەموو جۆر كۆشش ئەكرا بۆ بەرزبوونەوەی پایەی ئەو یانەیە.

لەسەرەتای نیسانی (١٩٤٥)دا هەڵبژاردنی «یانە» هاتە ناوەوە بۆ دانانی ئەندام، لە رۆژی هەڵبژاردنەكەدا هەچ كوردێك هەبوو ـ تەنانەت لە دەرەوەی بەغداش ـ هەمووی هات بۆ یانە. گەورەو بچووك، وەزیر و گزیر. لە دوایی هاتنی هەڵبژاردنا «نووسەری ئەم كتێبە» بێجگە لە ئەمین زەكی‌بەگ لە هەموو كەس زیاتر دەنگی درایە.

ئێمە بەم كارەساتە نازانین تومەس پیاوە گەورەكانی كورد ـ ئەوانەی لە بەغدا دانیشتبوون و چووبوونە پارێزەوە بۆ وەزارەت و نیابەت بە ناوی كوردەوە مەبەستیان لە هاتوچووی «یانە»كەی ئەو رۆژەدا بچڕانی شتێك بووا. ـ واتە كورسیەكی حوكم! ـ ئێمە دەستەی گەنج و قوتابیان ئاگامان لەمە نییە. هەر بە گەلێ وەخت پێش هەڵبژاردن هەندێ لە پیاوەكان ـ كە لێیان ماوە و لێشیان مردووە ـ خەریكی نانەوەی تەونێك بوون بۆمان، چونكە بۆیان دەركەوتبوو كە هەندێك لە ئێمە ناكەوینە ناو ئەو تۆڕەوە كە ئەوان بە دەستیانەوەیە!. بەڵام تەونەكەیان بەتەواوی بۆ نەئەتەنرایەوە.

كارەساتی «مەلا موستەفای بەرزانی» هاتە ناوەوە؛ واتە تووڕەبوونی حوكوومەت لە «مەلا موستەفا»، ئەو دەستەیە ئەمەیان بە هەل زانی بۆ تەواوكردنی تەونەكە!. وە ڕاست بوو ئێمەش وەنەبێ بۆ لابردنی زوڵم و جەوری حوكوومەت بەرانبەر بە «مەلا موستەفا» دەستمان لە نووسینا نەبوایە، بەڵام ئەو دەستەیە نەئەبوایە گورێس ئەوەندە بە توندی ڕابكێشن تا بپچڕێ، مەلا موستەفا و هەموو كەس بە خراپ بخەنە بەرچاوی حوكوومەت بۆ ئەوە ئەوان بە پیاوچاك دەرچن و كورسیەكی چوار ڕۆژی‌یان دەست كەوێ؟!.

رۆژی [٦ی نیسانی ١٩٤٥] بوو، لەلایەن میرییەوە گلێر كراینەوە: جەوهەر عەزیز، كانەبی عەزیز، مەكرەم تاڵەبانی، كاكە حەمەی سەید ئەحمەدی خانقا، عەبدولقادر

قەزاز، جەلیل هوشیار و نووسەری ئەم کتێبە (عەلائەدین سەجادی). گلێر کراینەوە بۆ قاپی حەپسخانە و پاشان دراین بە دیوانی عورفی لە بەغدا. ئەو گوناحەی کە دایانە پاڵمان ئەوەبوو: «کە مەلا موستەفا لە بەرزان بە تفەنگ شەڕ لەگەڵ حوکومەت ئەکا، ئەمانەش لێرە بە قەڵەم، وە میانەی هاتوچووشیان لەگەڵ مەلادا هەیە.».

دووجار بۆ موحاکمە براینە دیوانەوە، بۆ جاری سێهەم دەنگ بڵاو بوو کە ئەیانەوێ بمانخنکێنن! بەرەکەتدا دزەیییەکان و تاڵەبانییەکان و سەید ئەحمەدی خانەقا و گەلێ دەستەیتر بۆمان تێکەوتن تا نەیانخنکاندین!. بەرەبەرە خەڵکیتر هەر ئەبرایە [عورفی] بەغدا و هەر کە بە ئەندازەی خۆی حوکمی ئەدرایە. ئەم عورفی بەغدایەش لقێك بوو لە عورفییەکانی وڵاتی [بەرزان].

ئەو عورفیانەی کە لە هەولێر و وڵاتەکانیتردا بە هۆی کارەساتی بەرزانەوە لە ساڵی (١٩٤٥)دا دایاننا و حوکمیاندا بەسەر (١١٥) کەسدا، (٣٥) کەس لەمانە بە خنکاندن، ئەوانیتر بە حەپس.

❋ ❋ ❋

بەرزانییەکان کە لە (١٩٤٥/١٠/١١)دا بەسەر «کێلەشین»دا ئاوابوون و چوونە ئێرانەوە بە هەموو جۆرە چەکێکەوە ڕۆیشتن. خۆیان (٣) هەزارێك ئەبوون، تا ئەو وەختە کە دەرچوون (٩) فڕۆکەیان لە فڕۆکەکانی عێراق لەشەڕا خستبووە خوارەوە. کە چوونیش (٧) تۆپ، (١٠٠) مەترەلۆز، (٢٠) هەزار فیشەك و چەند چرایەکی موخابرە و لاسیلکییان پێبوو. سەرەتا کە چوون لە وڵاتەکانی «نەغەدە، سۆفیان و جەڵدیان» جێگیر بوون و خۆیانیان لەوێ دامەزراند.

ئەو سەردەمە کە ئەمان چوونە ئێرانەوە حوکوومەتی دیموکراتی کوردستان لە سابڵاخ هەبوو، ئەمە ترسێکی زل بوو بۆ حوکوومەتی ئێران کە نەوەك مەلا بداتە پاڵ ئەو حوکوومەتە و ئەو وەختە ئێران ئەوەندەیتر شپرزە ئەبێ. لەبەر ئەمە ئامر فەوجی سەردەشت «سەرهەنگ پزیشکیان» بە فەرمانی [تاران] بە هۆی «مام عەزیزی قەرەنیاغای مامش»ەوە کەوتە قسەکردن لەگەڵ مەلادا کە حوکوومەتی ئێران بە هەموو جۆر یارمەتی بدا و زەویوزار بۆ بەرزانییەکان تەرخان بکاو خۆیشی بکا بە «نائب»

لە «تاران» و ئیتر نەچێ بە لای وڵاتی «سابڵاخ»دا!.. مەلا ئەم قسانەی نەچوو بە گوێچکەدا و قسەی ئێرانییەکانی گێڕایەوە.

وڵاتی «ورمێ» لە لایەن «زیرۆ» بەگی هەرکییەوە داگیرکرابوو لە ئێران. وڵاتی سابڵاخ حوکوومەتی «قازی» تێدا هەبوو، «تایەر ئاغا» و «ڕەشید بەگی» مەندی و هەموو عەشرەتی شکاك و هەرکی دابوویانە پاڵ [قازی موحەممەد]، چوونی مەلا موستەفا بۆ ئەو وڵاتە دەروویەکی تر بوو لە حوکوومەتی کوردستان کرابووەوە. بە هۆی ئەفسەرانی هەر دوولاوە مەلا و قازی گەیشتنەیەك، هێزی بەرزان (٨٠٠) تفەنگچی بەکار ئەبوو چووەنا و هێزی دیموکراتی کوردستانەوە. هەرچەندە هێزی [مەلا موستەفا] لە وڵاتەکانی «سەقز» و «فیض اللّه» بەگی و «بانە»دا خەریکی ئیش بوون و ئەو خەتانە ڕووبەڕووی ئەوان کرابووەوە، بەڵام لە ڕاستیدا لە ماوەی بوونی حوکوومەتی دیموکراتی کوردستان و چوونی مەلا بۆ ئەو وڵاتە زۆرتر پێشکەوتن و شەڕە زلەکانی ئەو ماوەیە هەر بەسەرشانی ئەمانەوەبوو، ئەمان بوون کە بووبوون بە مایەی هێزی هەرە زلی حوکوومەتی دیموکرات، بەڵکوو تیشك و شەوقێك بوون کەوتبوونە ئەو ناوەوە.

* * *

بە هۆی شەڕی گەورەی دووەمەوە ئێران لە هەموو لایەکەوە پڕی بووبوو لە ئینگلیز و ئەمەریکا و ڕووس، شەڕ دوایی هاتبوو پێویست بوو ئەمانە بە پێی پەیمانی خۆیان لە ئێران دەرچن. لە تشرینی دووهەمی (١٩٤٦)دا بڕیاردرا کە ئینگلیز و ئەمەریکا لە شیمالی ئێرانەوە لە «ئێران» دەرچن، ڕووسیش لە ئازەربایجان بکشێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی.

کە ئەمان ئەم بڕیارەیان‌دا ئیشی حوکوومەتی «قازی موحەممەد» ڕووی کردە سەرەولێژی، کە ئەو وای لێ‌هات دیارە چۆنیەتی کاروباری بەرزانییەکانیش پەردەیەکی‌تری بە سەراهات!. تا ئەو وەختە ئەمان لە حوکوومەتی کوردستانا ڕایانئەبوارد و حوکوومەتی ئێران بە هیچ جۆر ڕێگەی قسەی نەبوو، ئەوا ئێستە ئێران وڵاتی سابڵاخ و حوکوومەتی کوردستان دائەگرێت و ئەمانیش بەرانبەر بە حوکوومەتی ئێران دیارە بێگانەن، ئێران ئەتوانێ پێیان بڵێ لە وڵاتما مەبن!. لەم‌لاشەوە حاڵی عێراقیان ئەوەیە کە چاومان پێ‌کەوت!..

«مەلا موستەفا» لەبەر ئەمانە هێنای وڵاتی سابڵاخی بەجێ هێشت و گەڕایەوە بۆ ناوچەی «سندوس» و «نەغەدە»ی کردەوە بە شوێنی خۆی و تەلگرافێکیشی بۆ «قوام السلطنە»ی سەرۆکی وەزارەتی ئێران لێدا و پیرۆزبایی ئەوەی لێ کرد کە وڵاتەکەیان لە نەیرووەکانی بێگانە پاك بووەوە و تیایا دەرچوون. «قوام السلطنە» وەڵامی تەلگرافەکەی بە زمانێکی شیرین دایەوە و داوای ئەوەی لێ کرد کە بچێ بۆ [تاران] و بە دڵنیایی هەر قسە و باسێك هەیە لەوێدا بیکا.

کە ئەم وەڵامە هاتەوە و لەم قسەیە تێگەیشتن. مەلا کۆنگرەیەکی لە «شێخ ئەحمەد» و ئەفسەرەکانی لای خۆی و پیاوەگەورەکانی [بەرزانی] دروستکرد و لەم ڕووەوە کەوتنە قسەکردن. ئاخر بڕیاریان هاتە سەر ئەوە کە بچێت بۆ [تاران] و لە کەین وبەین تێ بگا. لەم لاشەوە هێزی [بەرزان] ئاگاداری شوێن و جێگەی خۆیان بە هەموو ڕووبینییەکەوە بکەن.

ئەمجا لە (١٩٤٦/١٢/١١)دا خۆی و، میرحاج، عیزەت عەبدولعەزیز، نووری ئەحمەدی تاها، خالد بەگی زەراری، موحەممەد ئەمین میرخان، جەمیل تۆفیق بامەڕنێ. بەڕێکەوتن و چوون بۆ [تاران]. لەوێ بوون بە میوانی حوکوومەت و بە هەموو جۆر ڕێزیان لێ گیرا. «ڕەزمئارا» ڕەئیسی ئەرکانی نەیرووی ئێران بوو چاویان پێکەوت. مەلا موستەفا [قوام السلطنە] و شای دیدەنی کرد. لە پاش مانەوەی چەند ڕۆژێك ئاخر بڕیاری حوکوومەتی [ئێران] لە گەڵیا هاتەسەر ئەم مەرجانەی خوارەوە:

(١ـ ئەگەر بەرزانییەکان ببن بە تەبەعەی ئێرانی، ئێران وەریان ئەگرێ و لە دەروروپشتی [تاران] شوێن و زەوییان بۆ دیاری ئەکا و دایانئەنێ بەو مەرجە چەك فڕێ بدەن.

٢ـ ئەگەر خۆ، بیانەوێ هەموو لە ئێران نەمێننەوە، ئەو (١١٥) کەسە کە لەلایەن حوکوومەتی [عێراق]ەوە حوکم دراون و بە ناوی پەنابەرانی سیاسییەوە پەنایان بە «ئێران» هێناوە، حوکوومەت ئەوانە لە شوێنێك دوور لە سنووری عێراق دائەنێ.

٣ـ خۆ ئەگەر ئەمانەش هیچیان ناکەن ئەبێ تا ڕۆژی [٢٢ی کانوونی دووهەمی ١٩٤٧] کەستان لە ئێران نەمێنن و ئەم وڵاتە بەجێ بێڵن.).

[مەلا موستەفا] لە پاش وەرگرتنی ئەم مەرجانە چاوی بە [قوام السلطنە ]کەوتەوە و

لە پاش دانیشتنێکی باش پێی‌وت مەرجەکان هەموویان بەجێن و لە چاکەی ئێمەن، ئەمێنێتەوە سەر ئەوە کە چەکەکانمان بدەین بە دەستەوە، ئەمەیان تۆزێ وردبوونەوەی ئەوێ؛ چونکە باوەڕی من، وە لام وایە هەموو عەشرەتی بەرزانیش ئەوەیان بەلاوە چاك ئەبێ کە لەو شوێنەدا حوکوومەت بۆمان دیاری ئەکا دابنیشین، بەڵام تا ئەگەینە ئەو شوێنە ئێمە گەلێ عەشایریتر هەیە لەسەر ڕێمانا کە دوژمنمانن، ئەگەر چەکمان پێ نەبێ ناتوانین بە ناویانا تێپەڕین. کەوابوو پێویستە ئێمە چەکەکانمان پێ بێ تا ئەگەینە ئەو شوێنە، بۆ ئەوە خۆمانی پێ بپارێزین. کە گەیشتینە جێ ئەو وەختە ئەیدەین بە دەستەوە!.

[قوام السلطنه] ئەم قسەیە پەسەند کرد و ڕەزم‌ئاراش پشتیوانی قسەکەی کرد، لەسەر ئەم ئیعتیبارە لێك جیابوونەوەو [مەلا موستەفا] و هاوڕێکانی گەڕانەوە بۆ وڵاتی «سندوس» بۆ ئەوە عەشرەتی [بەرزانی] بەرن و بچن لە بناری [تاران] خەریکی کشتوکاڵ بن و چەکەکانیان بە بێ‌عارەق بدەن بە [قوام السلطنه] و حوکوومەتی ئێران!!..

لە مەلا موستەفام پرسی کە دەنگ وا بڵاو بووبووەوە گۆیا لەو وەختەدا کە ئێوە چوون بۆ [تاران] چەند ئەفسەرێکی ئێرانی وەکوو بارمتە لەلای [شێخ ئەحمەد]ی برا گەورە ماونەتەوە تا ئێوە ئێشتان ئەکەوێ بە بارێکا!.

وتی کەس نەماوەتەوە و کەسمان گل نەداوەتەوە، بەڵکوو بەبێ قسە ئێمە چووین بۆ «تاران».

وتم لە ئێرانا کە یەکێکیان بەرچنگ کەوت ئەیگرن و بەرەڵای ناکەن، بەتایبەتی یەکێکی وەکوو تۆ کە بەو جۆرە بە ئاسانی کەوتبوویتە بەردەستیان چۆن نەیانگرتیت؟.

وتی ڕێکوپێکی هێزی [بەرزان] بوو بە هۆی نەگیرانی ئێمە. هەموو کاتێك حوکوومەتی [تاران] دەنگوباسی نەیروو و هێزی بەرزانی وەرئەگرت، بە ئەندازەی سەری دەرزییەك بێ‌هێزی و سستی لەوانەوە بەر گوێ بکەوتایە خێرا ئێمەی ئەگرت، هەرچەندە لە لایەکەوە بە هەموو جۆر خزمەتیان ئەکردین، لە عەینی وەختیشا بەبێ ئەوە گۆیا ئێمە بزانین دەست‌نیشان کرابووین بۆ ئەوە ئەگەر بێ‌هێزییەك لەولا هەست بکەن لەم‌لاوە ئێمە بگرن!.

* * *

ئەم قسەی مەلابوو کە بۆی گێڕامەوە. لە لایەکی تریشەوە هەندێ لە نووسەرە بەکرێ گیراوەکانی ئێرانی شانی خۆیان هەڵئەتەکێنن و ئەڵێن: «حوکوومەتی ئێران لەبەر ئەوە کە ناوی بێپەیمانی نەیەتەسەر، لەبەر ئەوەبوو کە دەستووری گەڕانەوەی [مەلا موستەفا]ی دا و لە تاران نەیهێشتەوە.» بەشانازییەوە ئەم قسەیە ئەکەن و ئەو تانووتە ئەدەنە پاڵ مەلا موستەفا کە گۆیا ئەو پەیمانی خۆی بەڕێوە نەبرد. لەگەڵ ئەوەدا چاو لەوە ئەپۆشن کە هەموو دەمێك کار بە دەستەکانی حوکوومەتی ئێران پەیمانشکاندنیان بەلاوە وەکوو ئاوخواردنەوە وابووە!.

قسەی دەوری زووتر ناگێڕینەوە تەنها ئەوە ئەڵێن: کە لە دەوری سەرەتای پادشایەتی «ڕەزاشا»دا بە چەجۆر سەرۆکە عەشایرەکانی کوردیان لە وڵاتەکانی کوردستانی ئێران ئەگرت و ئەیاننارد بۆ «قسری قەجەر». بە زمانی شیرینتر لە هەنگوێن ئەچوون بە لایانەوە و یەکە یەکە بە سوێند و بە قرئانخواردن ڕاویان ئەکردن و پاشان نە سوێند لە مەیدانا ئەما، نە پەیمان و پەیمان نە شکاندن!.. کەچی نووسەرە بەکرێ گیراوەکان ئێستە ئەڵێن: بۆیە حوکوومەت دەستووری مەلایدا، لەبەر ئەوە کە ناو نەبری بە پەیمان شکێنەر!.. ئای لەم قسەیە چەند زلە؟!.. ئەی ئەو سەردەمە کە کوردەکانی بە پەیمان و بە قسەی خۆش بانگ ئەکرد و پاشان ئەیخستنە [قەسری قەجەر]ەوە تا ئەمردن، ئەو وەختە بۆچ پەیمان شکاندن لە کایەدا نەبوو؟!. وا لە باسی «مەلا موستەفا»دا پەیمان نەشکاندنیان کرد بە گورزی دەستیان!..

ڕەنگبێ ئەو نووسەرانە ئەو ڕێگەیە بۆ کاربەدەستەکانی ئێران پاك بکەنەوە کە بڵێن: «ئەمە سیاسەتە و هەر ڕۆژێك بە بارێکا هەڵئەسووڕێ!. ئەو ڕۆژە سیاسەت ئەوەی ئەویست، ئەم ڕۆژەش پەیمان نەشکاندن ئەمەی ئەوێ!.»».

لەسەر قسەی ئەم جۆرە نووسەرانە ئەبێ ئەو کاربەدەستانەی ئێران وەکوو «حوشترمورغ» وابن؛ کە پێ بوترێ وەرە بار بەرە ئەڵێ من باڵدارم، باڵدار چۆن بار ئەبا؟. کە پێ بڵێن کەواتە وەرە «دان» بخۆ، ئەڵێ چاوتان لێنیە من وەکوو حوشتر وامە، حوشتر چۆن دان ئەخوا؟!.

ئەوانیش ئەو سەمەرەیە لێ ڕوودوان! کە پێیان بوترێ ئەگەر بە تەنگ پەیمانەوەن

بۆچ لەگەڵ کوردەکانی دەوری [ڕەزاشا]دا واتان کرد؟. ئەڵێن ئەوە سیاسەتە و لە سیاسەتا پەیمان شکاندن نییە. ئەگەر بڵێن: ئەی چۆن مەلا موستەفا ئیزن‌درا لە تاران گەڕایەوە ئەو سیاسەتە لەوێدا بۆ لەکار نەبرا؟. ئەڵێن: ئای! پەیمان لە بەینا هەبوو، چۆن بێ پەیمانی ئەکرێ؟!..

لەگەڵ ئەمانەشا کۆتەك ئەزانێ قۆناغ لە کوێیە!. گەڕانەوەی مەلا موستەفا لە تاران لەبەر ئەوە نەبوو کە پەیمانیان پێ‌دابوو، بەڵکوو لەبەر ئەوەبووکە ئەو ڕۆژەی کوردەواری ئەو وڵاتە لە هەموو لایەکەوە جۆشی ئەخوارد. لەبەر ئەوەبوو کە ڕەشیدبەگ و نووری بەگی هەرکی لەوڵاتەکانی مەرگەوڕ و تەرگەوڕدا بە دوو هەزار پیاوی پڕچەکەوە ڕاوەستابوون. عەشرەتەکانی «زەرزا» و «مامشی قادری» بەینی «شنۆ» و «ئاراس»یان بە تفەنگ تەنیبوو. شکاکەکان بە دوو هەزار و پێنجسەد تفەنگەوە لەولاوە لە پارێزا بوون. عومەر ئاغای خالد ئاغای جەلالی بە دوو هەزار تفەنگی پڕ فیشەکەوە ئەو وڵاتەی گرتبوو. لەم لاشەوە بەرزانییەکان خۆیان بە هەموو جۆرە هێزێکەوە وەکوو تێسکەی تفەنگ ڕاوەستابوون.

ئەمانە بوون حوکوومەتی ئێرانیان ناچار کرد بەوە کە «مەلا موستەفا» بگێڕێتەوە بۆ وڵات، نەوەك پەیمان نەشکاندن وەکوو نووسەرەکان ئەیڵێن!. ئەوەندە هەیە پیاو کە دەستی‌دا بە نووسینی کارەسات وە یا تاریخێکەوە زۆر حەیفە ڕاستی و حەقایەقەکان بکا بە ژێر لێوەوە و ئەوی ڕووکەشە ئەوە بخاتە بەرچاو. ئەگەر ئەو وابکا پاشە ڕۆژ ڕاستییەکە دەرئەخا!.

ئەمە و دیسان شتێکی‌تریش هەیە:

کاربەدەستەکانی ئەو ڕۆژەی ئێران ـ وەکوو هی پێشینەکانیان ـ ئەچوون هەندێ لە کوردەکانیان هەڵئەخڕاند و بە هێزی ئەوانەوە ئەچوون بە گژ مەلا موستەفادا و لە ڕاستیشدا ئەگەر ئەوانە نەبوونایە نەیرووی ئێران هەروا بەو ئاسانییە کاری خۆی لەگەڵ مەلادا نەئەبڕییەوە.

تا ئەو ڕۆژە کە ئیشیان بەو جۆرە کوردانە هەبوو بەوە، شانیان بەرزئەکردنەوە کە ئەمانە «شاە دۆستن!» و هەزار و یەك پەیمانیان ئەدانێ! لە پاشا کە ئیشی حوکوومەت لەگەڵ مەلادا یەك لایی بووەوە، نە پەیمان لە کایەدا ماو نە ئەو زمان‌خۆشییە لە ناوا ما!.

بە پێچەوانەی ئەوە نووسەرە بەکرێ گیراوەکان وەختێ قەڵەمیان ئەخستە سەرقاقەز بۆیان و باسیانیان ئەکرد ئەیانوت: «ئەمانە قازانجێکیان نەبوو، هەر ئەوەندە بوون ـ بە تەعبیری خۆیان ـ سیاهی لەشکر بوون!». ئەم چەند وشەیە هەموو خەڵات و بەرات و پەیمانەکەیان بوو کە پێیان ئەدرا!.. نووسەرەکان بەو جۆرە حەقایەق دەرئەبڕن. بەڵام لەلایەکی تریشەوە ئەم جۆرە قسەکردنانەیان بێگومان گوێ ئەو کوردانە ئەزرنگێنێتەوە کە ئەو ڕۆژە بۆ «بارەقەڵایەکی» ڕووت، دابوویانە پاڵ کاربەدەستەکانی ئێران و لە پاشیشا ئەو پەڵەڕەشەیان نووسان بە ناو چەوانی خۆیانەوە!. ئەمە تۆڵەی خزمەتکردنی بێگانەیە..

❁ ❁ ❁

«مەلا موستەفا» کە گەڕایەوە لە تاران و گەیشتەوە ناو بەرزانیەکان لە پاش قسەوباس بڕیاری شەڕیاندا لەگەڵ ئێرانا، ناوچەی شەڕیان لە «نەغدە» و «جەڵدیان»ەوە گواستەوە بۆ شاری «شنۆ» و شنۆیان کرد بە مەرکەزی قیادە، لەولاشەوە لەگەڵ زیرۆبەگ و تایەر ئاغا و ڕەشیدبەگی مەندی بەگ ـ کە ئەمانە لە عەشرەتەکانی شکاك و هەرکی و سەربە بەرزان بوون ـ دەمیان گەیشتە یەك و بڕیاریان هاتە سەر ئەوە کە ئەوان لە قۆڵی «ورمێ»وە و ئەمان لەم لاوە وەکوو سنگ ڕاوەستن و ئەگەر «ئێران» پەلاماریدان بچن بە گژیا.

ماوەیەکی پێچوو بەسەر گەڕانەوەی مەلا موستەفادا و هیچ دەنگێکی نەبوو، «قوام السلطنە» تێگەیشت کە مەلا موستەفا گوڵی خۆی لێوەشاند و تەفرەیدا!. سەرگوزەشتی ڕێوی و کۆترەکەی کەوتەوەبیر کە ئەڵێ:

(جارێك ڕێویەك کۆترێکی گرت. کۆترەکە وتی ئەگەر چارێکی خۆم نەکەم خوراوم. بە ڕێویەکەی وت: «ئەرێ مام ڕێوی بێقەوی نەبێ، پرسیار هیچی تێدا نییە، لە پێش ئەوەدا نۆشم کەی ئەمەوێ لێت بپرسم جەنابت خەڵکی کام وڵاتیت؟.». ڕێوی دەمی هەڵهێنایەوە و وتی «بانە».. هەرکە وتی [بانە] کۆترە لە دەمی هەڵفڕی و دای لە شەقەی باڵ و لێی دا ڕۆیشت!.

ڕێویەکە لە دوورەوە سەیری ئەکرد و جینگڵی ئەدا و ئەیوت: «ئاخ! ئەگەر ئەمجارە بەرپەلم کەوتیەوە ئەبێ بڵێم شار باژێڕیم، شارباژێڕیم!.» دانیشی بۆی چیڕ ئەکردەوە!..).

ئەمجا حوکوومەتی [تاران] بە هۆی «قوام السلطنە» و ڕەزم ئاراوە لە [١١ی شوباتی ١٩٤٧]

دا فەرمانی دەرکرد کە پەلاماری لەشکرەکانی «بەرزان» و شکاك و هەرکی لە [ورمێ] و دەشتی «سندوس» و شنۆ بدرێ و چەکیان لێ بسێنرێتەوە و خۆشیان لە ناو بەرن.

لەشکرێك لە ژێر فەرماندەیی «سەرتیپ زەنگنە» لە دەوروبەری «ورمێ»وە بۆ دۆڵی «قاسملوو» بەرێ خرا بۆ سەر زێرۆبەگ و تایەر ئاغا بۆ ئەوە نەیەڵن ئەمانە بگەن بە بەرزانییەکان.

لەشکرێك لە ژێر فەرماندەی «سەرهەنگ ئەنساری» لە سابڵاخ‌ەوە بۆ گرتنی نەغەدە.

لەشکرێك لە ژێر فەرماندەیی ڕەئیس ئەوەل «کلاشی» دا بۆ گرتنی قەڵای «پەسوێ».

لەشکری عەشایری مەنگوڕ و مامەش لە ژێر فەرماندەیی «بەهادوری»دا بۆ سەر مەلا موستەفا و بەرزانیەکان و بۆ دەوروبەری «خانە».

ئەم لەشکرانە بە هەموو هێزێکی هەوایی ـ فڕۆکە ـ [تۆپ] و [دەبابە] و مەترەلۆز و جبەخانەی حوکوومەتیەوە کەوتنە پەلاماردان ـ لە ٢١ی شوباتی ١٩٤٧ لەشکری سەرتیپ زەنگنە لە دۆڵی «قاسملوو» لەگەڵ نەیرووی زیرۆبەگ و شکاك‌دا کەوتنە شەڕەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە فڕۆکەو تۆپ و دەبابەی حوکوومەت وەکوو بارانی بەهار گوللەی ئەباراند، چەند ڕۆژێك ئەو شەڕە درێژەی کێشا، لە ئاخرا ڕۆژهەڵاتی ئەو ناوچەیە لە دەست نەیرووی حوکوومەت دەرهێنرا و کوشتار و بریندار لە هەر دوولا زۆر بوو.

لەم خەتەوە ئەمە ڕووی دا بەڵام لە خەتەکانی‌ترەوە سەیری شەڕ وا ئەکرا کە لەوانە بێ ئێرانیەکان پێشکەون. بەرزانیەکان لەبەر ئەوە بتوانن کەڵك لە ناوچەکانی «مەرگەوڕ» و «تەرگەوڕ» وەرگرن و مەیدانی شەڕیان فراوانتر بێ [تەگبیر]یان هاتە سەر ئەوە کە ناوچەکانی «پەسوێ، سۆفیان، جەڵدیان» بەجێ بێڵن و بەتەواوی بنکەی شەڕ ببەنە «شنۆ».

کە ئەمان لە جێ‌بەجێ کردنی ئەم ئیشەدا بوون حوکوومەتی [ئێران] کەوتە خۆی و لەشکرێکی پڕچەکی لە ژێر فەرماندەیی سەرهەنگ «نصراللّه» نیساری لە [١١ی مارتی ١٩٤٧]دا لە ورمێ‌وە بۆلای دۆڵی «ئەنهرچایی» بەرێ کرد بۆ ئەوە بتوانن «موان» داگیر کەن و بکەونە بەینی لەشکری عەشرەتی [ڕەشید بەگ] و [نووری بەگ] و عەشرەتی بەرزانەوە. کە گەیشتن لەگەڵ لەشکری عەشایری شکاکا کەوتنە شەڕێکی مردن و ژیانەوە، لە ئاخرا گەلێ لە شوێنەکانی ئەو ناوەیان داگیر کرد و ئەو ئارەزووە کە هەیانبوو؛

واتە بەیەك نەگەیشتنی شكاك و «بەرزان»، بۆیان پێكهات و تەنانەت [نووری بەگ] و [ڕەشید بەگ] خۆیان‌دا بە دەستەوە و چوونە «ورمێ»وە.

لەشكری «بەرزان» ئەو شوێنانە كە بە دەستیانەوە بوو لەگەڵ ئەو هەموو پەلامارەشا كە ئەبرایە سەریان ئاگاداری شوێنەكانی خۆیانیان ئەكرد و گەلێ جاریش نەیرووی ئێرانیان ئەگێڕایە دواوە و گەلێ كوژراو و برینداریشیان لێ ئەخستن.

ئێرانییەكان كە سەیریان كرد تا ئەم شوێنانە بەدەست بەرزانییەكانەوە بێ لەدانی كوژراو و بریندار بەولاوە نەبێ هیچ كەڵكێكی‌تر وەرناگرن. لەبەر ئەمە عێل جارِیان كرد و بڕیاریان دا كە بەهەر جۆر بووە پەلامارێكی شێلكانە بدەن و ئیشێكی وا بكەن كە ئەو شوێنانە لە دەست بەرزانییەكان دەرێنن.

لە [١٤ی مارتی ١٩٤٧]دا لە ژێر فەرماندەیی سەرهەنگ ئەنساری لە «قەڵاچوخ» پەلاماریان بردەسەر «ئەرنە». لە خوارەوە هێزی سەربازی نیزامی و تۆپ و دەبابە و لەسەریشەوە فڕۆكە كەوتەكار. لەگەڵ ئەم هەمووانەشا بەرزانییەكان دلێرانە هاتنە دەست و لە هەر دوولا كوشتارێكی زۆر پەیدا بوو، لە ئەفسەرەكانی ئێران «سید جەلالی ڕەحیمی» كوژراو لە ئاوایی «ئەرنە»ش (٧) كەس. لە ئەنجاما بەرزانییەكان بۆ شوێن قایم‌كردن فیكریان هاتە سەر ئەوە كە دەست لە لای شیمال هەڵبگرن و لە ناو شاری «شنۆ» جێ‌گیرببن و ڕوو بە جنووب پەلامار بدەن.

كە ئەم نەقشەیانە دامەزراند و لە «شنۆ» جێ‌گیر بوون، شاری شنۆ كرا بە شوێنێكی هەرە بەكاری جەنگی، مەلا بە جۆرێكی ڕەسمی بڵاوی كردەوە هەركە بە ئێرانییەكان نزیك بكەوێتەوە بە قسە وە یا بە نامە وە یا بە خەبەر و باس تۆڵەی خۆی زۆر بە خراپی ئەبینێتەوە.

ئەمجا لە [١٥ی مارتی ١٩٤٧]دا پەلاماری «نالس و نەلۆس»ی دا ـ كە لە لایەن هێزی ئێرانەوە ڕەئیس ئەوەڵ «كلاشی» بە هەموو چەشنە هێزێكی عەسكەریەوە لەوێ بوو ـ لە پاش شەڕێكی مەردانە مەركەزی «نەلۆس» كەوتە دەست بەرزانیەكان، «كلاشی» سەركردەی نەیرووی ئێران كوژرا، (٩) سەرباز بریندار بوو (٩٦) كەسیشیان لێ بەدیل گرتن، فیشەك و جبەخانە و خواردەمەنیەكی زۆریشیان هێنایەوە. لەم (٩٦)ە پێنجیان ئەفسەر بوون.

لە ڕۆژی (١٧)ی مارتدا نەیرووی [ئێران] لەو ناوەدا بڕیاریان‌دا کە پشتیوانی لەشکری مەرکەزی «سۆفیان» بکەن و بە هەموویانەوە هێرش بەرنە سەر بەرزانیەکان. ئەم نەخشەیانە جێ‌بەجێ کرد و پەلاماری خۆیانیان‌دا. لە ئەنجامی شەڕێکی گەرما، نەیرووی ئێران دیسان هیچی پێ نەکرا. سەرکردەی لەشکری پیادە ڕەئیس «ڕەزا قەرەباغی» کوژرا و لەهەر دوولاش کوشتار و بریندار پەیدا بوو. لێرەشا بەرزانیەکان گەلێ چەکی‌تریان لەگەڵ (١١) دیل ـ دا دەست کەوت و سەرکەوتن.

٭ ٭ ٭

کە ئیش گەیشتە ئەم شوێنە و تەماشا کرا نەیرووی «بەرزان» ڕۆژ بە ڕۆژ هەر لەسەر کەوتنایە، سەرۆکی نەیرووی ئێرانی ئەو ناوە «سەرتیپ فیووزی» نەخشەی گۆڕی و نەخشەیەکی‌تری دامەزراند؛ نەخشەیەکی وەها کە بە هەموو هێزێکیانەوە ئابلۆقەی بەرزانییەکان بدەن و شوێنیان پێ تەنگ کەنەوە، وە هەچ هێزێکی هەوایی و تانکی و زرێلی هەیە هەمووی بخرێتە کار. لەبەر ئەمە لە [١٩ی مارتی ١٩٤٧]دا فەرمانی بە بەش‌کردنی ئەم نەیروانە کرد بەم جۆرە:ـ

١ـ فەوجێك لە ژێر فەرماندەیی سەرهەنگ نیساری لە [موان]ەوە بچێت بۆ «نێرگی و ڕەزگا».

٢ـ فەوجێك لە ژێر فەرماندەیی سەرهەنگ پرتەوی بۆ داگیرکردنی «سلێوان» و یاریەدانی سەرهەنگ نیساری.

٣ـ فەوجێك لە ژێر فەرماندەیی سەرهەنگ فولادوەند لە دۆڵی «پەرەندێز»ەوە بۆ داگیرکردنی «ئاخ بلاخ»، کەمەرەزەرد، کرکل. قولقولە و بێزون» ـ ەوە.

٤ـ فەوجێك لە ژێر فەرماندەیی سەرهەنگ مەجیدی لە «نەغەدە»وە بۆ داگیرکردنی «پیرناسر» و کێوی پادار.

٥ـ فەوجێك لە ژێر فەرمانی سەرهەنگ بیگلەریدا بۆ پاراستنی دۆڵی قاسملوو، نەوەك بەرزانییەکان بچنە ناویەوە.

٦ـ فەوجێك لە ژێر فەرماندەیی «هومایوونی»دا بۆ پاراستنی بەینی [ورمێ] و سابلاخ و بۆ نەپچڕانی خەتی ئەو دوو شوێنە لە یەك و بۆ پشتیوانی کردنی نەیرووی «قاسملوو»یش.

٧ـ فەوجێك لە ژێر فەرماندەیی «سەرهەنگ ئەنساری»دا لە «سۆفیان»ەوە بۆ داگیرکردنی «نەڵۆس» و دەوروبەری نەڵۆس. ئەمانە بێجگە لە دەستەی عەشایری [مەنگوڕ و مامەش] کە لە ژێر فەرماندەیی «بەهادوری»دا بوون.

لەم سەردەمانەدا کە ئەمان ئەم جۆرە نەخشانەیان کێشا [عەلی حیجازی]یش لە لایەن حوکوومەتی عێراقەوە لە قۆڵی «زیندووی شێخی» و «حاجی هۆمەران»ەوە بە هێزێکی تەواوەوە ڕاوەستابوو بۆ ئەوە ئەگەر [مەلا موستەفا] و هێزی [بەرزان] بگەڕێنەوە بۆ دیوی «عێراق» ئەمیش لێرەوە سەری ڕێیان پێ بگرێت!

هەر بۆ ئەم کارقایمیە عبدولئیلاه و نووری سەعید لە [٢٢ی مارتی ١٩٤٧]دا خۆیان گەیاندە «حاجی هۆمەران» و ئەوی پێویست بوو لەم ڕووەوە ڕێگەیان بۆ «عەلی حیجازی» دانا. ئەمە و دیسان بە قسەی ڕاپۆری ئێرانیەکان، حوکوومەتی عێراق لەو سەردەمانەدا هەموو مانگێ (٣) هەزار دیناری عێراقی تەرخان کردبوو بۆ «شێخ ڕەشیدی» برادۆست کە ئەویش بە هێزی عەشایری ئەوناوە و موریدانی خۆیەوە هەموو دەمێ ئامادەی بە گژاچوونی مەلا موستەفا بێ!.

لە [٢٤ی مارتی ١٩٤٧]دا کە لە قۆڵی ئێرانەوە شەڕ لە جۆشی گەرمی دابوو «فضل اللّه» هومایونی سەرلەشکری نەیرووی ئێران لە «حاجی هۆمەران» لەگەڵ «عەلی حیجازی» چاویان بەیەك کەوت. عەلی حیجازی بڕیاری دایە کە دوو فەوجی سەربازی عێراقی - کە لە باپشتیان و مێرگەسوورن - بە هەموو چەکێکیانەوە لەگەڵ (١٢) فڕۆکەدا لە ماوەی (٢٤) سەعات بیانهێنێتە قۆڵی «حاجی هۆمەران» و بەربەستی مەلایان پێ بکا!.

لە خەتی عێراقەوە ئەمەکرا، ئەمجا لە خەتی سنووری تورکیاشەوە لە دەربەندی «بنارد» بە هۆی حوکوومەتی [تورکیا]وە ئەویش قایمکرا، ئەمەش بۆ ئەوە کە نەوەك مەلا لەو خەتەوە بچێتە خاکی تورکیا!. (٣) فەوجی تورکی، ئەو ناوەی تەنییەوە؛ یەکێك لە کێوەکانی «ئالانپراغ». یەکێ لە دەربەندی بنارد، یەکێکیش لە بەرانبەر «نێرگی و ڕەزگا»وە کە لەملاوە فەوجی سەرهەنگ نیساری - شی لێ بوو!.

ئەم تەرتیباتانە هەموو بۆ ئەوە کران کە ناوچەی دەسەڵاتی هێزی «مەلا موستەفا» بەتەواوی تەنگ بکەنەوە و بە هەر جۆر بووە بتوانن بەزیندوێتی یان بە مردوێتی بیخەنە گیر!.

بەم جۆرە ئەم نەخشانە کێشراو لە عەینی ڕۆژی (١٩)دا نەیرووەکانی نیساری و پرتەوی کەوتنە ئەنجامدانی فرمانی خۆیان و شەڕێکی قورس لەگەڵ بەرزانییەکانا دەستی پێکرد و لە «سلێوان» گەیشتنە یەك و بۆ لای «نێرگی و ڕەزگا» بەڕێکەوتن. لێرەدا لەشکری [بەرزانی] گیانبازیەکی مەردانەیان نواند و گەلێ کوشتار و بریندار لە دەستەی نەیرووی ئێران کەوت. لە بەرزانیەکان (٦) کوژراو و (١٢) بریندار ڕووی دا شەڕی ئەم خەتە تا (٢٥)ی مارت درێژەی کێشا.

لە [٢٦ی مارتی ١٩٤٧]دا شەڕی «خلج و ئۆرست» دەستی پێ کرد، لەم شەڕەدا ئێرانیەکان بە جەرگێکی قایمتر لە پۆلاوە هاتنە مەیدانەوە. دەستەی پێشمەرگە بە بێ ئەوە کۆ لە مردن بکەنەوە پەلاماری خلج و ئۆرستیان دا، نەیرووەکانیتریش لە پشتیانەوە بە گیان و دڵ پشتیوانیان ئەکردن، لە سەرەوە فڕۆکە بۆ، بۆمبا هاویشتن لەواشە و هەڵۆ تیژتر بوو!. دەبابە و زرێلی و تۆپی کێو هەڵکەنی کێوی بۆ پێشکەوتن و گوللە هاویشتن هەناسە لە شوێن هەناسە لە کارا بوون!. لە ئەنجامی ئەم شەڕەدا تاکی تەرازووی «بەرزان» قورستر بوو، لە نەیرووی ئێرانی دوو ئەفسەر «سید موحەممەدی ئیمامی» و «هاتفی» لەگەڵ سەربازێکی بێشومارا لە «ئۆرست» کوژران. ئەفسەر [جەهانپاك] و (١٥) سەربازیش بە دیل کەوتنە دەست بەرزانییەکان لەگەڵ گەلێ جبەخانە و خواردەمەنیەکی زۆردا، سێ فڕۆکەشیان لە کارخست. لە لەشکری بەرزانیش (٣) کوژراو و چەند بریندارێك ڕووی‌دا.

لەم کاتەدا فەوجی سەرهەنگ مەجیدیش گەیشت، ئەویش بە تۆپ و زرێلی جەنگی و بەشە فڕۆکەی خۆیەوە دایە پاڵ ئەو نەیرووەی ئێرانە کە لە شەڕابوون. مەبەستی ئەمان ئەوەبوو کە ئیشێکی وا بکەن «پیرناسر» و کێوی «پیردار» لە دەست بەرزانییەکان بسێنن بەرزانییەکان لەشکرەکەی پێشوو شەکەتی کردبوون کە ئەمانەش هاتن دایانە پاڵیان لەوانەبوو بشکێن، بەڵام مەردانە خۆیان کۆ کردەوە، هەرچەندە کێوی پیرداریان دا بە دەستەوە بەڵام بە جۆرێك کە کاروباریان تێك نەچێ، لەسەنگەرێکیترا بە هێمنی خۆیان دامەزراندەوە، لەم شەڕەشا ئەفسەر «ڕەئوفی» لە نەیرووی ئێران لەگەڵ (١٨) سەربازدا بریندار بوون و کوژراویش گەیشتە (٢٥). لە بەرزانییەکان (٦) کوژراو و (١١) بریندار ڕووی دا.

بەڵێ کێوی پیرداریان‌دا بە دەستەوە. ئەوەندە هەبوو ئایا چۆن درا بە دەستەوە؟. ئەمە لەسەر شایەتی دوژمن کە بۆیان ئەدا:

هێزی ئەو شوێنەی ئێرانی هەمووی ڕووی کردبووە «پیردار» تەماشا ئەکەن وەکوو باران، گوللەیان بەسەرا دێتە خوارەوە، ئەمانیش لە هەر چوار لای کێوەکەوە بینیان پێوە ناوە بۆ پێشکەوتن و هیچ کۆلە و گوللانە ناکەنەوە. بە تایبەتی [دەبابە] و زرێلییەك سنگ ئەنین بۆ پێشەوەو هەر ئەڕۆن، لەولاشەوە گولله باران هەر هەیە.

لەم شوێنەدا بەرزانییەکان بۆ ئەوە سەنگەرەکەی‌تر قایم کەنەوە کشابوونەوە بۆ ئەولا، تەنها تاقە بەرزانییەك مابووەوە لە سەنگەرەکەدا و ئەو تاقە کەسەبوو کە ئەو هێرشەی ئەبردە سەر ئەو هەموو هێزەی ئێرانە. ئەو تاقە بەرزانییە شوێنەکەی خۆی نەدا بە دەستەوە و لەشەڕکردن نەکەوت تا دەبابەکە چوو بە سەریا و بە ڕەوڕەوەی دەبابەکە شەهیدبووا.

شوێنی دووسەد گوللەی ئەم تاقە بەرزانیە بە دەبابەکەوە بوو، هەر دوو چراکانی ورد کردبوو، گولله هاوێژی زرێلییەکەی کون کون کردبوو، تۆپێك لەگەڵ ئەو هێزەدابوو، گوللەی ئەم تاقە «بەرزان»یە بە درێژایی دابووی لە ناوەراستی لولە تۆپەکەو تۆپەکەی لە کار خستبووا.

ئەمە بوو گیان بەخت‌کردنی «بەرزانی» لە شەڕی ئێرانا، خۆیشی نەدا بە دەستەوە تا ئاخر تنۆکی خوێنی لە ڕێگەی قەومییەتی خۆیا لە ژێر ڕەوڕەوەی «دەبابە»ی دوژمنا بەخت کردا.

ڕۆژی (٢٩)ی مارت فەوجی سەرهەنگ فولادوەند کە بۆ [پەرەندێز] دانرابوو بەڕێ‌کەوتن و گەیشتنە دەوروبەری «ئاخ بلاخ». لە ڕۆژی (٣٠)دا کەوتە شەڕەوە، بەرزانیەکان دلێرانە بەرەنگاریان بوون و بۆ پارستنی شوێن و جێگای خۆیان کۆششیان ئەکرد. لەوانەبوو کە نەیرووی [ئێران] بشکێت لەوکاتەدا فەرمان درا بە هێزی هەوایی و بە تانکی و زرێلی جەنگی، کە ئەوانیش بکەونەوە ئیشەوە، گولله تۆپ و مەترەلۆز و بۆمبا وەکوو بارانی بەهار هەموو شیو و دۆڵ و کلاوەکانی داگرت، بە هۆی ئەم هەموو هێزە ئاگرینانەوە توانیان لە پاش زیانێکی زۆر ئەو شوێنانە لە دەست بەرزانییەکان وەربگرن

و بەرزانییەکان بۆ ئەوە کوشتاری کەمتر بدەن بە دەستەوە شوێنەکانیان بەجێ هێشت و گەڕانەوە دواوە. لەم شەڕەدا لە نەیرووی ئێران ئەفسەرێك ـ تاج فەر ـ و دوو سەرباز بریندار بوون و (١٦) سەربازیش کوژران. لە بەرزان (٨) کوژراوو (١٢) بریندار پەیدا بوو.

کە بەرزانییەکان پشتاوپشت گەڕانەوە و نەیرووی ئێران «قولقولە» و «کەمەرەزەرد» و ئەو ناوانەیان داگیر کرد بەبێ پشوو فەوجی سەرهەنگ ئەنساری و سەرهەنگ غەفارییش دایانە پاڵ ئەو نەیرووانە و فڕۆکە و زرێلی و تۆپی هەموو لایەکێشیان بە جارێ بوون بە یەك و لە (٢٥)ی نیساندا بە کۆمەڵی، هێرشیان هێنایە سەر بەرزانییەکان، ئەم لەشکرە زۆرە لە ژێر سێبەری ئەو هەموو هێزە ئاسمانیەدا هەنگاو بە هەنگاو پێش ئەکەوتن. بەرزانییە نەبەزەکان لەگەڵ ئەم هەموو هێزی دوژمنەدا وە لەگەڵ ئەوەدا کە ناوچەی شەڕیشیان تەنگ کرابووەوە هەر مەردانە و دلێرانە سنگی خۆیانیان ئەنا بە گوللەوە و لە شوێنی خۆیانا ئەچەقین!.

کە، لەولایەوە بۆمبا بارانی فڕۆکە و لەلایەکەوە هاژەی گوللەی تۆپ و پێشکەوتنی زرێلی و دەبابە زیاتر هێزی ئەسەند ئەمان ناچار بوون بەوە کە «نەلۆس» و «سنگیان» بەجێ بێلن و خۆیان بگەیەننە «گەلاس» و ئەو ناوە بەتەواوی چۆڵ کەن.

لەولاشەوە هێزی عەشایری مەنگوڕ و مامەش ـ کە لە ژێر فەرماندەیی بەهادوریدا بوون ـ لەگەڵ عەینی فەوجی بەهادوریدا لە گوندەکانی «تازراس و ناناس» هێرشیان بردە سەر لەشکری دیموکرات ـ کە لە ژێر فەرماندەیی زێرۆبەگ و تایەر ئاغادابوون ـ لەو هێرشەی ئەوانیشا کێوەکانی «دۆڵی» لە دەست بەرزانییەکان دەرچوو لەشکرەکەی «زێرۆبەگ» و «تایەر ئاغا» ڕوو بە «سێ ئاوان» گەڕانەوە بۆ دواوە و لە «گەلاس» لەگەڵ بەرزانییەکان یەکیان گرتەوە.

دەورەی شەڕ لە دەوری بەرزانییەکان هەر تەنگتر ئەبووەوە، ڕۆژبەڕۆژ نەیرووەکانی [ئێران] زیاتر یەکیان ئەگرتەوە، ئەم یەكگرتنەی ئەوان ئەبوو بە زیادە هێزێك بۆیان و ئەبوو بە مایەی بچووككردنەوەی مەیدانی شەڕی ئەمان. فڕۆکە و تۆپ و دەبابە و زرێلییەکان بە هەموو سوپاکانیانەوە هێرشیان هێنایە سەر «شنۆ» ـ کە مەرکەزی جەنگ و فەرماندەی بەرزانییەکان بوو ـ هێزی حوکوومەت لە لایەك و هێزی مەنگوڕ و مامەش

لە لایەك. [بەرزان]ی دلێر بە بێ‌ترس چەند ڕۆژێك لە ژێر ئەم ئاگر باران و گوللە و بۆمبا بارانەدا خۆی ڕاگرت و شێرانە جەنگی کرد. سەرباری ئەمانەش «مووساخانی» زەرزا بەخۆی و سوارەکانیەوە هەر لە ناو شارەکەدا بەرەنگاریان بوو!.

لە ئاخرا لەبەر ئەوە کە مەیدانی شەڕەکەیان هەتا ئەهات هەر تەنگتر ئەبووەوە، وە بۆ ئەوە نەکەونە داوەوە و پشتیشیان لێ نەگیرێ لە [٦ی نیسانی ١٩٤٧]دا شاری «شنۆ»یان چۆڵ کرد و کەوتنە پشتی «شنۆ» و ڕووبەڕووی خاکی عێراق گەڕانەوە. نەیرووە هەوایی و ئاسنینەکانی ئێران بە گوللەی تۆپ و بۆمبا ڕەوانەیان ئەکردن!. لەگەڵ ئەم هەموو هێرشانەشا کە ئەکرایە سەریان گەڕانەوەیان لە سەنگەرەکانیان بەو ڕێکوپێکیە سەرداره جەنگیەکانی ئێرانی سەرسام کردبوو!.

[فڕۆکە] بە بێ ڕەحمانە بۆمبا بارانی ژن و منالی بەرزانیەکانی ئەکرد، لەگەڵ ئەمەشا ئەو دیلانەی ئێرانیەکان کە کەوتبوونە لای بەرزانیەکان بەرانبەر بە بۆمبا بارانەکەی ئەوان ئەمان بە مەردانە خزمەتیان ئەکردن.

لە پاش ئەوە کە لە دۆڵی «گەلاس» دەرچوون بۆ ئەوە تۆزێ ئەرکی گەڕان و هەڵسووڕانیان کەمتر ببێتەوە ئەوەندە بە تەنگ ئەوەوە نەمان کە ئاگاداری دیلەکان بکەن. وەکوو بڵێت بە زمانی حاڵ پێیان ئەوتن کە بڕۆن!. دیلەکان ئەم شڵەژانەی ئەمانیان بە هەل‌زانی هەڵاتن و گەڕانەوە بۆ ناوچەی ئێرانییەکان.

بەرزانی دلێر بەم جۆرە لە شەڕی مردن و ژیانا بوو و وردە وردە بە جۆرێکی ڕێکوپێك لە پردی «قادر» و ناوچەی «تاڵجاڕ» و کێوەکانی «کێلەشین» و «مەرگ زیارەت»ەوە بەرەو پاش ئەگەڕایەوە تا لە ڕۆژی [١٧ و ١٨ی نیسانی ١٩٤٧]دا هاتەوە ناو خاکی عێراق، هاتەوە لە ژێر بارانی گوللەی تۆپ و مەترەلۆز و لە ژێر بۆمبای فڕۆکەدا!.

لە ئەنجامی ئەم شەڕەی بەرزانی و ئێرانیەکانا (٥) قائید و (٤٠) ئەفسەر و (٢٠٥) کوژراو لە ئێرانیەکان پەیدا بوو لەگەڵ (٣٠٠) بریندارا. لەو کوردانەی کە لەگەڵ ئێرانییەکانا شەڕیان لەگەڵ بەرزانییەکان ئەکرد لەوانیش (٣٤) کوژراو و (٥٣) بریندار ڕووی دا.

لە دەستەی بەرزانیش لە هەموو شەڕەکانا (١٢٠) شەهید و (٢٥٠) بریندار ڕووی دا.

* * *

[مەلا موستەفا بەرزانی] و هەموو دەستەی بەرزانییەکان بەم جۆرە ڕوویان کردەوە خاکی عێراق و گەڕانەوە، بەڵام ئایا ئەوانەی کە تەئریخ ئەخوێننەوە وە یا ئەوانەی کەوا کاروباری سیاسەت و شەڕ و شۆڕ هەڵئەسووڕێنن بە چە چاوێکەوە.؟ یا، بە چە باوەڕێکەوە سەیری ئەم گەڕانەوەیە و سەیری ئەم پەردانە ئەکەن؟..

ئایا بەو چاوەوە سەیری ئەکەن کە ئەڵێن لەشکرێك بوو شەڕی کرد و شکاو گەڕایەوە؟. وە یا ئەڵێن لەشکرێك بوو تا ئاخر هەناسە جەنگی کرد و پاشان بەسەرکەوتووی گەڕایەوە؟.

بێگومان هەموو کەسێك و هەموو جەنگاوەرێك ئەم باوەڕەی دووهەم وەرئەگرێ؛ چونکە هەموو پیاوە گەورەکانی مەیدانی سیاسەت و شەڕ، لە کاتێکا کە بیانەوێ شانازی بە لەشکرەکەی خۆیانەوە بکەن ئەڵێن لەفلانە خەتی جەنگ بە جۆرێکی ڕێکوپێك گەڕاینەوە. وەکوو هەموو جار «چەرچل» لە ناوەندی ئەم شەڕی دووهەمەدا شانازی بەوەوە ئەکرد کە ئەیوت نەیرووەکەی ئێمە لە فلانە شوێن بە جۆرێکی ڕێك وپێك گەڕایەوە دواوە.

ئەم قسەیە وە ئەم ڕێگەیە زۆری تێدایە؛ مەعنای وایە دوژمن زۆر زاڵ بووە، لەگەڵ ئەو زاڵیەشا دەستەی ئەم، ئەو دەرفەتەیان نەداونەتێ کە بیانگرن وە یا شتومەکیان بە تالان بەرن. ئەم جۆرە شتانە بۆ مەیدانی شەڕ و شۆڕ بەگەورەتر سەرکەوتن دائەنرێ.

لەشکری [بەرزان] لەگەڵ ئەوەدا کە دوژمن لە هەموو کاتێکا دە ئەوەندەی ئەمان بوون، وە هەر جۆرە چەکێکی تازە لە فڕۆکە، لە زرێلی، لە تۆپ، لە دەبابە بە دەسەلاتێکی حوکوومەتی و بە جۆرێکی بێشومار لەلایان بووە، لەگەڵ ئەمانەشا [بەرزان] توانی بەرانبەری ئەو هێزە بێئەندازەیە بکا، وە لە گەلێ وەختدا و لە گەلێ شوێندا دیلیان لێ بگرێ و تالانیان لێ بسێنێ، وە جەنگاوەریەکەی بگاتە پایەیەك کە دیلێکی لێ نەگیرێ، لەگەڵ ئەو هەموو منالّ و خێزانەدا کە لەگەڵیان بووە منالێك نەدا بە دەستەوە وە یا تفەنگێك نەدۆڕێنێ، بە هەموو ئازاییێك و نەبەزیەکەوە بەرانبەری ئەولێشاوە حوکوومەتیە بکات و چۆن ڕۆیشتووە بەو جۆرە بگاتەوە ولاتی خۆی!. بێگومان ئەمە لە مەیدانی شەڕ و سیاسەتا بە گەورەتر سەرکەوتن دائەنرێ و سەرۆکی ئەم لەشکرە کە ئەم نەخشانە دائەڕێژێ بە یەکێ لە بلیمەتە هەرە گەورەکانی پیاوی جەنگی دائەنرێ.

• • •

وەزارەتی «سالْح جەبر» بوو لە عێراقا، دوودانە لە کوردەکان ـ تۆفیق وەهبی و جەمال بابان ـ بە ناوی وەزیری کوردەوە وەزیری مەعارف و عەدلیەبوون. مەلا موستەفا کە بەو جۆرە حوکوومەتی ئێران لە هەموو لایەکەوە پەلاماری‌دا ئەوە بوو لە [١٧ و ١٨ای نیسانی ١٩٤٧]دا خۆی و هەموو بەرزانییەکان هاتنەوە ناو وڵاتی عێراق و ئێرانیان بەجێ هێشت. ئەمانەش کە هاتنەوە عیبارەت بوون لە (٤٥٦٥) کەس؛ (١٥٥٠) پیاو، (١٦٨٦) ئافرەت، (١٣٢٩) منالْ.

حوکوومەتی عێراقی ئەو سوپا و سەنگەرانە کە تا دەرچوونی [مەلا موستەفا ]لە جاری یەکەمدا لە عێراقا لەو وڵاتە هەیبوو لەماوەی نەمانی ئەما سەنگەر و نوختە و قۆشەنی زیاتر کردبوو، چونکە هەموو ڕۆژێك ترسی گەڕانەوەی «مەلا موستەفا»ی هەرهەبوو!. کە مەلا گەڕایەوە، گەڕایەوە بە سەر شوێنێکا کە هەموو سووچێکی بە هەموو جۆرە چەکێکی حوکوومەت قایم کراوە، لە «ڕواندز»ەوە تا ئەچێتە «زاخۆ» هیچ شوێنێك نەماوەتەوە کە خالْی بێ لە هێزی حوکوومەت و لەو کوردانە کە نایانەوێ «مەلا موستەفا» لەو وڵاتەدا بژێت!.

مەلا سەیری کرد ڕوو بکاتە هەر لایەك لە بارانی گوللەی بێ‌ئامان بەولاوە هیچی‌تر پێشوازی ئەم ژن و منداڵانە ناکا کە لەگەڵین. بە ناچاری کەوتە قسەکردن لەگەڵ حوکوومەتی [سالح جەبر]دا بۆ حوکوومەت لێیان خۆشبێ و ئەمانیش بتوانن وەکوو هەموو نیشتمانیەك لەوڵاتەکەی خۆیانا دانیشن. حوکوومەت ئەم قسانەی نەچوو بە گوێچکەدا و هەر لە سەر ئەو قسەیە بوو کە بە بێ هیچ قسەیەك وە یا هیچ مەرجێك ئەبێ خۆیان بدەن بە دەستەوە!.

کە ئیش گەیشتە ئەم شوێنە مەلا موستەفا و [شێخ ئەحمەدی براگەورە] و سەرۆکەکانی [بەرزانی] و زابتەکان بوون بە دوو دەستەوە؛ دەستەیەکیان وتیان وەکوو حوکوومەت ئەیلێ بەو جۆرە خۆمان بدەین بە دەستەوە. مەلاش لەسەر ئەو قسەیە بوو کە بەم جۆرە نابێ لە ئاخرا [شێخ ئەحمەدی براگەورە] و هەندێك لە زابتەکان بڕیاریان‌دا کە خۆیان بدەن بەدەستەوە. مەلا موستەفا و «میرحاج» و چەند زابتێکی‌تریش هەر لە سەر قسەی خۆیان مانەوە کە مادام ئەمان چەکیان هەیە خۆیان نادەن بە دەستەوە، ژن و منالْ با خۆی بدا بە دەستەوە.

لەسەر ئەمە «شێخ ئەحمەد» و «عیزەت عەزیز» و چەند زابتێكی‌تر لە (١٩٤٧/٥/٦) دا ژن و منداڵ و ئەوانەش كە ئارەزوویان لێبوو ئەو سەردەمە «عەلی حیجازی» لەو دەورەبوو خۆیان و چەكیان‌دا بە دەست ئەوەوە لەسەر ئەو ئیعتیبارە كە حوكوومەت لێیان خۆشببێ، [مەلا موستەفا] و ئەوانەش كە لەگەڵی مانەوە لە پیاوی تفەنگچی و ڕەبەن، لە شوێنەكەی خۆیان مانەوە و خۆیان نەدا بەدەستەوە و هەر كەوتنە موخابرە و قسەكردن لەگەڵ حوكوومەتا كە لێیان خۆشببێ.

كە [شێخ ئەحمەد] و ئەوان خۆیان‌دا بە دەستەوە حوكوومەت لە باتی ئەوە میهرەبانیان لەگەڵ بنوێنێ هێنای هەموویانی تەفروتووناى وڵاتەكانی [بەسرە]، [ناسریە]، [حلە و كەربەلا] كرد و بەبێ دەرەتانی لەو ناوەدا بڵاوی كردنەوە و لەگۆشەی حەپسخانەكانا ژاراوی مەرگیان ئەچێشت!. ئەوانەشیان كە ژن و منداڵ بوون لە وڵاتەكانی هەولێر و بیتوێن بەناهومێدی مانەوە. سەرەڕای ئەمەش لە (١٩٤٩)دا دیسان فەرمانێكی‌تر دەركرایەوە كە ئەم ژن و منداڵانە ئەوەندەی‌تر لەو شوێنانە دوور بخرێنەوە!.

بەڵێ لە پاش ئەوە كە ئەمانە خۆیان‌دا بە دەستەوە، حوكوومەت لە میزانیەی ساڵی «١٩٤٧» (١٠٠) هەزار دیناری دانا كە بدرێ بە خواردن و جل‌وبەرگ بۆ ئەم ژن و منداڵە كەساسە دەربەدەرانە. «بهاءالدین نوری» و «عزالدین ملا» سەروكاری دابەش‌كردنی ئەم پارەیەیان ئەكرد بە سەریانا ـ ئەم دوو كەسەش نائیبی كورد بوون ـ لە بەخێوكردنی ژن و منداڵی بەرزانییەكان لەم پارەیە ئەوەبوو كەهەر لەو ساڵەدا یەكێك لەو كەسانە كە نانی بەرزانییەكانی چاو پێ‌كەوت نووسەری ئەم كتێبە بوو، لە هەولێر ئەو نانەیان پێشان‌دام كە ئەیاندا بە بەرزانی، نانەكەش عیبارەت بوو لە گەچ و لە ئارد كە تێكڵاو كرابوون!..

ئەمان بەم جۆرە بەكەساسی كەوتنە گۆشەی حەپسخانە و وڵاتەكانەوە، [مەلا موستەفا] و [میرحاج] و هاوڕێكانیشی لەو لاوە هەر داوای لێخۆش‌بوون و لێبووردنیان ئەكرد. حوكوومەت و پیاوانی حوكوومەت لەباتی ئەوە لێیان خۆشبن و ئەمن و ئاسایش بخەنە وڵاتەوە هێنایان لە [٦ی مایس ١٩٤٧]دا سەر لەنوێ ـ ئیعلانی ئەحكامی عورفییان لەوڵاتەكانی «ڕواندز» و «زێبار و ئەو ناوەدا دانایەوە و عەبدولئیلاه مۆری كرد! بە دانانی ئەم عورفیە ئەوەندەی‌تر ترسیان خستە بەر ئەو وڵاتە و ئەوەندەی‌تر «مەلا موستەفا»یان لە خۆیان دوور خستەوە.

ڕۆژی [٥ی حوزەیرانی ١٩٤٧] بوو، لە بەغدادا هەندێك لە پیاوە کوردەکانی بەغدا و نائیبەکان و قوتابی دانشگاکان کۆبوونەوە بەو نیازە کە بچن بۆ لای [عەبدولئیلاهـ] تکای لێ بکەن بۆ ئەوە لە بەرزانییەکان و ئەفسەرەکان خۆشببێ. قسەیان هاتە سەر ئەوە کە من بچم بۆ لای یەکێ لە، دوو وەزیـرە کـوردەکان ـ کـە لـەوەزارەتا بـوون ـ بۆ ئـەوە ئەویش بەو ناوەوە کـە وەزیـرێکی کوردە لەگـەڵ خەڵکەکـەدا بێـت و بچن بـۆلای عەبدولئیلاهـ. کە چووم جوابێکی ئەوەندە ناپەسـەندی دامەوە مەگەر هەر ئەو بزانێ جوابی وا جوان لە ناپەسەندیدا بداتەوە! با [تاریخ] ئەو پرسیار و وەڵامە بێڵێتەوە بۆ «یادداشت»ەکەم، ئەگەر چاپکرا ئەو وەختە ئەیخوێنینەوە!..

هەندێك لەو ئەفسـەرانە کە وەختی خۆی لەگەڵ مەلا موستەفادا ڕۆیشتبوون: «ڕەئیس ئـەوەڵ ڕوکـن عیـزەت عەبدولعەزیـز، ڕەئیـس ئـەوەڵ موستەفا خۆشـناو، ڕەئیـس خیروڵڵا عەبدولکەریم، مولازم موحەممەد مەحموود قودسی» بوون. وەختی خۆی ئەمانە بە بێ‌ئەوە خۆیان بە ڕووەوە بن ئەحکامی عورفی ساڵانی (١٩٤٥) حوکمی خنکاندنی دابوو بە سەریانا. کـە [شـێخ ئەحمـەد] خۆی‌دا بە دەستەوە ئەمانـەش بەو نیازە کـە لێیان بـبوورن لەگەڵ ئەوا خۆیان‌دا بە دەستەوە. کە کەوتنە گیر، سـەرلە نوێ لە ـ مەحکەمەی عورفی ـ ئەمسـاڵەدا بە جۆرێکی لام سەرلایی! موحاکەمە کرانەوە و بڕیاری حوکمی خنکاندنەکەیان درایەوە.

لەگەڵ ئەوەشـا کە گەلێ کەس کۆششـی کرد بۆ نەخنکاندنی ئەمانە، لە بەیانی پێنج شەنبەی [١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧] لە بەندیخانەی بەغدا هەر چواریان خنکێنران و بوون بە قۆچی قوربانی چڵێسی عەبدولئیلاهـ و پیاوانی عەبدولئیلاهـ. پاشان تەرمەکانیان برانەوە بۆ سـولەیمانی، هەولێـر و ئامێـدی، شـەعبی دڵ برینـدار قـوڕی گۆڕەکانیانـی بەلافـاوی فرمێسکی چاویان گرتەوە و ناشتنیان، دووکەڵی کزەی دڵی ئەو شـەعبە ئێستەش لەسەر گۆڕەکانیان سێبەری کردووە بۆ ئەوە بزانن کە هەر لە دڵی میللەتان و قەت دەرناچن.

ئەمەش وێنەی ئەو نامەو وەسیەتنامەیەیە کە بە (١٤) سەعات پێش خنکاندنیان بە دەستنووسی [موحەممەد مەحموود] نووسیویانە و داویانە بە میللەتی کورد؛ داویانێ بە دیاری لە شوێنی لەشەکەی خۆیان:[1]

---

١. [ چونکـە نامەکـە دەسـخەت بـوو و کەمێکیـش کاڵ بووبووەوە، ترسـاین کە لە چاپدا جـوان دەرنەچێ، بۆیە هاتین نامەکەمان پیت‌چنی کردەوە بۆ ئەوە ئاسانتر بخوێرێتەوە ـ بڵاوکەرەوە.].

[بەغداد ١٨ / حزیران /١٩٧٤
لە شوهەدای ڕێگای نیشتمانەوە
«عزّت عبدالعزیز و مصطفی خوشناو و خیر اللّه عبدالکریم و محمد محمود»ەوە
بۆ برایانی میللەتی کوردی خۆشەویست
لە دوای تەبلیغی حوکمی ئیعدام بە یەك سەعات نووسراوە
برایان!

لە ژیانی ژێردەستی و ئیستیعماردا لە نووسینی ئەم نامەیەوە تەنها ١٤ سەعاتمان ماوە بە پەتی ئیستیعمار دەگەینە دنیای ئازادی و گیانمان دەگاتە گیانی پاکی شوهەدای ڕێگا نیشتمان.

برایان!

خۆمان زۆر بە بەختیار دەزانین کە بەرابەر واجبی میللی هیچ دوا نەکەوتین، تەنها نەسیحەتی ئێمە ئەوەیە کە لاوان و نیشتمانپەروەرانی کورد یەکڕایی زات بکەنە نیشانە و یەکیەتی بکەنە پەیڕەوی خۆیان بۆ شکاندنی تەوقی ئیستیعمار و ڕزگارکردنی هەموو میللەتێکی مەزلووم بێ جیاوازی.

برایان!

دوژمنی جەهالەت بن و بە هەموو توانا شەڕی جەهالەت بکەن و دوای جەهالەت مەکەون. ئێمە نیشانەی تێکۆشینی خۆمان بە میللەتی کوردی لە ساڵی ١٩٤٧دا. برایانی ئێمە کە ماون بۆ ڕزگاری شەرەف تێدەکۆشن و پشت بە خوای گەورە میللەت ڕزگار دەبێت.

برایان!

هاتنمانە بەر سێدارە لە بێدەسەڵاتیەوە و سێ و دووکردنەوە نەبوو بۆ تێکۆشین؛ بەڵکوو هەر وەکوو سەربازێکی ئازاد و بۆ ئازادی تا ئاخرین توانا هەوڵمان دا و گەیشتینە ئەم نەتیجە. ئیدی بۆ یەکیەتی و بۆ ئازادی بژی کورد و کوردستان.

خیراللّه عبدالکریم. مصطفی خوشناو. عزت عبدالعزیز. محمد محمود]

بەم جۆرە ئەم وەسیەتنامەیانە نووسی بۆ گەلەکەیان و پاش (١٤) سەعاتە، کە برانە بەر «قەنارە»کەش لەو وەختەدا پەتەکەیان ئەکردە ملی خۆیانەوە هەر یەکە بە وتەیەکی تەئریخی ماڵاواییان لە عالەمی کورد کرد!.

سەرەتا کە [عیزەت عەبدولعەزیز] هێنرا وتی:

«دوا ئامۆژگاریم ئەمەیە بۆ گەلەکەم ئەم ڕێگایەی من گرتوومە ئەوانیش بیگرن، مردن لە پێناوی کامەرانی گەل، بەرزترین سەربەرزییە بۆ ئادەمیزاد.».

کە [موستەفا خۆشناو] هێنرا وتی:

«داری ئازادی گەلان بە خوێن ئاو ئەدرێت. با خوێنی منیش دڵۆپێك بێت لەو خوێنە بۆ ئازادی عێراق و گەلی کورد. بژی کورد و کوردستان بە ئازادی و سەربەستی.»

کە [خیراللّە] هێنرا وتی:

«ئیستیعمار و نۆکەرانی ئیستیعمار! ئەتوانن من و سەدهای وەك من بکوژن، بەڵام ناتوانن (١٢) میلیون کورد و میلیونەها ئازادیخواز لە جیهانا لەناو بەرن!.».

کە [موحەممەد قودسی] هێنرا ئاخر هەناسەی لەسەر ئەم قسەیە بڕایەوە:

«مردن لەڕێگای وڵات خۆشترین شتە ئادەمیزاد دەستی بکەوێ، ئێمەش لەڕۆژی لە دایك بوونمانەوە هەر بە ئاواتی ئەمەبووین کە لە ڕێگای ئازادی کورد و کوردستان و کامەرانی گەلانی‌ترا سەربنینەوە!.».

* * *

کە [شێخ ئەحمەد] و یارانی خۆیان دا بە دەستەوە [مەلا موستەفا] مایەوە سەرخۆی و (٨٠٠) کەسێکی پیاوی جەنگاوەری [بەرزانی]. ئەوە بوو هەر لە کۆششی ئەوەدابوو کە حوکوومەت لێی خۆش بێ و لەوڵاتی خۆی دانیشێتەوە. کەچی حوکوومەت لە باتی داڵدەدانی ـ ئیعلانی ئەحکامی عورفی ـ بۆ کرد و وڵاتی «ڕواندز» و «زێبار» و «بەرزانی» بە هەموو هێزێکی ئاسمانی و سەرزەوی عێراقی و ئینگلیزی پڕپڕ کرد! لەگەڵ ئەمەشا هەندێ لە عەشایری ئەو دەورەی دیسان لێ هان‌دایەوە و بە هەموویانەوە ئەو وڵاتەیان لێ تەنگ کردەوە.

[مەلا موستەفا] کەوتە بەینی دوو ئاگرەوە؛ یا ئەمەتە ئەبێ خۆی بدا بە دەستەوە و

بیبەنە ژێر سێدارە!، یا ئەمەتە ئەبێ جەنگ بکا، وەکوو گەلای دار خەڵك بکوژێ و لێی بکوژن!. بۆ ئەوە خۆی لەم دوو ئاگرە ڕزگار کا هیچ چارێکیتری نەدیوە ئەوە نەبێ کە ئەمجارەش خاکی عێراق بەجێ بێڵێ چۆنیشی بەجێی بێڵێ؟ ئەو کەوتۆتە بەینی سێ سنوورەوە؛ عێراق، ئێران و تورکیا. هێزە بێئامانەکانی ئەم حوکوومەتانە سنوورەکانیان وەکوو زنجیر تەنیوە!.. چار نییە ڕووبەڕووی وڵاتان هەر ئەبێ بڕوا.

لە [٢٥ی مارسی ١٩٤٧]دا دیسانەوە خاکی عێراقی لەناو ئەو ئاگربارانەدا بە خۆی و هێزەکەیەوە بەجێهێشت و بە کێوە هەرە بەرز و شاخە هەڵدێرەکانا ڕوو بە وڵاتی تورکیا ڕۆیشتن. لە دەوروبەری «تەرگەوڕ» لە خاکی تورکیا نەیرووی تورکی سەری ڕێگەی پێگرتن. خۆیان نەدا بە دەستەوە، هەر بە شاخەکانا ڕووبەڕووی خاکی «ئێران» بوونەوە و لەلا ڕێگەی کێوەکانەوە ڕێگەی وڵاتی ڕووسیایان گرت، لە ژێر پەلاماری لەشکرەکانی عێراق و تورکیا ڕزگاریان بوو، نەیرووی ئێرانی بەفڕۆکە و تانکی بە شوێنیانەوە بوو، ئەمان هەر ئەوەندەیان پێ ئەکرا کە خۆیان لادەن و بە هەموو جۆرێك خۆیان لەشەڕ بپارێزن.

ئەمانە بەم جۆرە بەشاخەکانا و بەناو قوڕ و چڵپاوی ئەو کێوانەدا و بە ستار گرتن لەناو ئەشکەوتەکانا تەکانیان ئەدا و ئەڕۆیشتن، هەرچەندە فڕۆکەکانی ئێرانی هیچ کاتێك نەبووە کە بەسەریانەوە نەبێ لەگەڵ ئەوەش هەر کۆڵیان نەداوە و سنگی مەردانەیان داوەتە پێش بۆ ڕۆیشتن، تا ئەگەنە گوندی «شەت» ـ کە هەژدەمیل لە جنوبی سنووری ڕووسیاوەیە ـ لەوێدا لەشکری چوارەمی ئێران ـ کە ڕۆژنامە نووسەکانی ئاورووپا بە دە هەزار کەسیان داناون ـ بەتەواوی ڕێگەیان پێ ئەگرن و ماوەی دەرباز بوونیان نادەن!.

لێرەدا بەبێ ئەوە کە لە دەسەڵاتی خۆیانا بێ تووشیان ئەبێ بە تووشی شەڕەوە و لەگەڵ ئەو لەشکرە پڕچەکەی خاوەن فڕۆکە و تۆپەدا ئەکەونە شەڕەوە. لەم شەڕەدا یا ڕزگاربوونە یا کوشتنی هەموویانە لەو شوێنەدا!. ئەو جەنگە کە لە بەینی بەرزانییەکان و هێزی ئێرانا ڕووی داوە یەکێکە لە جەنگە هەرە گەورەکانی [بەرزانی] کە لە هەموو جارێك زیاتر گیانی خۆیانیان لە پێناوی شەرەف و بەرزییەتیا دۆڕاندبێت.

لە پاش شەڕێکی چەند ڕۆژی لە [١٥ی حوزەیرانی ١٩٤٧]دا ئەگەنە سەر ئاوی «ئاراس». لەشکری سەرزەوی ئێرانی لە پشتەوە بە گوللە تۆپ و فڕۆکەش لە سەرەوە بە

بۆمبا ڕەوانەیان ئەکەن!.. کە ئەگەنە سەر ئاوی ئاراس (٥٠٠) کەس ئەبن و ئەوەندەیان ئەمێنێتەوە، زیانی نەیرووی ئێرانی لە ئەفسەر و سەرباز تەنانەت حوکوومەتی ئێرانیش خۆی بەتەواوی لەبەر زۆری بۆی دەرنەکەوتەوە. ئەوەندە هەبوو ئەو نەیرووە زۆر بە خراپی شکان!.

لەگەڵ ئەوەش کە لە مەلەوانی‌دا دەستێکی وایان نەبووە، مل ئەنێن لە ئاوەکە، یەکەم کەس کە ملی لێ‌ناوە «میرحاج» بووە، پاشان «مەلا موستەفا» و ئەمجا هەموو بەرزانییەکان، هەرچەندە زۆر لە شتومەکەکانیان ئاوەکە بردوویەتی، لەگەڵ ئەوەش خۆیان هەر پەڕیونەتەوە و دەرباز بوون بە بێ ئەوە یەکێکیان لێ بخنکێ.

ڕۆیشتن و دەرچوونی [مەلا موستەفا] لەو ڕۆژەدا بیروباوەڕی پیاوە سیاسییەکانی هەموولایەکی خەریك کردبوو؛ کە ئایا چۆن توانیویەتی لەناو لێشاوی هێزی ئەو سێ حوکوومەتەدا دەرباز بێ؟!. ئایا باڵندە بووە و فڕیوە؟ وە یا ئادەمیزاد بووە و بە جەنگاوەری تێ‌پەڕیوە؟!.

ڕاست بوو لەو ڕۆژەدا هێزەکانی عێراق و ئێران و تورکیا قۆڵیان کردبوو بە قۆڵی یەکا بۆ گرتن و بۆ لە ناوبردنی بەرزانییەکان، بەڵام ئەوی «مەلا موستەفا» وبەرزانییەکانی لەناو ئەو هێزانەدا ڕزگار کرد یەکەم بە جەرگی و خۆبەخت‌کردنی هەموو نەفەرێکی بەرزانی بوو، دووهەم سەرکردەیی و پسپۆڕی شەڕی [مەلا موستەفا] بوو کە ڕزگاری کردن؛ ئەو مەلا موستەفایە کە هیچ دانشگا و دانشسەراێکی جەنگی نەدیبوو تەنها قوتابخانەی ژیانی خۆی نەبێ!. تەنها بۆتەی لاپەڕەکانی ژیانی خۆی نەبێ کە تیایا قاڵ بووبووەوە، هەر ئەو دەرزی قوتابخانەی ژیانەی خۆی بوو کە [قائید] و سەرۆکە جەنگیە دەرچووەکانی قوتابخانەی «حەربی» ئاورووپا و ڕۆژهەڵاتیشی سەرسام کردبوو!.

* * *

[مەلا موستەفا] و هاوڕێکانی گەیشتنە ڕووسیا و حوکوومەتی سۆڤیاتی داڵدەی‌دان و بە چاوی پەنابەرانی سیاسییەوە سەیری کردن. لە پاش ئەوە کە لەوێ جێ‌گیر بوون و ئەو تەرتیباتە کە لە وڵاتی سۆڤیاتیدا هەیە بۆ پەنابەرانی سیاسی بۆیان جێ‌بەجێ کرا. ئەمانە ئیتر کەوتنە ناو ژیانێکی عەمەلییەوە؛ جارێ بە جۆرێکی تێکڕایی پێویست بوو هەموو

خوێندەواربن، خرانە بەر خوێندن. پاش ئەو دەورەی سەرەتاییە کران بە سێ دەستەوە؛ دەستەی گەنج و تازە پێ گەیشتوو، ئەمانە بەرە بەرە ئەبوایە لەسەر خوێندن بمێننەوە تا دانشسەرا و دانشگاکان تەواو ئەکەن.

دەستەیەکی‌تر خەریکی ئیشی کشتوکاڵ و دار و درەخت بوون، ئەمانە ئەوانەبوون کە فرمانیان پێ ئەکرا. دەستەی سێهەم ئەو کەسانانە بوون کە لەبەر ئەوە تۆزێ پیر وە یا تۆزە کەم‌وکوورِیـەك لە لەشیانا هەیە، ئەمانە هـەر یەکە مانگی (٥١٥) ڕوبل کە بە پارەی عێراق (١٨) دینار ئەکا ئەیدرایە و ئیتر هیچ ئیشیان نەئەکرد.

بەم جۆرە بەرزانییەکانـی ڕووسیا لەناو کشتوکاڵ و بەرزانییەکانی عێراق لە گۆشـەی حەپسخانەکانا ماوەی (١١) ساڵ ڕایان‌بوارد تا شۆڕشـە بەناوبانگەکـەی (١٤ی تەمـووزی ١٩٥٨)ی عێراق پەیدا بوو؛ ئەو شۆڕشـە کە کۆتی دیلی هەموو چینێکی پساند. یەکێ لەو ئیشە هەرەگەورانەی شۆڕش ئەوەبوو کە قارەمانی شۆڕش [عەبدولکەریم قاسم] فەرمانی دەرکـرد بـۆ لێخۆش‌بوونـی هەمـوو حەپسـە سیاسییەکان. کە ئـەم فەرمانە دەرچوو [شێخ ئەحمەدی بەرزانی] و هاوڕێکانی لە (١٩٥٨/٧/١٩)دا لە بەندیخانە یانزە ساڵییەکەی هاتە دەرەوە و بـە هەمـوو ئازادییەکـەوە چاوی بە ئاسمانی شـینی عێراق کەوت، لە سـەرەتای ئاغسـتۆزی (١٩٥٨)دا بـە خـۆی و هـەچ بەرزانییەك هەبوو بە سـەر وڵاتەکانی کەرکووك و هەولێر و شـەقڵاوادا چووەوە بۆ ئەو شـوێنە خۆشەویسـتەی کە یانزە سـاڵ بوو نەیدیبوو، چووەوە و بە هەموو ئازادی و سەربەستیەکەوە باوەشی کردەوە بە بەرزانا!.

ئەمجا «مەلا موستەفا»؛ مەلا موسـتەفا و هاوڕێکانی کە دەنگی شۆڕشـە پیرۆزەکەی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراقیان بیسـت ئاگری دووری مەڵبەند بڵێسـەی لە دڵیانا پەیدا کرد و کەوتنە ئەڵهای هاتنەوەوە. لە [٢٨ی ئاغسـتۆزی ١٩٥٨]دا لە چیکۆسـلوفاکیاوە داوای هاتنـەوەی لـە سـەرۆکی خۆشەویسـتی شـۆڕش ـ عەبدولکەریـم قاسـم ـ کـرد، سـەرۆکی شۆڕشـیش بـە هەمـوو میهرەبانییەکـەوە بانگـی کـردەوە. ئەویـش لـە ڕۆژی [٦ی تشـرینی یەکەمی ١٩٥٨]دا لەگەڵ «میرحاج» و ئەسعەد خۆشەوی ـ ئەو دوو دۆستە، کە ساڵەهای ساڵە لەگەڵ مەلا موستەفادا یاری بە گیانی خۆیان ئەکەن ـ گەیشتنەوە بەغدا.

بـە هاتنـەوەی بەغـدایان کوردەکانی هەموو لایەکی «عێـراق» و تەنانەت عەرەبەکانی

عێراقیش ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر ئەبارینە بەغدا و پیرۆزبایی ئەم هاتنەوەیانە ئەکرد. هاتنەوەی «مەلا موستەفا» بۆ بەغدا یەکێك بوو لە دەورە هەرە پرشنگدارەکانی کورد کە لە بەغدادا نواندیان.

لە پاش ماوەی بیست ڕۆژێك «میرحاج» گەڕایەوە بۆ وڵاتی سوڤیاتی بۆ جێبەجێکردنی هاتنەوەی ئەو بەرزانیانە کە لەوێ ماون. کاروفرمانی هەموویان جێبەجێ بوو گەڕانەوە. لە ڕۆژی ١٩٥٩/٤/١٨دا (٨٥٣) کەسی ئاوارەی «بەرزانی» لە پاش (١١) ساڵ لە ناو دەریایەکی شادمانیدا گەیشتنەوە بەغدا و وڵاتە خۆشەویستەکەیان. لەمانە (٤٥٩) کەسیان پیاو بوون، (١٨٨) ژن و (٣٠٦)یان مناڵ بوون، لە پیاوەکان نزیکەی (٨٠) کەسیان پەڕپووت بووبوون. پێشوازییەکی نایابیان لە لایەن هەموو چینێکەوە لە ئێستگەی شەمەندەفەر بۆ کراو هەموو بە دیداری دۆستەکانی خۆیان شاد بوونەوە.

وەکوو لە پێشەوە باسکرا کاتێ ئەم بەرزانیانە لە ڕووباری «ئاراس» پەڕینەوە (٥٠٠) کەس بوون، لەم ماوەیەدا زیاد لەو ئەندازەیە ئەوەندە نەتەوەیان لێ کەوتەوە.

لە پاش ئەوە کە ئەم کارەساتانەمان زانی ئەبێ ئەوەش بزانین کە بە جۆرێکی تێکڕایی عەشرەتی بەرزانی لە ناو کورددا ئەتوانرێ بە بەجەرگتر و ڕاستگۆتر لە قسەو کردەوەدا و بە گیان بەختکردن لە ڕێگەی بیر و باوەڕا دابنرێن، لەم ڕووەوە کەس نایانگاتێ، گەورەیەك و بچووکێکیان، شێخێك و ئۆمیەکیان، پیرێك و گەنجێکیان، ژنێك و پیاوێکیان لە بیروباوەڕا، لە زات و زۆرا، لە کۆڕی کورد و کوردایەتیا یەکسانن و یەك بەرگیان هەیە، ئەو شتەی پیرێك ئەڵهای بۆ ئەکا عەینی شتە، کە گەنجێك داوای ئەکا، ئەو باوەڕەی کە پیاوێك بۆی ئەجەنگی عەینی باوەڕە کە ژنێك شیری بۆ هەڵئەگرێ!.

لە پێناوی ئەو باوەڕەدا کە هەیانبوو گەلێ تەنگ‌وچەڵەمەیان چاوپێکەوتووە، گەلێ چەوسانەوە و برسێتی و ڕووتی و دیلیەتی و غەریبی وڵاتانیان چێشتووە. ئەمانەشیان بۆیە چێشتووە و بینیوە لەبەر ئەوە بووە کە باوەڕیان بەو ڕێگەیە کە گرتوویانە قایم بووە، ڕێگەکەش ڕێگەی کوردایەتی بووە. ئەوەندە قایم بووە ناهومێدییان نەزانیووە وە نایزانن، تەنانەت ڕێگەی ناهومێدی نادەن بچێتە دڵی ئەو نەتەوانەیانەوە کە هێشتا نەهاتوونەتە دنیاوە و بۆنی هەوای دنیایان نەکردووە!. لەسەر ئەمە شتێك ئەگێڕمەوە:

ساڵی (١٩٤٧) وەكوو ساڵەكانی دەوری عەباسی چۆن پەرێشانی «بەرمەكیە»كان بوو بەو جۆرەش نەگبەتی بەرزانییەكان بوو؛ حوكوومەتی ئەو دەورەپشتی تێ هەڵكردبوون، وڵاتەكەیان داگیر كرابوو، هەندێكیان لە گۆشەی حەپسخانەكانا بوون، هەندێكیان دەربەدەری وڵاتان بوون، ئەوانەی كەمابوونەوە لە ئافرەت و لە مناڵ بە برسێتی و بە ڕووت و قووتی لە ژێر ساباتی بەفری سپی ئەو ساڵەدا ڕۆژی ڕووناكی عالەمی تریان ئەنووسان بە شەوی تاریكی هەموولایەكەوە!. تەنها چەرخی فەلەكی ئەو دەورە نەبێ كە وەكوو حوكوومەتەكە دڵ ڕەق و بەزەی پێیانا نەئەهاتەوە ئەگینا هەموو كەسێكی تر بەزەیی پێیانا ئەهاتەوە.

لەو ڕۆژەدا و لە ناو ئەو بەفر و سەرمایەدا ئافرەتێك بە «نۆ» مناڵەوە سەرما و برسێتی دەشتی پێ ئەگرێتە بەر و سەری ئەكا بە ماڵی قائمقامی [زێبار]دا. ماڵی قائمقام مەردانە و پیاوانە لێ دێنە دەست خزمەتێكی باشیان ئەكەن و بە نان و بە بەرگەوە گەرمیان ئەكەنەوە. قائمقام لێ ئەپرسێ.

لە ئافرەتەكە ـ چۆن بەم حاڵە دەرئەبەی و ئەم مناڵانەت چۆن بۆ بەخێو ئەكرێ؟. ئەڵێ: «بەم ڕووت و قووتی و برسیەتییە هەر بەخێویان ئەكەم بۆ ئەوە لە پاشا حەقم بستێنن!.» ئەڵێ ئەگەر ئەمانەش حەقم نەستێنن ـ دەست ئەخاتە سەرسكی و ئەڵێ ـ «ئەمەی لە سكمایە حەقم ئەستێنێ، حەقم ئەستێنێ لەو كەسە كەوا بەم جۆرە دەربەدەری كردین!. حەقم ئەستێنێ لەو كەسە كە وڵاتی خۆمان و خاكی خۆیشمانی پێ ڕەوا نەبینین. دنیا گەلێ دەور و چەرخی هەیە. گوێ مەدەرێ كورد، دەورێكی هەر لێ ئەبێتەوە!.».

◈◈◈

# شۆرشی سمکۆ

لە پێش ئەوەدا کە جەنگی گەورەی یەکەم، واتە جەنگی (١٩١٤ - ١٩١٨) بکەوێتە ناوەوە جۆرە دەور و دووکانێك لەناوا هەبوو مەگەر دەورەی سەدەکانی ناوەڕاست هاوتایی بکردایە! ئەگینا وێنەیەك نەبوو بۆ ئەوە کە پیاو بڵێ ئا بەو جۆرە بووا. ئەم پەردە ڕەنگاوڕەنگانەش زۆرتر لە وڵاتی کوردەواریدا دێوجامەکانی خۆیانیان پیشان ئەدا؛ ئەو وڵاتی کوردەوارییە کە ئەو سەردەمە بەشێکی لە ژێر باری عوسمانییەکانا بوو، بەشێکیشی لە ژێر باری ئێرانییەکانا!.

بە تایبەتی لە وڵاتی ئێرانا چونکە شایەکانی قاجاری هاتبوونە دەمەدەمی ئاوابوون، هەموو هێز و توانایێکیان هاتبووە سەر ئەوە کە لەقەبی زل زل ببەخشن و هیچیتر!.

وادیار بوو لاسایی ئاخر دەوری «عەباسیە»کانیان ئەکردەوە؛ ئەمانیش لەوان خراپتر لە دەورەی ئاخریانا هاتبوونە کزی و نابووت بووبوون، بێگانەکان - کە لە ڕواڵەتا و بۆ بەڕێوەچوونی ئیش و کار- خۆیان بە دار و دەستەی خەڵیفە ئەزانی، بەڵام هەچ توانایی و دەسەڵاتێك، کە هەبوو لە دەست خەڵیفەیان سەندبوو، خەڵیفە تەنها ئەوەی بۆ مابووەوە کە لەسەر کورسی خەلافەت بە ناو لەبەغدا دانیشێ و لەقەبی زل زلی وەکوو [معزالدولة] و [رکن الدولة] بەراتکا و هیچیترا.

جا شایەکانی قاجاریش وەکوو ئەوان لەقەبێکیان ئەفرۆشت بەوڵاتێك. «مفخم الملك، مکرم السلطنة»، فەرمانفەرما، سالار ئەسعد و سالار فاتح. هەموو لە پاشەرۆکی لەقەبەکانی ئەوان بوون!. «مکرم السلطنة» و «مفخم الملك» مووچەیەکیان ئەدا بە شاهەنشا و ئیتر خۆیان چییان لەگەڵ ڕەعیەت و میسکینا ئەکرد، ئەیانکرد و لێپرسینەوە نەبووا.

ئەمە لەلایەکەوە تا دەورێك، لە لایەکیترەوە لە دەورێکیترا «سەرجووقە»یەك لە پانی و درێژی هەر وڵاتێکا هەر جۆرە زوڵم و زۆرێکی بکردایە کەسێك نەبوو شکاتێکی لا بکرێ، چونکە سەرجووقە بەشیر و شەکر دەمی «سەرتیپ»ی شیرین کردبوو، ئیتر خوا مەرگی ئەو کەسەی ئەدا کە ئەچوو دەردەدڵێکی لای سەرتیپ ئەکردا.

بەشەکەی تورکیاش هەر بەو جۆرە بوو؛ «زەفتیە»یەك حوکمی یوزباشی ئەکرد و

یوزباشی هی بین باشی!. لەلایەن سوڵتانەوە کە کاربەدەست و والییەکان ئەنێرانە سەر وڵاتەکان، وەکوو «مزەئاش» ئەبوا پێشکەشیان بکردایە، جا خۆیان بە چە ئینسافێك ئەکەوتنە وێزەی خەڵك ئەوە مەگەر هەر خۆیان بیانزانیایە!.

وڵاتی کوردەواری [ئێران] زیاد لە کوردەواری شوێنەکانی تر لە ژێر باری زوڵما ئەتلانەوە؛ هەندێك بە دەست دەرەبەگی «سالار فاتح» و «مفخم الملكە»کانەوە، هەندێکیش بە دەست «سەرجووقە» و سەرتیپەکانەوە!... ئەمانە هەموو دووکەڵی لە دڵی ڕەمەکی مەردما هەڵئەساند و هیچ چارێکیش نەبوو، ئەگەر جارجار یەکێك هەڵبکەوتایە و داوای حەقێکی بکردایە «مفخم الملكە» خۆخۆرەکان وەکوو کرم ئەکەوتنە لەشەیەوە و دایان ئەڕزاند!..

کە شەڕی (١٩١٤-١٩١٨) داهات باوەڕ و فیکری لەبارێکەوە خستە بارێکی تر. بە جۆرێکی تێکڕایی ئەو جەنگە نەخشەی هەموو قەومەکانی گۆڕی، نەخشەیانی گۆڕی تەنها هی قەومی کورد نەبێ. نخشەی زەوی‌وزار و سەربەستی قەومی کوردی نەگۆڕی، بەڵام نەخشەی بیروباوەڕی گۆڕین. ئەمەی کرد لە لایەکەوە لە لایەکی تریشەوە کوردەکانی وڵاتی ئێران پڕیشکێکی کەساسی زۆریان بەرکەوت، پڕیشکێکی وا کە زۆربەیانی دەربەدەر و سەرگەردان کرد!. ئەمەیان لە دەورێکا بوو کە ئینگلیز ئەیوت داڵدەی قەومە کەساسەکان ئەدەین!. قسەکەیان ڕاست بوو داڵدەیان ئەدان، یەکێك لەو قەومانە قەومی کوردبوون کە لەو تەئریخە بەدواوە ڕۆژ بەرۆژ زیاتر بە قوڕا ئەچوون، ئەمەبوو داڵدەدانەکەیان. هەزار ڕەحمەت لە کفن دز!!..

* * *

لە وڵاتی شکاك، لە «چاریە ـ چەهریق» لە بناری «زۆزان» هەر لە پێش (١٩١٤)دا «سمایل ئاغای سمکۆ» ناو و ناوبانگی دەرکردبوو هەستێکی میللییەت و قەومییەت کەوتبووە کەللەیەوە.

«سمایل ئاغا» لە بنەماڵەبوو، کوڕی «موحەممەد ئاغا»ی شکاك بوو، ئەو شکاکە کە بە «شەش» هەزار بنەماڵە و (٣) هەزار تفەنگ دانراون. موحەممەد ئاغا دەستەی جڵەوی هەموو عێلی شکاکی بە دەستەوە بوو، لە ئەستەمۆڵ و لە تاران ناسراوبوو،

ئەو وڵاتەش هەمو فەرمانیان بەڕێوە ئەبرد. بەڵێ لە ژێر دەوارابوو، بەڵام هەستوونی دەوارەكەی وڵاتەكانی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕ و سندوسی ئەهێنایە لەرزە، نە، ڕێگەی توركی ئەدا لە «سایەنقەڵا»وە بێت بەسەریا نە، هی ئێران لە «زۆزان»ەوە!.

جا «سمایل ئاغا» كوڕی ئەم «موحەممەد ئاغا»یەو لە عەشرەتی «عەبدۆی» بوو، كە عەشرەتی عەبدوویش لە بنەڕەتا یەكێك بوون لە تیرەكانی «میلانی» و لەوڵاتی [دیاربەكر]ەوە هاتوون. سمكۆ لە ژێر ئەودەواری گەورەییەدا چاوی پشكەوتبوو.هەر لەو دەورەدا لە پاشماوەی باوكی [جەوهەر ئاغای] برای ـ كە [جەعفەر ئاغا]شیان پێ ئەوت ـ شیری كاری ئەكرد و دەوری ئەگێڕا، وڵاتی «ورمێ» و «میاندواو»ی وا لێ‌كردبوو بە وڵاتی خۆی ئەزانی.

دوور نەبوو [جەوهەر ئاغا] بە ناوی هەستی میللییەتەوە ئەمانەی نەكردبێ بەڵام ئەوەندە هەبوو هەستێكی دابوو بە دەرو دراوسێكانی و حوكوومەتی «تاران» و «تەورێز» بە چاوێكی‌تر تەماشایان ئەكرد!. لە (١٨٩٥)دا بە هەر جۆر و بە هەر زمانێك بوو حوكوومەتی تەورێز بە ناوی بانگێشتن و دۆستایەتیەوە جەوهەر ئاغای بانگ كردە تەورێز و لەوێ شەو لە ناوێك لەو كۆشكە، كە بۆ میوانداری ئەویان تەرخان كردبوو، دەوریان لێ‌دا، دوانزە پیاوی لەگەڵ هەبوو خۆی و پیاوەكانی تەنها دووكەس نەبێ كەسیان لێ دەرنەچوو هەموویان كوشتن!. ئەم دوو كەسەش یەكێكیان [مەحموود ئاغای] ناوبوو، پاشان هەر بە دەستووری پێشوو، بوو بە پیاو ماقووڵی [سمایل ئاغا]. كارەساتی كوشتنی [جەوهەر ئاغا ]ئاگرێكی كاریگەری لە دڵی سمایل ئاغا ـ دا هەڵگیرساند و هەر ئەمەش بوو كە بوو بە بناغەی میللییەت و قەومییەت بۆی.

[سمایل ئاغا] پیاوێكی بە جەربەزەی نەترسی جەنگاوەر بوو، هێزی قسە و داڕشتنی قسەی لەوانە بووە بەردی نەرم كردووە، لەگەڵ هەر كەسێكا كەوتبێتە قسە ڕایكێشاوە بۆلای خۆی، ئەو كەسە با دوژمنیشی بوایە پێ ئەسەلمان كە ئەم لەسەر حەقە، لەگەڵ ئەوەشا پیاوێكی بەسام و ترسێنەر بووە، نەخوێندەواریش بوو.

دیسان كاتێ كە بیویستایە لەگەڵ یەكێ لە كاربەدەستی حوكوومەتەكانا وە یا یەكێكی‌ترا كە سەر بەو نەبوایە بۆ قسەوباس چاویان بە یەك بكەوێ شوێنێكی تایبەتی دیاری ئەكرد

بۆ ئەو چاو پێ‌کەوتنە. ئەمجا لە پێش وادەدا خۆی زەلام و تفەنگچی ئەنارد ئەو ناوچەیانە تاقی ئەکردەوە. بۆ ئەوە بزانن دوژمن لەو ناوچەیەدا خۆی حەشار نەداوە. پاش ئەم ئیشەی ئەیهێنا تفەنگچییەکی زۆری ئەنارد لەو ناوچەیەدا بڵاوەیان ئەکرد و سەر لووتکە و تەپۆڵکەکانیان ئەگرت و هەموو شوێنێکیان قایم ئەکرد. ئەو وەختە سمایل ئاغا خۆی ئەچوو لە شوێنی ژوانەکە لەگەڵ کابرادا یەکی ئەگرت و قسەوباسی خۆیان تەواو ئەکرد.

[سمایل ئاغا] کە خەبەری کوشتنی [جەوهەر ئاغای] برای بیست، بڕیاری‌دا سەرەتا هەر بە دوانزە کەسەوە تۆڵەی خوێنی جەوهەر ئاغا بکاتەوە، بۆیەش هەر بە دوانزە کەسەوە، چونکە «جەوهەر ئاغا» دوانزەکەسی لەگەڵا بووە!. بەم ڕێچکەیەدا ڕۆیشت تا دەوروبەری «ورمێ» و «مەراغە»ی هەموو شڵەژاند و هەتا ئەهات ناو و ناوبانگی زیادی ئەکرد، لەگەڵ ئەمەشا بڵێسەی دڵیشی هەر زیادی ئەکرد!.

«سمایل ئاغا» بەرەبەرە گەورە بوو، بڵێسەی ئاگرەکەی دڵیشی زۆرتر بوو. جەنگی (١٩١٤-١٩١٨) بەسەراهات و ئەو باوەڕە کەوتە هەموولایەکەوە کە هەموو قەومێك هەقی ژیان و سەربەخۆیی هەیە. لێرەدا ئەم باوەڕە و ناسۆری برینی «جەوهەر ئاغا» هەر دووکیان پاڵیان نابە «سمایل ئاغا»وە. لەم لاشەوە «سەید تاها ئەفەندی» نەهرییە ئەوەندەی‌تر گیانی میللییەتی لە دڵی «سمایل ئاغا»دا بەهێزتر کرد و پشتی دا بە پشتیەوە.

[سمایل ئاغا] لە ناوەندی شەڕی ئەو ساڵانەدا لەگەڵ ڕووسەکان ڕێك بوو، پاشان لەگەڵیان تێکچوو ڕووی کردە تورکیا و لەگەڵ حوکوومەتی تورکیادا ڕێ‌کەوت، لە (١٩١٧) دا کە «باڵشویك» لە وڵاتی ڕووسیادا پەیدا بوو ئەم گەڕایەوە بۆ وڵاتی «ئێران»!.

❋ ❋ ❋

ڕووسەکانی قەیسەری ئەیانویست لەو وڵاتەدا بەرانبەر بە [باڵشویك] کۆسپێك پەیداکەن، لەگەڵ ئەمەدا لەدڵا لەو فیکرەشدا بوون کە دەنگێکی کوردایەتی لەو ناوەدا هەبوو ئەو دەنگەش لەناو بەرن!. بۆ ئەم مەبەستانە نەیانئەتوانی «سمایل ئاغا» بگرن بە دەستەوە، چونکە ئەیانزانی هەر کە سمایل ئاغا بکەوێتە تەنگ‌وچەڵەمەوە ئەچێتە خاکی «تورکیا» و لەو خاکەشا کورد زۆرە ئەتوانێ بە هەموو جۆر بەرهەڵستی ئەمان بکاو حوکوومەتی تورکیاش دەنگ نەکا، وە زیاد لەوەش پشتیوانی بکا!.

«مارشەمعوون» سەرۆکی هەرەگەورەی «تەیاری ـ فەلە» کان بوو ـ هەم سەرۆکی دینی، هەم هی دنیایی ـ لەم تەیاریانە گەلێکیان لە ئاورووپا و وڵاتی ڕووسیادا خوێندبوویان، لە هەموو ڕوویەکەوە ئامادەی هەموو چەشنە شتێك بوون. هێزی چەکیان دانرابوو بە (٢٥) هەزار تفەنگ و تفەنگ بەدەست، فیداکار بوون بۆ هەر شتێك پێیان بوترایە. ئەمانەش هەموو دەربەدەری وڵاتەکانی خۆیان بوون ـ زیاتر لەوڵاتی تورکیادا ـ بە تایبەتی کە حوکوومەتی عوسمانی بەسەرکردەیی «عەلی ئیحسان پاشا» عێلجاڕیی لێ کردبوون، زۆریان کەوتبوونە ئەو ناوەو لەو ناوەدا کۆبووبوونەوە و «مارشەمعوون» گەورەیان بوو، ئەوەندەیان چەوساندنەوە دیبوو لە دەست حوکوومەتی تورك بە هەر چەشنێك وە بە قسەی هەر کەسێك بگەیشتنایە بە سەربەخۆیی ئەیانکرد!.

ڕووسەکان هاتن [مارشەمعوون]یان ڕاست کردەوە و قسەیان لەگەڵ کرد و هەموو جۆرە پەیمانێکیان دایە. لەو وڵاتەدا «سمایل ئاغا» هەیە، بوونی سمایل ئاغا کۆسپێکی هەرەزلە، چ لە ڕێگەی قەیسەرییەکانا، چ لە ڕێگەی مارشەمعووندا. ئەمە ناکرێ مەگەر بەوە نەبێ کە مارشەمعوون لەگەڵ سمایل ئاغادا بکەوێتە قسەو بەڵکوو بەبارێکا ئیشی لەگەڵا یەکلایی بکاتەوە!.

هێنای سەرەتا بە ناوی ئەوەوە کە حوکوومەتێکی کوردی ـ ئەرمەنی دروست بکەن لەگەڵ «سمکۆ» کەوتە قسەکردن، بەڵام لە ڕاستیدا ئەیەویست لەم ڕێگەیەوە لە ئاخرا سمکۆ و کوردەکان لەناوبەرێ و ڕاستەوڕاست حوکوومەتەکە ببێ بە حوکوومەتێکی «ئەرمەنی» و «ئاسووری»!.

ئەمەش ڕاست بوو وابوو، چونکە هێزی «مارشەمعوون» ـ وەکوو وترا ـ (٢٥) هەزار تفەنگچی ڕێکوپێکی خاوەن مەشق بوون، هەموو لە ژێر چاوێری ئەفسەرانی نیزامیدا بوون، لە پشتیشەوە ڕووسی قەیسەری پشتیوانیان بوو. هێزی «سمایل ئاغا» نە ئەو ئەندازەیەبوو، وە نەئەو ڕێکوپێکیەی هەبوو، هێزی ئەم عیبارەت بوو لە هێزی عەشایر، کەسێکیش نەبوو لە پشتیەوە کە بەچەك و جبەخانە یاریدەی بدا. کەوابوو لە ناوبردنی سمکۆ بۆ مارشەمعوون وەکوو ئاوخواردنەوە وابوو.

«سمایل ئاغا» لەم کەین وبەینانە هەموو تێ گەیشت و هەموو شتێکی بۆ دەرکەوت.

تێ‌گەیشت ئەگەر ئەو نەکەوێتە خۆی بۆ لەناوبردنی مارشەمعوون، [مارشەمعوون] ئەو لەناو ئەبا و پاشانیش دەستی بە هیچ لایەك ناگا!.

لە پاش قسەوباسێکی زۆر لە ئاخر و ئۆخری ساڵی (١٩١٨)دا، واتە وەختێك بوو شەڕی گەورە لە دوایی هاتنا بوو، بڕیاریان دا کە لە «کۆنەشار» لە بەینی «سایەنقەڵا» و «چەهریق»دا لە ماڵی «تەیموور ئاغا» ناو کۆببنەوە و قسە لە دامەزراندن و دروست‌کردنی ئەو حوکوومەتەوە بکەن کە نیازیان هەیە دایمەزرێنن. مەرجی ئەم کۆبوونەوەیەش ئەوەیە کە هیچیان هێزێکی وایان لەگەڵ نەبێ.

لە ڕۆژ و وەختی ناوبراوا [مارشەمعوون] بەخۆی و سەد کەسەوە گەیشتە «کۆنەشار» و «سمایل ئاغا»ش بە (١٥٠) سوارەوە گەیشت و هەر دوولا دابەزین[١]. سمایل ئاغا تەمێ سوارەکانی خۆی کردبوو کە هەموو ئامادە و دەست لەسەر تێسکەی تفەنگ بن، هەر، کە ئەم تەقەی کرد ئەوانیش بە جارێ بیکەن بە شلیك. ئەوەندە هەبوو هەموو سوارەکان بەتەواوی لەمەبەستی [سمایل ئاغا] تێ نەگەیشتبوون، واتە نەیان‌ئەزانی کە ئەم نیازێکی وای هەیە، بەڵام سام و ترسی [سمایل ئاغا] لەوانە نەبوو کە کەس بتوانێ بێ‌فەرمانی بکات!.

لە پاش کۆبوونەوەی «سمکۆ» و «مارشەمعوون» بە جووتە لە ژوورەکەدا و پاش نان خواردن و قسەکردنێکی زۆر، لەبەر ئەوە کە مەبەستی «سمایل ئاغا» ڕێ‌نەکەوتن بوو، بەبێ ئەوە بگەن بە شتێك هەستان و سمکۆ مارشەمعوونی بەڕێ‌کرد تا بەرقاپێ، تەنانەت لە کاتی جیابوونەوەدا ئەفسەرەکانی لەگەڵ مارشەمعوون ویستیان یەکە یەکە دەست بخەنە ناو دەستی «سمایل ئاغا»، «سمکۆ» دەستی نەدانی و تێکرا سەلامێکی گرت بۆ هەموو و ئیتر ڕۆیشتن و سوارەکانی تەیاریش هەموو سوار بوون و ئامادەی

١. هاتنی «مارشەمعوون» بۆلای «سمایل ئاغا» دەستووری ڕەسمیاتی پادشاهی پیشان ئەدا: خۆی لە جلوبەرگی ئاڵوواڵای سەرۆکی ڕۆحانی ئیمرۆی تیرەیەکی خاوەن دەسەڵات و پادشایەکی بەهێزی سبەی ڕۆژیانا. لە سەر «دروشکە»یەکی چوار ئەسپی دانیشتووە کە هەموو چێوبەندی دروشکەکە بە ئاڵتوون زەرکفت کراوە!. شەش ئەفسەری گەورە ـ کە چوار لەمانە لە ئەفسەرەکانی رووسی ئەو دەورەبوون ـ دوویان لە پێشیەوە لەسەر دروشکەکە و چواریان لە پشتیەوە ڕاوەستاون و شیرەکانیان بە ڕووتی ڕاگرتووە و کالانی شیرەکانیان لەگەڵ مشتووەکانیانا هەموو زمڕوت و «مورەسەع» بوو. تیشکی هەتاوەکە کە ئەیدا لەم ئاڵوواڵای پادشاهیە سامێکی خستبووە ئەو ناوە!. «مارشەمعوون» بەم جۆرە هاتنە هات و لەماڵی «تەیموور ئاغا» دابەزی.

ڕۆیشتن بوون. لەوکاتەدا کە مارشەمعوون لە سمکۆ جیابووەوە و سەری ولاغی سووڕاندەوە سمایل ئاغا تۆزێ دوور کەوتبووەوە، لە ناکاو هەڵیکێشایە دەمانچە و دەمانچەیەکی نا بە مارشەمعوونەوە! ـ کە لە ناو سوارەکانی خۆیا بوو ـ کە تەقەی دەمانچەی سمکۆ هات، تفەنگچی شکاك ـ کە لە پەنادیوار و شتەدا خۆیان حەشار دابوو ـ بەجارێ لە تێسکەی تفەنگ خێراتر دەرپەڕین و کردیان بە شلیکی لەسەر یەك لەسەر یەك لەتەیارییەکان. دەستەی مارشەمعوون و تەیاری تا هۆشیان هاتەوە بەخۆیانا تەنها تاقە زەلامێکیان لێ دەرباز بوو!. ئەو تاقە زەلامەش براکەی مارشەمعوون خۆی بوو کە لە پاشا نیشتە جێی مارشەمعوون و بوو بە سەرۆکی ڕۆحانی. مارشەمعوون خۆی و (٩٩) پیاوی لەو شوێنەدا کوژران و گەورەتر کارەساتێك لە لاپەڕەی ژیانی سمکۆدا لەو شوێنەدا ڕووی دا!.

کە ئەم کارەساتە قەوما «سمایل ئاغا» فەرمانیدا کە ئیتر ئەو شوێنە بەجێ بێڵن، چونکە ئەیزانی فەلەکان لە خوێنی «مارشەمعوون» واز نایەنن و زۆریشن ئەمان چاریان ناکەن. لەڕاستیدا تا ئەمان کەوتنە خۆیان بۆ ئەوە کە هیچ ماڵ و خێزانێك لەوێدا نەیەڵن لێشاوی فەلەی نیزامی گەیشتن بەڵام تازە ئەمان ڕزگار بووبوون و بەقنگە شەڕ خۆیانیان گەیاندەوە «چەهریق».

کە چوونەوە «چەهریق» لێشاوی «تەیاری» هات و دەورەی چەهریقیان داو «سمایل ئاغا»یان بەتەواوی ئابلۆقەدا و ڕێگەی دەرچوونیان بڕی!. لە پاش ماوەیەك سەیری کرد ئەگەر ئیش بەم جۆرە بڕوا خۆی و هەموو سەربەو بووەکان لەو شوێنەدا بەدەست ئەم تەیارییانەوە ئەڕۆن!.

هێنای لە گۆشەیەکی ئابلۆقەکەوە هێرشێکی مەردانەی کرد و لەو گۆشەوە دڕنی بە تەیارییەکاندا و خۆی لە ئابلۆقەدان ڕزگار کرد و ڕووبەڕووی شاری «خۆی» بووەوە. شاری داگیر کرد و لەوێدا ئیتر بەسانایی دەزگای دەسەڵاتی خۆی لەو ناوەدا بڵاو کردەوە. «فەلە»کانیش بە کوشتنی مارشەمعوونی سەرۆکیان و بە دەربازبوونی «سمایل ئاغا» لە چەهریق کاروباریان تێکچوو و ئیتر خۆیانیان نەگرتەوە.

دیسان لەو سەردەمەدا کە لە شاری «خۆی» بۆ حوکوومەتی تورکیا کەوتە ڕاونانی ئەرمەنیەکانی ناو خۆی و ئەمانە ناچار بوون بە هەڵاتن. «سمکۆ» بۆ ئەوە کە لە ترسی

پاشەرۆژیان بە جارێ ڕزگار بێ هێنای دەربەندی «قوتور»ی لێ گرتن و هیچ دەنگی نەکرد تا بەتەواوی هەموو هاتنە ناو دەربەندەکەوە، لێرەدا لێیان ڕاپەڕی و ئەویش کوشتارێکی بێئامانی لێ کردن!. بەم ئیشەی بەتەواوی خۆی لەترسی پاشەڕۆژی ئەوانیش ڕزگار کرد.

لەبەر ئەوە کە هەندێ کەس لە نووسەران وای پیشان ئەدەن کە «سمکۆ» بە هەڵەداچوو «مارشەمعوون»ی کوشت و لە کوشتنەکەی زیانی بە کورد گەیاند. من ئەم حەقایەقەم لێرەدا نووسی، لە پاش خوێندنەوەی ئەتوانن حوکمی خۆیان بدەن و ئەو وەختە بۆیان دەرئەکەوێ کە «سمکۆ» چاکی کرد یا خراپ.

«سمایل ئاغا» بە کوشتنی «مارشەمعوون» پیلانی گەلێ کەسی تێکدا؛ ئامانجی ـ ڕوسیای قەیسەری ـ هەڵوەشاندەوە. لەبەر ئەوە ئاخر و ئۆخری شەڕ بوو ئینگلیز گەلێ ئیشی بە دەستەوەبوو بە «فەلە»کان بەرانبەر بەو وڵاتانە، تەونەکانی ئەوی پێ لەناودرا. حوکوومەتی قاجاری ـ ش ئەوە هەر بە هۆی شەڕەوە لە ژێرپێدا چووبوو لەوانە نییە ناو ببرێ بۆ ئەوە کە نەمانی «مارشەمعوون» کاربکاتە سەر ئەو یا نەیکا، ئەوەندە هەبوو بێتینی حوکوومەتی قاجار و نەمانی «مارشەمعوون» هێزێکی گەورەبوون بۆ پێشکەوتن و پەرەسەندنی «سمایل ئاغا» لەو ناوەدا.

زۆری پێ نەچوو سمایل ئاغا وڵاتەکانی «تەرگەوەڕ» و «شارویران» و «ورمێ» و «میاندواو»ی پاك کردەوە، تا گەیشتە سەر سنووری تورکیا هەمووی داگیرکردن و هەچ عەشایرێك لەو ناوەدا هەبوو هەموو پاڵیان پێوەدا و کەوتە تەمای داگیرکردنی تەورێز؛ داگیرکردنی ئەو شارە کە خوێنی «جەوهەر ئاغا»ی برای تیا ڕژێنراوە!.

لە قوڵەکانی ناوبانی ئێرانا پشێوی زۆرتر هەبوو، «ڕەزاخانی پەهلەوی» لە (١٩٢٠)دا «تاران»ی گرت، بەڵام ئاژاوەی ئێران وەنەبێ لە نیشتنەوەدا بووبێ؛ لەوڵاتی خووزستان «شێخ خەزعەل» خەریك بوو، «بەختیاری» و «قەشقایی» خەریك بوون. «قەدەم خەیر» لە وڵاتی لوڕ و پشتکۆ دەستی دابوویە. بە کورتی لە هەموولایەکەوە هەر کە بۆ خۆی و هەرکەسە بەناوێکەوە لە ئیشا بوو!.

«سمایل ئاغا» لەملاوە وڵاتەکانی ڕۆژئاواو شیمالی ڕۆژئاوای لە چنگی حوکوومەتی

ئێران هەڵپڕووکاندبوو، وردە وردە ڕووی کردبووە وڵاتی «بانە» و «سەقز». «بهادرالسلطنة» هەبوو لەلایەن ئێرانیەکانەوە حاکمی سەقز بوو، «بانە» کەوتبووە ژێر حوکمی [سمایل ئاغا]وە. لە ژێرەوە خەبەری نارد بۆ «سید طه» ـ کە ئەو وەختە ئەو لە دەوری بانە بوو ـ لەگەڵ بانەییدا بێن و [سەقز] بگرن. لەعەینی وەختدا ڕۆیشتن و «بهادرالسلطنة» سەقزی دان بە دەستەوە، بانەیی کەوتنە سەر ئەوە کە ناوشاری سەقز تاڵان کەن!. شکاکەکانی «سید طه» و بەرەی «فیض اللّه» بەگی بەرەنگاریان بوون و سەقزیان لە دەست بانەیی پاراست. لە ئاخرا «سمایل ئاغا» تەمێیەکی باشی بانەییەکانی کرد لەسەر ئەو فیکرە ناشیرینە کە کردبوویان.

هەر لە سەقزەوە لەشکری «سمکۆ» بەسەر «خوڕخوڕە»و «تیلەکۆ» و «دیواندەرە»دا چوونە شاری «سنە». کڵاوە درێژەکانیان کە دەورە درابوون بە مشکی و سرکەیی لەگەڵ «ستارخانی» و فیشەکی چواررێزەی ناوقەدیان و ڕەختی ئەسپەکانیان، ئەمانە هەموو بە کوردەکانی سنەیان ئەوت کە «سمایل ئاغا» کۆشش بۆ سەربەخۆیی کورد ئەکا، ئەم دیمەنانە زاتێکی تەواویان خستبووە بەر ئەوانیش.

«ڕەزاخان» هێشتا نەبووبوو بە شای [ئێران]، دەورێك بوو وەزیری جەنگ بوو، ناو و ناوبانگی سمایل ئاغا لە وڵاتەکانی «خۆی» و «سەڵماس» و «ورمێ»دا گەیشتبووە هەموو لەشکری ئێران، هەر لەشکرێکی، کە بۆ ئەنێرا لەناوی ئەبرد!.

«شێخ عەلی نیسکی» هەبوو ـ کە پەڕاگندەیەکی قەوقاز بوو ـ حوکوومەتی ئێران پەنای دابوو کابرایەکی بە کاریش بوو، «ڕەزاشا» ئەم کابرایە لە سەرەتای (١٩٢٢)دا بە (٥٠٠) سواری عەشایری خۆیەوە ناردە سەری.

«شێخ عەلی» ڕووی کرد بۆ «سابڵاخ» لەوانەبوو بگاتە ناوشاری سابڵاخ، «سمایل ئاغا» بەرەنگاری بوو، بەدەردێکی برد کە ئاوازەی شکان و تێداچوونی شێخ عەلی نیسکی لەو وڵاتەدا بوو بە گۆرانی و چاوی لەشکری ئێرانی لەم ئیشە بەتەواوی شکا.
پاش ئەم کارەساتە، ماژۆر «نصراللّەخان» هەبوو، حوکوومەتی ئێران بە «سێ» فەوجی سەربازی نیزامییەوە ناردی بۆ سەر سمکۆ، سمایل ئاغا لە چەمی موکریان بەرەنگاری بوو ئەمەشی بە جارێ تارومار کرد!.

لەم دەورانەدا سمکۆ «شێخ سراج‌الدین» و «فلامرز» ناوانی بە ڕاسپێری نارد بۆ وڵاتی هەورامان بۆ لای «جافرسان» کە ئەو لەوێوە پەلامار بدا و ئەمیش لەم‌لاوە بۆ ئەوە بە جارێ ئەوی پێ ئەڵێن وڵاتی کوردەواری ئێران لە [عەجەم] پاکی کەنەوە و ئیتر ئەو وەختە ئەبێ بە وڵاتێکی سەربەخۆ. «جافرسان» ئەم قسەیە نەچوو بە گوێچکەدا و وازی لە فیکرەکەی سمایل ئاغا هێنا.

لەم ماوانەدا [سمایل ئاغا] سنووری وڵاتی خۆی بەتەواوی پەرە پێ‌دا، لە «شنۆ» و لاجانەوە تا «ورمێ» و سایەنقەلا، لە «زۆزان» و چەهریقەوە تا سەقز و بانە!. ئەمانە هەموو بە عەشایرەکانیەوە کەوتنە ژێر چاوێری و فەرمانیەوە «ئەحمەد ئاغا» ناوێکی خەڵکی ئەوبەری «چەغەتوو» حوکوومەتی ئێران ڕاستی کردەوە بۆ بەگژاچوونی [سمایل ئاغا]. ئەم پیاوە بە «پێنجسەد» سوارەوە هات بۆ بەگژاچوونی سمایل ئاغا. لە «شەکریازی» هەر دوو لەشکر بەرەنگاری یەك بوون، ئەوەندەی فوو لە ئاو بکرێ لەشکری [ئەحمەد ئاغا] وەکوو ئاگری قودرەتیان تێ‌کەوێ هەموو لەناو چوون و [ئەحمەد ئاغا] خۆیشی کوژرا!.

لەسەرەتای ساڵی (١٩٢٣)دا «ئەمیر ئەرشەدی» «قەرەچەداغی» لە بناری تەورێز بە نیازی لەناوبردنی [سمایل ئاغا] بە هەزار سوارەوە ڕوو بەوڵات و خاکی سمایل ئاغا بەڕێ‌کەوت. ئەم خەبەرە گەیشت بە سمایل ئاغا، [سمایل ئاغا] بەخۆی و هەندێ لەشکرەوە چوو بە پێشوازییەوە، لە شیمالی دەریاچەی «ورمێ» تووشی بوو، زۆری نەخایان [ئەمیر ئەرشەدی] و لەشکرەکەی ئەو تۆزە کەمەی کە لە دەست کوشتن ڕزگاریان بوو بەرەودوا گەڕانەوە و ئەوانیش هیچ چارێکی [سمایل ئاغا]یان بۆ نەکرا!.

زەبر و زەنگی [سمایل ئاغا] لە هەموو وڵاتەکانی دوور و نزیکا وا دەنگی دایەوە کە ئەو دەنگە تا ئەو وەختە بوو کەم کەس بەو جۆرە پەیدا بووبوو! تەنانەت وای لێ هاتبوو زۆرتر سەرکەوتنەکانی هەر ناوەکەی سەری ئەخستن؛ واتە کە هەر ئەوترا [سمایل ئاغا]، وە یا لەشکری شکاك، دوژمن بە جارێ ورەی بەرئەدا و ئەشکا، خۆ لەسەر تەعبیری خۆی کە بە ئێرانییەکانی ئەوت «عەجەمەکان»، هەر کە، ناوی سمایل ئاغایان ئەبیست هەرچەندە لەشکر بوونایە ئەبوا هەموو چەکیان بدایە بەدەستەوە و گیانی خۆشیانیان بخستایەتە بەر پێی [سمایل ئاغا]!.

ئەوانیش بۆ لەناوبردنی ئەم وەنەبێ درێغیان بکردایە، زیاتریش بەکردەوەی فرِوفێڵ! وەکوو ئەوە کە لە ئاخر و ئۆخری ساڵی (١٩٢٤)دا [سمایل ئاغا] لەسەر سنوورەکانی تورکیا و ئێرانابوو، هاتوچووی لەهەر دووخاکەکەدا ئەکرد و خۆی حاکمی ئەو ناوە بوو کەس پێ نەئەکرا رێگەی لێ بگرێ.

«سەلمان سەبری» هەبوو حاکمی «وان» و پاشان بوو بە «والی» وان، ئەم پیاوە لەگەڵ سمایل ئاغا ـ دا دۆستایەتیەکی راستەقینەی دوور لە دەبلوماسیەتیان هەبوو. سمایل ئاغا لە دیدەنی ئەو ئەگەرێتەوە، «رەشید جەودەتی» دۆستی ـ کە دیاری ولاتی سولەیمانی بوو لەگەڵیا ـ لەگەڵی ئەبێ. هێشتا ناگەنەوە بەشەخاکی ئێران تومەس ئێرانییەکان پیاوێك ئەنێرن بۆ ئەوە بەهەر جۆر بووە، بەڵکوو بە دزی سمایل ئاغا بکوژێ!..

سمایل ئاغا بەم کابرایە ئەزانێ و ئەیگرێ و پێ دەرئەخا کە بۆ ئەو مەبەستە هاتووە، کە تووشیشی ئەبێ لەبەشەخاکی تورکیادا ئەبێ، لەگەڵ خۆی ئەیهێنێتەوە تا ئەگەنەوە سەر سنووری ئێران. فەرمان ئەدا مەنجەڵێ رۆن لەناو خاکی ئێرانا داخ ئەکەن و هەر دوو دەستی کابرا ئەبرِێ و ئەیکا بە مەنجەڵە رۆنەکەدا و بەو جۆرە بە بێ‌دەستی ئەینێرێتەوە بۆ ئێرانیەکان!..

لە رووی دۆستایەتیە تایبەتیەکەشیەوە ئەم باس‌وخواسە ئەگەیەنێ بە سەلمان سەبری. سەلمان سەبری کردەوەکەی بەلاوە زۆر سەیر ئەبێ، هەر بە ناوی ئەم دۆستایەتیە و ئازایەتی سمایل ئاغاوە ئیشێکی وا ئەکا «خەسرەو»ی کوری ـ کە وەختی خۆی تورکەکان لە شەبەیخونەکەدا گرتبوویان و منداڵ بوو ـ بەرەڵای ئەکەن و ئەینێرنەوە بۆ سمایل ئاغا.

«رەشید جەودەت» وتی لەمەردایەتی و ئازایەتییەکانی سمایل ئاغا کە ئەو دوو ساڵە پێکەوە بووین ئەوەم بە یادگارێکی زۆر گەورە هەڵگرت لە ژیانما کە لە پاشا یەکێ لە کورەکانم ناو نایە «خەسرەو»، ئەمەش هەر بۆ یادی مەردایەتی پیاوێکی ئازای وەکوو «سمایل ئاغا» و بۆ ئەو دۆستایەتییە کە لەبەینمانا هەبوو!.

❋ ❋ ❋

دەورەی جاری دووهەمی حوکوومەتی [شێخ مەحموود] بوو لە سولەیمانی، ناوبانگی حوکوومەتی کوردستان گەیشتبووە هەموو لایەك، زۆر لەمێژ بوو سمایل ئاغا ئەیویست

دیدەنییەك لە حوكوومەتی كوردستان بكاو و چاوی بە شێخ مەحموود بكەوێ بۆ ئەوە بە كۆششی هەردوولایان كوردستانی گەورە لەسەر بناغەیەكی ڕێكوپێك دابمەزرێنن. ئەم نیازەی هەبوو بەڵام لەبەر شەڕ و شۆڕ هاتنەكەی بۆ ڕێنەئەكەوت. هەر لە ساڵی (١٩٢٢) ەوە بڕیاری تەواوی‌دا و خۆی ئامادەی چوون كرد، ئەوساڵەش هەر بۆی ڕێنەكەوت.

لە ئاخر و ئۆخری ساڵی (١٩٢٢)دا لەسەر سنوورەكانی توركیا، ئێران و عێراق بوو، لەبەر ئەوە كە مستەفا كەمال ئاڵا بوو بە شەڕی «یونان»ەوە نەیئەویست لەلایەكیترەوە ئاگر بۆ خۆی هەڵگیرسێنێ، بەڵكوو بە پێچەوانەی ئەمە مێچكەمێچكەی لەبەر هەموو كەسێكا ئەكرد، بەتایبەتی سمایل ئاغا. ئەم زمان شیرینییە وای لە «سمایل ئاغا» كرد كە لەم ئاخرەدا ئەویش خۆی لە تورك نەگەیەنێ!..

[سمكۆ] لەو سەر سنوورانە هەرجارە لە دار و دەستەی شۆڕشگێڕەكانیتری عێراق ئەچوون و چاویان پێ ئەكەوت، ناو و ناوبانگ و هێزیشی ڕۆژ بەڕۆژ زیاتری ئەكرد. ئەم دەنگانە هەمووی ئەكەوتنەوە بەر گوێ [مستەفا كەماڵ] و توركخواكان، مستەفا كەمال ئەو مەترسییەی كە هەیبوو لە [سمكۆ] سەیری كرد هەر لە زیادییە و ئەگەر بەم جۆرە لێبگەڕێ لەوانەیە ئاگری ئەم، لەم ڕۆژهەڵاتەیەوە گەلێ بەتینتر ئەبێ لە ئاگرەكەی [یۆنان] كە لە ڕۆژئاوایەوە هەڵیانگیرساندووە!.. سمكۆیش بێئاگا بوو لە ناو دڵی [مستەفا كەمال]، بەڵكوو هەروا چووبووە دڵیەوە كە مستەفا كەمال دۆستی ئێستە و پاشەڕۆژیەتی!. لەبەر ئەمە پاڵی لێ دابووەوە!..

[سمكۆ] لەشیرین خەوابوو؛ خەوی بێئاگایی لەناو دڵی مستەفا كەماڵ و خەوی ڕاستەقینە!. لەناكاو شەو لە ناوێك لەلایەن هێزی [مستەفاكەماڵ]ەوە شەبەیخونی كرایە سەر و درایە بەر شێلیكی تفەنگ!. لەم شەبەیخونەدا زیانێكی گەورە ڕووی كردە [سمایل ئاغا]؛ گەلێك لە پیاوماقووڵەكانی و یەكێك لە ژنەكانی كوژران، خەزنەی پارەكەی تاڵان كرا و «خەسرەو»ی كوڕیشی بە دیل گیرا!. خۆی و ئەوانەی كەمابوونەوە و بە هەر جۆر بووبوو ڕزگاریان بووبوو لەو ناوچەیە كشانەوە و خۆی گەیاندە وڵاتی «ڕواندز» و لەوێدا سەقامگیر بوو.

لە پاش ماوەیەك لە ساڵی (١٩٢٣)دا خەبەری نارد بۆ [شێخ مەحموود] كە ئەیەوێ بچێت بۆ دیدەنی. شێخ مەحموودیش هاتنی سمایل ئاغا و چاوپێكەوتنی سمایل ئاغای

لەو ڕۆژانەدا پێ خۆش بوو. خۆی و حوکوومەتەکەی بۆ ئەو میواندارییە ئامادە کرد.

لە شوباتی (١٩٢٣)دا. سمایل ئاغا بە خۆی و لەشکرێکی ڕازاوەوە گەیشتە ناوشاری سولەیمانی و لەلایەن حوکوومەتی کوردستانەوە پێشوازییەکی شاهانە کرا، شادی و ئاهەنگی ئەو ڕۆژەی شاری سولەیمانی بۆ هاتنی پێشڕەوێکی میللی وەکوو «سمایل ئاغا» یەکێك بوو لە ڕۆژە هەرە میللیەکانی مێژووی ئەو شارە. ئەو ماوەیە کە لە سولەیمانی بوو میوانی حوکوومەتی [شێخ مەحموود] بوو، لە هەموو ڕوویەکەوە قسەیان لە بناغە قایمکردن و پەرەسەندنی حوکوومەتی کوردستانەوە کرد. «سمایل ئاغا» فیکری هاتە سەر ئەوە کە ئەویش لە کوردەواری ئێران ئیشێکی وابکا هەر دوولایان ببن بەیەك. بەڵام هەندێ ناگوزووری لەناو دەستە و دایەرەی حوکوومەتی «شێخ مەحموود»دا چاو پێ کەوت بازگەشت بووەوە لەو فیکرەی و جۆری حوکوومەتدارییەکەی شێخ مەحموودی بەتەواوی نەچووە دڵەوە، کەوتە سەر ئەو باوەڕە کە حوکوومەتداری نابێ وابکرێ!.

تەنانەت لەو سەردەمەدا کە لەوێ بوو هەندێ کردەوەی شێخ قادری سپەهسالاری بەلاوە باش نەبوو، لەباوەڕی ئەوا کردەوەکانی ئەو زیانی بوو بۆ حوکوومەتی [شێخ مەحموود]. بەڵکوو ئەو کردەوانە و یاسای حوکوومەت و حوکوومەتداری زۆر لێك دووربوون!. بە [شێخ مەحموود] ئەڵێ:

«تۆ ئەگەر ئەتەوێ حوکوومەتداری بکەی ئەبێ ئەو سپەهسالارەت بکوژی، چونکە بوونی ئەو لەگەڵ ئامانجی تۆدا ڕێناکەوێ. دیسان دروستکردنی حوکوومەت و سیاسەت چاو لە هەموو برا و خزمێك ئەپۆشێ. تۆ ئەبێ یا خزم و برا و کەس و کارت بوێ، یا ئەبێ حوکوومەت و حوکوومەتداریت بوێ. لە حوکوومەتداریا هەرکەس هات و بوو بە مایەی سەرنەکەوتن و پێش نەکەوتنت، تۆ ئەبێ ئەو کەسە بکوژی با براو خزمیشت بێ!.».

ئەمە قسەی ئەو «سمایل ئاغا»یەبوو کە بێجگە لە تفەنگ هیچ قوتابخانە و دانشگایەکی نەبینیبوو!. نەوەك هەر ئەوەندە بەڵکوو خەتی ڕەش و سپی لێك نەئەکردەوە، لەگەڵ ئەوەشا جۆرە قسانێکی وەها لە عالەمی سیاسەتا لە ڕیزەی قسە هەرەگەورە سیاسییەکانی عالەما دائەنرێ.

لە پاش ئەوە کە چەند ڕۆژێك لە سولەیمانی مایەوە لەبەر ئەو ئاژاوەیە کە کەوتبووە سولەیمانیەوە و ئینگلیز بە «بەیاننامە» و هەڕەشەکردن تۆزێ تیا ئەکرد، لە [٢٦ی شوباتی ١٩٢٣]دا شاری سولەیمانی و خەڵکی سولەیمانی بە کۆڵێ سوپاسەوە بەجێ هێشت و ڕووبەڕووی وڵاتی خۆی بووەوە. لەو ماوەیەدا کە لە سولەیمانی بوو چ، لە لایەن حوکوومەتی «شێخ مەحموود»ەوە، چ لە لایەن خەڵکی سولەیمانییەوە خزمەتێکی جوان کرابوو، هەرجارە «سمایل ئاغا» خۆی لە هەموو کۆڕێکا باسی ئەو خزمەتانەی سولەیمانیی ئەکرد و لەگەڵ ئەوەشا دەردەدڵی لە هەندێ لە پیاوەکانی «شێخ مەحموود» بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری حوکوومەت ئەکرد!.

* * *

[سمایل ئاغا] لە ئێرانا بەتەواوی ناوبانگی بڵاو بووبووەوە، لەولاوە ناوی چووبوو بۆ تەورێز و «ئازربایجان»، لەملاوە بۆ «شیراز» و «تاران»، ئێجگاریش بەوە زەنەقی «عەجەم» و تورکمانەکانی بردبوو کە بەسەرکەسیانا نەئەچوو، هەرکەسی دەست ئەکەوت ئەیکوشت، لەوانە نەبوو یەکێ لە دەستی ڕزگاری ببێ!. تەنانەت ئەمە یەکێکە لە قسەو کردەوەکانی [سمایل ئاغا] کە عەجەمەکانی ڕیز ئەکرد و ئەیوت: «بزانم گوللەم تاکوێ بڕ ئەکا!.» لەم سەرەوە تفەنگێکی تێ ئەگرتن بۆ ئەو سەر و پاشان سەری ئەبڕین و کەللە سەرەکانیانی بەسەر یەکا کۆمەڵ ئەکرد و سەیرێکی ئەکردن و ئەیوت: «هێشتا خوێنی جەوهەر ئاغا وەرنەگیراوەتەوە، خوێنی [جەوهەر ئاغا] وەختێك وەرگیراوەتەوە کە وڵاتی کورد سەربەخۆیی و لەمانە پاك بکرێتەوە![1]».

١. بەتایبەتی ئەو شتەش کە [سمایل ئاغا]ی فێری ئەم خوێنڕشتنە کردبوو کردەوە ناشیرینەکانیحوکوومەتی ئێران بوو لەگەڵیا کە بە ئاشکرا و پەنامەکی ئەیانەویست بە هەر جۆر بووە لە ناوی بەرن.

لەو دەورانەدا کە هەر جارە حوکوومەتی ئێران لەشکری ئەنارده سەری و هیچ چارێکی پێ نەئەکرا، جارێك حاکمی «ورمێ» «سندۆق»ێکی زرق و برقی جوانی بە دیاری بۆ ئەنێرێ و قاپێ دۆستایەتی لەگەڵ ئەکاتەوە. [سمایل ئاغا] لە کوێستان ئەبێ، لەناو چیمەن و سەوزەڵانیا دەوار هەڵدراوەو لە دیواخانا دانیشتووە. لەو کاتەدا کابرای ڕاسپێر بەخۆی و قاقەزی [حاکم] و سندۆقە دیارییەکەوە ئەگا و سندۆق لە ناوەڕاستی دیواخانا دائەنێ و قاقەزەکەشی ئەداتە دەست.

«خەسرەو»ی کوڕی سمایل ئاغا لەو سەردەمەدا منداڵ ئەبێ و لە تەمەنی چوار پێنج ساڵانا ئەبێ و لە دیواخان لە تەنیشت باوکیەوە دانیشتوە. کە چاوی بە [سندۆق] ئەکەوێ بەلایەوە شتێکی جوان و زرق و برق ئەبێ

ئەم کارەساتانە کە لەگەڵ حوکوومەتی ئێرانا ئەینواند لەگەڵ حوکوومەتی تورکیاش ئەیکرد و هەمووجار پەلاماری خاکی تورکیاشی ئەدا، تورکەکانیش لەشکریان لێ ئەکرد، کە ئەیزانی زۆری بۆ دێت خۆی ئەهاویشتەوە وڵاتی کوردەواری ئێران و لەو وڵاتە پان و فراوانەدا کە ـ دایگرتبوو ـ ڕایئەبوارد.

لە (۱۹۲۱)دا ڕۆژنامەیەکی کوردی بەناوی «کورد»ەوە لە شاری «ورمێ» دەرکرد و لەم ڕۆژنامەیەدا کارەساتەکانی خۆی و ئەو وڵاتانەی تێدا ئەنووسرا کە ئەو دەستی بەسرا گرتوون، لەگەڵ ئەمەشا هەموو جۆرە هاڵ و هەواڵێکی دەرەوە و حوکوومەتەکانیشی تیا ئەنووسرا. بەم ڕۆژنامەیە [سمایل ئاغا] بەتەواوی دەنگی کوردایەتی لەو وڵاتانەدا بڵاو ئەکردەوە و مەبەستی شۆڕشی خۆی لە عالەم تێ ئەگەیاند.

لە دەوروبەری ساڵانی (۱۹۲۲)دا حوکوومەتی ئێران ـ کە ڕەزاخان وەزیری جەنگی بوو ـ خۆی کۆ کردەوە و «مەلك‌زادە» ناوی بە هەزار کەسەوە ناردە سەری لە وڵاتی «ورمێ»، ئەمانە هەموو جۆرە چەکێکی ڕێکوپێکیان پێ بوو. [سمایل ئاغا] بەرەنگاریان بۆ شکاندنی، (۷۰۰) کەسی لێ گرتن سەری بڕین!. بەم ئیشەی ئەوی زات بوو لەزاتی ئێرانییەکانا نەما، ناوی [سمایل ئاغا] بهێنرایە لەهەر دەستە سەربازێك لە شوێنەکەی خۆیانا وشك ئەبوون و توانای شەڕیان نەئەما!.

---

بۆی ئەشنێ و ئەگاتە سەری. سندۆقەکە ئەمدیو ئەو دیو ئەکا. کوتوپڕ [سندۆق] ئەتەقێتەوە!. تومەس ئەمە ناوەکەی هەموو پڕیەتی لە دانەمیت!.

«سمایل ئاغا» هەر ئەوەی پێ‌ئەکرێ پەلامار ئەدا و خۆی ئەخا بەسەر خەسرەوا. کە سندۆقەکەش ئەتەقێتەوە «دانەمیت»ەکانی بەو ناوەدا بڵاو ئەبنەوە و گەلێ کەس لە دانیشتوانی دیواخانەکە ئەگرێتەوە و ئەیانکوژێ، تەنانەت یەکێ لە کوژراوەکان برایەکی‌تری [سمایل ئاغا ]خۆی بوو لەو شوێنەدا!. ئەوەندە هەیە خۆی و «خەسرەو»ی کوڕی ڕزگاریان ئەبێ و بەرناکەون.

پاش ئەم کارەساتە وەڵام ئەنێرێ بۆ حاکمی [تەورێز] کە کارەساتێکی واقەوماوە و داوای ئەو کەسانەیان لێ ئەکا کە ئەم ئیشە ناشرینەیان لەگەڵ کردووە. حاکمی [تەورێز]یش بۆ ئەوە خۆی لەژێر ئۆباڵی ئەم کردەوەیە دەرکا شەش حەوکەس لەکاربەدەستانی «ورمێ» بۆ ئەنێرێ.

[سمایل ئاغا] کە ئەمانە وەرئەگرێ ئەیاننێرێتە سەر لووتکەی شاخێکی هەزار بەهەزار و لەوێ فڕێیان ئەدەنە خوارەوە هەپروون بە هەپروون ئەبن!. جا ئیتر بە هۆی ئەم کردەوانەوە ئەویش کەوتە سەر ئەو خوێنڕێژیە لە [عەجەم]ەکان و بە هیچ جۆر درێغی لێ نەئەکردن!.

«خاڵۆ قوربان» و «میرزا کوچك خان» هەبوون لە وڵاتی «ئەردەبێڵ» و «پشکۆ». ئەمانە هەر یەکە لە شوێنی خۆیان ناو و ناوبانگێك و دەورێکیان ئەگێڕا، لەو وڵاتانەدا ئەوانیش هەر لە پاش شەڕی گەورە حوکوومەتی ئێرانیان بۆ ماوەیەکی زۆر هێنابووە تەنگ، [میرزا کوچك خان] لە خەتی سنووری «قەوقاز»ەوە ئێرانی شڵەژاندبوو، خاڵۆ قوربانیش لەخەتی ڕەشت و گێلان و پشتکۆوە، دەورە درەخشانەکەی [ڕەزاخان] لەو دەورانەدا ئەوەبوو کە کردیە کارێ لە ئاخرا ئەمانەی ڕاکێشا بۆ لای خۆی و خاڵۆ قوربانی هان دا بۆ ئەوە بچێ بە گژ «سمایل ئاغا»دا و لە ناوی بەرێ!.

لەساڵانی (١٩٢١-١٩٢٢) «خاڵۆ قوربان» بە نیازی لەناوبردنی سمایل ئاغا بە لەشکرێکی کۆکی عەشایرییەوە ڕوو بە وڵاتی «سمایل ئاغا» بەڕێکەوت. کە ئەم خەبەرە گەیشت بە سمایل ئاغا ئەمیش خۆی کۆکردەوە و چوو بە پیریەوە، لەو شوێنە کە پێ ئەڵێن «حاجی حەسەن» تووشی یەك بوون، لەپاش شەڕێکی مەردانە «خاڵۆ قوربان» شکا و لەشکرەکەی ئەوی لەدەست سەربڕین ڕزگاریان بوو بەرەودوا بوونەوە و ئیتر جارێکی کە ئەو جۆرە لەشکرانە ڕوویان نەکردەوە بەوڵاتی «سمایل ئاغا»دا!.

✽ ✽ ✽

شەڕی (١٩١٤ - ١٩١٨) هەموو دنیای تێك شڵەژاندبوو، وڵاتی ئێران ڕێبازی ڕووس و تورك و ئەڵەمان و ئینگلیز بوو، لە ژێر پێدا پلیشابووەوە، حوکوومەتی قاجار لە ئێران هەر ناوی مابوو. «ڕەزاخانی پەهلەوی» لە ئێران هەڵکەوت؛ لە ئێرانێکی بێنووزەی ئەو دەورە، لە (١٩٢٠)دا «تاران»ی گرت، وەختێ ئەو تارانی گرت لە هەموو سووچێکی ئێرانەوە بڵێسەی ئاژاوە بوو، لە (١٩٢٣) بوو بە ڕەئیسی وزەرای ئێران، لە (١٩٢٤)دا «ئەحمەشا» - ئاخر پادشای قاجار- لەسەر تەختی ئێران هێنرایە خوارەوە، لە (١٩٢٥)دا «ڕەزاخان» بوو بە شای ئێران و بوو بە «ڕەزاشا».

لە ڕۆژی دوایی هاتنی شەڕی گەورەدا ڕەزاشا بەو ناوەوە کە ئەفسەرێك بوو لە نەیرووی ئێران هەموو جار گوێ لە کارەساتەکانی سمایل ئاغای سمکۆ ئەبوو کە لە وڵاتەکانی ڕۆژئاواو شیمالی ڕۆژئاوای ئێرانا ئەیگێڕا، بەڵام هیچی بەرانبەر پێ نەئەکرا، لەم ڕووەوە «ڕەزاشا» ترسێکی لێ پەیدا کردبوو. لە پاش ئەوەکە سمکۆ بەشەڕ و شۆڕ چار

نەئەکرا چەند جارێك ویستی لەگەڵی بکەوێتە قسە، ئەم هەر خۆی نەئەدا بە دەستەوە. لە ئاخرا بەوجۆرە لەگەڵی رێك کەوت کە لەسەر کانیەك هەیە لە «شارویران» «رەزاشا» بێت و «سمکۆ»یش بچێتە ئەوێ پێکەوە دوو بەدوو دەست بکەن بە قسەکردن.

لە (١٩٢٤)دا «رەزاشا» هات و ئەمیش چوو لەو شوێنە کەوتنە قسەکردن، مەرجیشیان ئەوەبوو کە هیچیان هێزێکی وایان لەگەڵ نەبێ. قسەکردنەکەشیان ئەوەبوو گۆیا ئەو بەشی وڵاتی کوردەواریـە بۆ [سمایل ئاغا] بێت و بەشـی [فـارس ]و [تورکمان]ەکەش بۆ رەزاشا و حوکوومەتی ئێران بێ و ئیتر سمکۆ واز بێنێت. ئەم جۆرە قسانەش زمانلووسی پیاوە ئێرانییـەکان بوو هـەر جارە لەگەڵ کوردەکان ئەیانکرد!. سا، لەوێدا هەر قسـەیەك کرا، کراو هەر یەکە گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان.

لە قسەکانی «سمایل ئاغا»یە کە لە پاشا گێڕابوویەوە وتبووی:

«من لـە ژیانما لەکـەس نەترساوم، بـەڵام کـە چاوم بـە [رەزاشا] کـەوت پشتم هاتە لەرزیـن!. مـن «هەلـم بۆ هەڵکـەوت ئـەوم نەکوشـت و هەلـم لەدەست بەردا، بـەڵام لە ئاخرا ئەو من ئەکوژێ!.»».

لـەو سـەردەمانەدا کـە لـە خاکـی [تورکیـا] بـوو وە لـە عەینـی وەختیشا نزیـك بـوو بە سنووری ئێرانەوە، لە شۆرشـەکانی (١٩٢٥ـ١٩٣٠)ی کوردەکانی تورکیا بەتەواوی ئاگادار بوو وەتازەش ئەو شۆڕشە دەستی پێ کردبوو، واتە هەر لە ساڵی (١٩٢٥)دابوو. هەستا «کەمال فەوزی» ناوی نارد بۆلای قونسوولی ڕووس لە «ورمێ» وتی: «ئەوا کوردەکان لە تورکیادا شۆڕشیان ناوەتەوە. ئەوان لەم ڕووەوە چی ئەڵێن؟.» قونسـوولیش وەڵامەکەی بۆ ناردەوە کەئەوان لەم شۆڕشەدا بە هەڵەچوون و هیچیان بۆ ناکرێ!.[1].

[سـمایل ئاغا] بـەم جـۆرە لەوڵاتەکانـی ئێـران و تورکیـا ڕۆژبـەڕۆژ پـەرەی ئەسـەند و هێـزی زیادی ئەکـرد. لەولاشـەوە حوکوومەتـی ئێـران و [ڕەزاشـا] هـەتا ئەهاتـن بەهێزتـر

---

١. وا دەرئەکەوێ ئەم خەبەرەی ـ سـمایل ئاغا بۆ قونسـوولی ورمێ ـ لەبەر ئەوە بووە کە بزانێ ئایا ڕووسـەکان پشتیوانی ئەو شۆڕشە ئەکەن یان نەء؟. ئەگەر نەیکەن ئەم ئەتوانێ لەسەر ئیشی خۆی بڕوا و دڵنیا ئەبێ لەوە کە مادام ڕووس پشتیوانی ئەولاناکا، ئەم سەر ئەکەوێ.

دیسـان ئەمەش دەرئەکەوێ کە ڕووسـەکان لەو سەردەمەشـدا پشـتیوانی هیچ جۆرە بزووتنەوەیەکی کوردییان نەکردووە!.

ئەبوون و عەشایرەکانی وڵاتی «ئێران»ی لەناو ئەبرد، حوکوومەتی تورکیاش عەینی چەشن دەوری عوسمانی نەمابوو، دەوری «کەمال ئەتاتورك» بوو، بەهەر دوولایانەوە ڕقیان لە [سمایل ئاغا] هەستابوو، هەریەکە لەلایەکەوە ئەیویست سەربەخۆ لە ناوی بەرێ، ئینگلیزیش لەوڵاتی عێراق لەوان خراپتر سیاسەتەکەی شتێکی‌تری ئەویست!..

سمایل ئاغا لەناو ئەم هەموو ئاگرانەدا خۆی ئەپاراست و بەڵکوو شان‌وشەوکەتی خۆی هەر زیاد ئەکرد. لە [تشرینی یەکەمی ١٩٢٦]دا لە خەتی «پەسوێ»وە هاتە عێراقەوە و ڕواندزی داگیر کرد و تێیایا دانیشت. «سید طه»ی شەمدینان بە هەموو جۆر لەگەڵی بوو، لەگەڵ عەشایرەکانی ئەو وڵاتانەدا هەموو ڕێ‌کەوتن و بوون بە یەك قسە، حوکوومەتی عێراقی دەستی لەو ناوانەدا بڕا. هەرچەندە لەشکر و نەیرووی ئەنارد بەشی ئەویش وەکوو بەشی لەشکرەکانی ئێرانی لێ‌هات!.

لێرەدا ئینگلیز کەوتە خۆی و ئەویش دایەپاڵ حوکوومەتی عێراقی، لە پاش شەڕ و هەرا و کوشتارێکی زۆر لەمارسی (١٩٢٨)دا «سمایل ئاغا» ناچار کرا بەوە کە بچێتە خاکی تورکیا، لەویش حوکوومەتی تورکی بە هەموو هێزێکیەوە بەرەنگاری بوو، هەرچەندە حوکوومەتی عێراق و ئینگلیز بە هەموو جۆر سەری ڕێیان پێ‌گرتبوو لەگەڵ ئەوەشا هەر لە عەینی ساڵا گەڕایەوە بۆ عێراق و ناوچەکانی پێشووی داگیر کردەوە!.

«مەندووبی سامی» بەغدا سەیری کرد ئەگەر [سمایل ئاغا] بەم جۆرە لەسەر ئیش بڕوا ئارەزووەکانی ئەو و تەونەکانی هەموو تێك ئەچن!. ئەمجا هێنای حوکوومەتی عێراقی هەڵخران بۆ ئەوە کە لەگەڵ حوکوومەتی ئێرانا قۆڵ بکەن بە قۆڵی یەکا بۆ لەناوبردنی [سمایل ئاغا]!. لە عەینی وەختا ئەمانەی هەموو کرد و هەر دوو حوکوومەتەکە بە جارێ کەوتنە پەلاماردانی سمکۆ، «سمکۆ» لەپاش شەڕێکی زۆر دیسان گەڕایەوە بۆ خاکی تورکیا.

لە پاش ماوەیەك سەیری کرد کاروباری ئەو و ئامانجی ئەو بەو جۆرە دروست نابێ کە هەر وابە بێ‌دەنگ لە خاکی تورکیادا دانیشێ. مەبەستیش ئەگەر شەڕکردنە شەڕ ئەبێ لەسەر شتێك بکرێ کە، بەرێکی هەبێ. لەبەر ئەمە هەستا لەوێشەوە گەڕایەوە بۆ وڵاتی ئێران؛ بۆ ئەو شوێنەی کە دوورە لە سنوورەکانی عێراق و تورکیاوە. بەم جۆرە لەو وڵاتەدا لێ‌دانیشت و حوکوومەتی «ڕەزاشا»یش هەر کۆششێکی ئەکرد بۆ لەناوبردنی بە هیچ دەرئەچوو.

حوکوومەتی ئێران کە زانی لە قاپی دوژمنایەتییەوە هیچی پێ لەگەڵ ناکرێ ئەمجا هێنای بینای دۆستایەتی و خۆشەویستی لەگەڵ دامەزراند و کەوتە قسەی خۆش‌کردن لەگەڵیا. بەم جۆرە «سمایل ئاغای» هێدی کردەوە تا کەوتە ساڵی (١٩٣٠)، لە نیسانی ئەو ساڵەدا بانگێشتنێکی ماقووڵانەی بە ناوی دۆستایەتییەوە لە شاری «شنۆ» بۆ کرد. سمایل ئاغاش بە هەموو دڵێکی دۆستایەتییەوە بە چەند سوارێکی کەمەوە چوو بۆ سەربانگێشتنەکەی.

ئەمەش گۆیا بەو ناوەوە کە دیسان [ڕەزاشا] ئەیەوێ چاوی پێ‌بکەوێ و هەندێ قسەوباس هەیە پێکەوە بیکەن، چەپەری ئەم دەستە گوڵەش «عەمەرخانی» شەرەفی یا شەریفی بوو ـ کە ئامۆزای سمایل ئاغابوو سمایل ئاغا بڕوای پێ ئەکرد، کە ئەچن بۆ سەربانگێشتن «سەرهەنگ سادق‌خان» ـ کە ئامر فەوجی شنۆ ئەبێ ـ دێت ئەڵێ: «شا، نەیتوانی بێت، من لەباتی ئەو هاتووم و میوانداری بەجێ دێنم»!.

شوێنی بانگێشتن و میوانداری لە قشڵەی حوکوومەت بوو، کە «سمکۆ» گەیشتە ناو شار بە پیرییەوە چوونێکی ڕەسمی لەلایەن حوکوومەتەوە بۆ کرا و دووڕۆژ میوانی حوکوومەت بوو. [سمایل ئاغا] ئاگای لێ نییە کە تەونی بۆ تەنراوەتەوە!. ڕۆژی سێهەم ئەیەوێ بگەڕێتەوە، فەوجێکی عەسکەر خۆیان بە دەورەی کۆشکەکەدا حەشارئەدەن. لەو وەختەدا کە [سمایل ئاغا] خەریکی نانخواردنی میوانداریی نیوەڕۆی حوکوومەتی ئێران ئەبێ پاشان هەڵئەستێ بگەڕێتەوە، «سەرهەنگ سادق‌خان» دەست ئەخاتە ناو دەستی و بە جووتە دێنە دەرەوە و ئەگەنە سەر پرد و شیوەکە، سەرهەنگ دەستی خۆی ڕائەوەشێنێ لە دەستی. لەگەڵی دەست ڕاوەشاندن، فەوجە عەسکەر لەناکاو دائەبارن و بەبێ پشوو دەست‌ڕێژێکی بەسەرا ئەکەن و [سمایل ئاغا] و پیاوەکانی ـ تەنها دووکەسیان نەبن ـ لەو شوێنەدا ئەکوژرین!. قسەکەی خۆی هاتە دی لەگەڵ ڕەزاشادا کە وتی: «من ئەوم نەکوشت، بەڵام ئەومن ئەکوژێ!.»].

حوکوومەتی «ئێران» گەلێ میوانداریی وای بۆ کوردەکان کردووە!. [جەوهەر ئاغای] برایشی هەر بەو جۆرە لە [تەورێز] میوانداریی بۆ کرا!.

ئیتر بە لەناوچوونی سمایل ئاغا شۆڕش و کۆششی چەند ساڵەشی لەناو چوو ئەو

ئاواتەی کە هەیبوو بردیە ژێر گڵ!. ئەوەندە هەبوو دەنگی بڵێسەی شۆڕشەکەی وەنەبێ هەر لەو کوانووەی کوردەوارییەدا بۆبێت، بەڵکوو دەنگەکە لە دەری کوانووەکە و لە پاش ئەو دەورەش بە هۆی ڕۆژنامەکانی بێگانەوە هەر ئەهات و ناوی ئەو شۆڕشە کەوتە سەر گەلێ لاپەڕەی کتێب و داستانان و لەمەوە شۆڕشێکی گەلێ فیکری کەوتە مێشکی زۆر لە کوردەکانەوە!.

◈◈◈

# شۆڕشی سابڵاخ

وەکوو لە شوێنەکانی‌تری ئەم کتێبەدا بۆمان دەرکەوت لەدوای دوایی هاتنی شەڕی (١٩١٤-١٩١٨) بیروباوەڕێکی‌تر کەوتە دنیاوە، کۆنگرە سیاسییەکان و پەیمانەکانی «سیڤەر» جۆرەشتێکی‌تریان بە مەردم پیشان ئەدا؛ ئەوەیان پیشان ئەدا کە هەموو قەومێك ئەبێ بە بەشی خۆی بگا و لە دیلی دەرچێ، بە تایبەتی قەومی کورد ئەم دهۆڵەی بۆلێ ئەدرا!. کە شەڕی گەورەی دووهەمیش هاتە پێشەوە، شەڕی (١٩٣٩-١٩٤٥) بە پەیمانی «ئەتلەسی» ئەو دەنگ و ئاوازەیە بە شەپوورێکی‌تر دیسان بڵاو کرایەوە!.

هەر کە جەنگی پێشوو دوایی هات قەومی کورد لە هەموو لایەکەوە کەوتە شوێنی دەنگەکەو ماوە بە ماوە لە هەر سووچێکەوە پێشوازی وەرگرتنی ئەو حەقەیان ئەکرد. بە تەبیعەت ئەم باوەڕە لە وڵاتی «سابڵاخ» بە پوختی بڵاو بووبووەوە؛ لە پاڵەوانەکانی شەڕی پێشوو حوکوومەتەکانی ئینگلیز، ڕووس، ئەڵەمان و عوسمانی بوون. ڕووس و عوسمانی هاوسنووری «سابڵاخ» بوون، ئەڵەمان و ئینگلیزیش بە هۆی دووەکەی‌ترەوە نەوەك هەر لە وڵاتی سابڵاخ بەڵکوو لە هەموو خاکی ئێرانا گەمەو گاڵتەیان ئەکرد!..

پاش کشانەوەی ئەوانە هەر یەکە بۆ وڵاتی خۆیان ـ بەناو! ـ شۆڕشەکانی سمایل ئاغای «سمکۆ» لە ڕەگ و ڕیشەی سابڵاخ و وڵاتەکانی تەرگەوڕ و مەرگەوڕ و سندوسدا، لەگەڵ شۆڕشەکانی [شێخ مەحموود] لە وڵاتی سولەیمانی، ئەم دوانە ئەوەندەی‌تر گوێچکەی وڵاتی سابڵاخیان ئەزرنگاندەوە بەوە کە ئەمانە سەربەخۆیی کوردیان ئەوێ. ئەمانە هەموو ئەوەمان پیشان ئەدەن کە گەلاڵەی بیروباوەڕێك لە وڵاتی سابڵاخا هەر لە دەمێکەوەبوو، کە هەبوو.

کە شەڕی دووهەم هات بەسەرا لەبەر ئەوە وڵاتی کوردەواری نەوتی هەبوو؛ ئەو نەوتە کە نەبوونەکەی پشتی ئەڵەمانی دابەزەویا، بوو بە چاوەندازی گەلێ لە حوکوومەتە گەورەکان، هەریەکە لەم ڕووەوە بە جیا ئەیەویست گەمە و گاڵتە و شۆخی لەگەڵ کورد و کوردەواریدا بکا!..

دیسان هەر بە هۆی شەڕەوە لەم‌لا و لەولاوە ئینگلیز و ڕووس ڕژابوونە ئێرانەوە،

دۆست بوون بۆ ئەوە ئەڵەمان لەناو بەرن، بەڵام لە پەنامەکێشا هەر دۆست بوون؟!. ئەمە «لۆرانس» و «ئەسداف» ئەیزانن، کە لۆرانس لەلایەن ئینگلیزەوە «ئەسداف» لەلایەن رووسەوە بە ناوی کاروباری سیاسەت و بازرگانیەوە بەوڵاتەکانی کوردەواری ئێرانا ئەگەڕان و هەریەکەیان بە بێدەنگی ئەویکەیان کوردەکانیان بەبارێکا ڕائەکێشا!!.. کوردیش لەبەر دڵسافی خۆی وە یا لەبەر ناچاری خۆی، دڵی ئەچوو لە دەنگی خۆش و شوێنی ئەکەوت!.

ئەم دڵسافی و ناچاریە بووە، کە لە هەموو ڕۆژ و لاپەڕەیەکی کوردا تووشی ئەوەی کردوون کە بکەونە شوێن دەنگی دهۆڵ!. نەوەك ئەوە کە دوژمنەکانی کورد ئەڵێن: کورد پارەپەرست و بێگانەپەرستە، پارەپەرست نییە چونکە وەنەبێ لەو دوژمنانە پارەپەرستتر بێ؛ دوژمنەکانی کورد بۆ پارە هەرشتێکیان هەیە و نییە ئەیدۆڕێنن، کورد لەسەر شەرەف و عەنعەناتی قەومی خۆی، خۆی ئەدا بە کوشت، نەوەك ئەیفرۆشێ بە پارە.

بێگانە پەرستییەکەیان ڕەنگبێ ڕاستبێ، بەڵام ئەمەش لەبەر دڵپاکی و لەبەر ناچارییە بە ئەڵهای قەومییەتەوە، ئەو بێگانانە خراپن کە ئەوەندە درۆ لەگەڵ کورد ئەکەن، نەوەك کورد خراپە کە بە هۆی دڵپاکییانەوە بە گوێ ئەوان ئەکەن. تا ئێستە وابووە بەڵام لە ئێستە بە دواوە پێویستە کورد خەبەری ببێتەوە و ئیتر بە گوێی کەس نەکا و کۆششی خۆی بۆ خۆی بێ.

لەبەر دوو شت بە گوێ کەس نەکا؛ یەکەم لەبەر ئەوە تا ئێستە کە شوێن تەموورەی خەڵك کەوتووە هیچی نەبەستۆتەوە، با ماوەیەکیش شوێن دەنگی خۆی بکەوێ بزانێ لەم دەرگایەوە چی ئەبێ؟. دووهەم با ئەو شوورەییە کە دوژمنەکانی پێوەی ئەنووسێنن و ئەڵێن بێگانەپەرستە با ئەو پەردەیەش لادا بزانین ئەو وەختە ئەو دوژمنانە چیتر ئەگرن بە دەستەوە بۆ، لەکەدار کردنی کورد؟!.

❋ ❋ ❋

ئەو دەنگی ئازادی و سەربەخۆییە کە لە لێواری دیواری دوو شەڕی (١٩١٤ - ١٩١٨ و ١٩٣٩ - ١٩٤٥)ەوە بەرز ئەبووە و بەر گوێچکەی کورد ئەکەوت عەینی دەنگیش بۆ بەر گوێچکەی ئازربایجان و وڵاتی «ئازربایجان» ئەکەوت. بە تایبەتی لەشەڕی دووهەما گوێچکەی ئەوان زیاتر ئەزرنگێنرایەوە، چونکە ئەوان بە بێ پەردە سنووریان نووسابوو

بە سنووری ڕووسیاوە، بۆ دەست خستنی نەوتیش دیارییەکی باش بوو!. ئەمە و خۆیشیان هەر لەگەڵیێ زووترەوە هەستیان بە شتێك كردبوو، بۆیە لە دەورەکانی «قاجاری»دا تەوریز پایتەختی «وەلی‌عەهد» بوو، بۆیە لە دەورەی ڕەزاشادا هەموو دەمێك تەوریز و وڵاتی تەوریز لەچەوساندنەوەدابوون و لە ژێر ئەو چاوێریەدابوون کە نەوەك لە ژێر فەرمانی [تاران] دەرچن و حەو ملیۆن کەسی [ئازربایجان]ی بگەن بە سەربەخۆیی!.

ئەو سەردەمە کە نەیرووەکانی - ئینگلیز و ڕووس - چووبوونە ئێرانەوە ئەو مەرجەیان دابوو، کە لەگەڵ دوایی هاتنی جەنگا هەر دوولا وڵاتی ئێران بەجێ بێڵن. شەڕ وردە وردە خەریکە دوایی دێت، تاکی تەرازووی سوێندخوارەکان خەریکە قورس ئەبێ. هەر دوو نەیروو لەدڵا ناتوانن دانکەنی نەوتی ئەو وڵاتە بین، لە ڕواڵەتیشا پێیان ناکرێ نەچنە دەرەوە چونکە پەیمان لەبەینایە، ئەم بەو ئەڵێ بچۆرە دەرەوە و ئەویش بەم ئەڵێ بچۆرە دەرەوە!.. لەبەر ئەمە پێویستە هەر یەکەیان بە ناوی شتێکەوە پێ دابگرن!. شتیش لەوە چاکتر دەست ناکەوێ کە دەنگی ئازادی و سەربەخۆیی قەومەکانی ئەو وڵاتە بڵاو بکرێتەوە!..

ئیبراهیم حەکیمی (حكيم الملك) سەرۆکی وەزارەتی ئێران و «جەنەڕاڵ ئەرفەع» سەرۆکی ئەرکانی جەنگ بوون، ئەگەر هەر جۆرە بەند و باوێك لەو وڵاتانەدا بڵاو بکرێتەوە وەنەبێ ئەوان بتوانن بەرهەڵستی بکەن، ئێران نەخۆش بوو، «حكيم الملك» نەخۆشتر بوو!. ئەڵێم نەخۆش بوو بەرانبەر بەو شەڕانەو بەو کێشوەرانە ئەگینا خوا هەڵناگرێ لەو ڕۆژانەدا «أسد عليَّ و في الْحُروب نعامةً!.» وەیا:

«شیراند پیش پشه و شغال‌اند پیش شیر!». ئەم شتانە و ئەم هۆیانە - بێجگە لە هۆیە تایبەتیەکانی‌تر - کردیانە کارێ کە لەوڵاتەکانی ئازربایجان و سابڵاخا سەرلەنوێ دەنگێکی‌تر پەیدا ببێتەوە، بەڵام ئەنجامی دەنگەکە ئەبێ بە قازانجی کێ؟. ئەوە مەبەستی شەپوورچییەکە نییە!. پەندێکی کوردی هەیە ئەڵێ: «پارەی کفن دەستکەوێ مردوو گۆڕ بەگۆڕ!.». لە هەموو وڵاتی کوردەواریدا نەوت هەیە، هەموو عالەم چاویان لەنەوتە، نەوت و کوردیش یەکێکە، نەوت دەستکەوێ کورد هەرشتێکی بەسەردێت با بێت!!..

❋ ❋ ❋

«سابڵاخ» کە پێ ئەڵێن «مهاباد» کەوتۆتە وڵاتی موکریان و لە ڕۆژئاوای خاکی ئێرانایە، پاڵی داوە بە [ئازربایجان]ەوە و نزیکە بە وڵاتی ڕووسیاوە، لە دوو شانیشییەوە کیشوەرەکانی عێراق و تورکیایە، ڕووبارێکی لە پاڵایە، هەر چوار دەوری کێوە و بوون بە شورەی شارەکە. هەر لە دەورێکی کۆنەوە بە هۆی سنوورەوە شوێنی هەرا و هوورا و ئاژاوە و شۆڕش بووە. دانیشتوانی [سابڵاخ] بە زەوق و دڵتەڕن، بەتایبەتی سەرچاوەی ئاهەنگ و مەقامەکانی کوردییە.

بەرەی قازییانی سابڵاخ زۆر لەمێژە ناو و ناوبانگیان لە دڵی خەڵکی سابڵاخ و وڵاتی موکریدا جێ خۆی کردۆتەوە، وەکوو بەرەی «تورجانی»یەکان ئەوانیش ئەو ناو و ناوبانگەیان بەو جۆرە هەر هەبووە.

وڵاتی کوردەواری پابەندی دیانەت و ئاشنای مەلایانی زانا و دانا بوون، دەستەی ـ مەلا و عولەما ـ لە هەموو وڵاتی کوردەواریدا پایەیەکیان هەبووە. «قازی موحەممەد» پایە و مەرکەزی باوباپیری و زانایی و زمانزانی و دەستڕۆیشتوویی خۆیشی ئەمانە هەموو پاڵیان پێوەنا کە پیاوێکی بەڕێز بێ لەوڵاتی سابڵاخا. دیسان «قازی عەلی» باوکی ـ کە کوڕی میرزا قاسمی کوڕی میرزا ئەحمەدی کوڕی میرزا قاسمی گەورە بووـ ئەویش لە پێشا شوێن ئاگردانێکی بۆ «قازی موحەممەدی کوڕی» دامەزراندبوو. بە تایبەتی کە «قازی عەلی» لە (١٩٣٨)دا کۆچی کرد و قەزاوەت و فتوا گەڕایەوە بۆ سەر «قازی‌موحەممەد» ئەوەندەی‌تر پایەی بەرز بووەوە.

لە [٢٥ی ئاغستۆزی ١٩٤١] کە لەشکری ئینگلیز و ڕووس لەم‌لاو لەولاوە چوونە ئێرانەوە، ئێران لە هەموو لایەکەوە کزی و بێ‌هێزی ڕووی تێ کرد، «ڕەزاشا» گیرا و برا بۆ وڵاتان.

لە عێراقا حیزبی «هیوا» هەبوو، ئەم حیزبە پەلوپۆیەکی باشی بڵاو کردبووەوە و ناو و ناوبانگی بۆ هەموو لایەکی کوردەواری ڕۆیشتبوو. ئەم حیزبە حیزبێکی کوردی بوو، لە ئەفسەران و سەرۆکی عەشایر و قوتابیان و خوێندەوارن چووبوونە ناویەوە. لە سالان (١٩٤٢-١٩٤٣) میرحاج ـ کە ئەفسەرێك و یەكێك بوو لە ئەندامە بەکارەکانی هیوا ـ بە ناوی گەڕان و دیدەنیەوە چوو بۆ وڵاتی موکریان بۆ ئەوە بتوانێ تیشکی هیوا بخاتە ئەویشەوە،

هەرجارە کە ئەچوو بۆنوبەرامەیەکی وای بەرچاو نەئەکەوت کە بتوانێ ڕاستەو ڕاست کوانگەیەك بۆ ئەم حیزبە پەیدا بکات.

هەندێ لە گەنجەکانی ئەو وڵاتە ـ کە تا بیست کەسێك ئەبوون ـ لە «سابڵاخ» بە ناوی «کۆمەڵەی. ژ. ك»ەوە دەستیان دابوو بە ئیشەوە گۆڤار ـ یکیشیان بەو ناوەوە دەرئەکرد. گۆڤارەکە ئەبرا لە «تەوریز» لە چاپ ئەدراو لە وڵاتی موکریان بڵاو ئەکرایەوە. ئامانجی کۆمەڵەی. ژ. ك ئەوەبوو کە ژیانی کوردستانی گەورە بێ[1]. «میرحاج» لە جاری دواییدا خۆی گەیاند بە ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە و داوای ئەوەی لێ کردن کە دەستی یارمەتی بۆ بەجێهێنانی ئامانجەکەی خۆی بۆ درێژکەن، ئەندامانی کۆمەڵە بە جۆرێك هاتنە پێشەوە کە بە هەموو ئاشکراییەك لەیەك تێگەیشتن و لقی حیزبی «هیوا» لەو وڵاتەدا دامەزرا.

---

١. سەرچاوەوە و بناغەی دامەزراندنی ئەم حیزبەش لە پێشا ئەگەڕێتە بۆ ئازایەتی «مەلای داودی». ئەم مەلای داودیە پیاوێکی بیروناکی بەجەربەزە بوو، دووکانێکی بچکۆلەی بەقاڵی هەبوو لە شاری سابڵاخ کردبووی بە دەستمایەی ژیانی. خەڵك و خوا و گەنجان هاتوچووی دووکانەکەیان ئەکرد. لەو دووکانە بچکۆلەیەدا [مەلای داودی] بیروباوەڕی ڕووناك ئەکردنەوە و وەکوو قسەکردنی گوێ ئاگردان دەرزی داستانی کوردایەتی دائەدان. لەمەوە بەرە بەرە توانی قسەکردنەکانی بخاتە شکڵێکی ڕێکوپێکەوە بۆیەیەکیتری بەسەرا بێنێت. تا، وای لێ کرد خستیە قاڵبی حیزبێکەوە و ناوی نایە حیزبی «ژ. ك» و هەموو ئەندامانی حیزب تا ١٢ کەسێك ئەچوون.

پاشان «عەزیزی زەند» هەبوو، هەتا بڵێت بەکار و گورجوگۆڵ بوو لەو ڕۆژەدا بۆ ئیشی کوردایەتی، ئەویش خۆی لە [حیزب] نزیك کردەوە و دەستی تێخست و وردە وردە خۆی کرد بە خاوەن و سەرۆکی ئەو کۆمەڵە. لە ئاخرا عەزیز لەم کۆمەڵەیە هەندێکی ڕاکێشا و دەستەیەکیتریشی پەیدا کرد، ئەمانەی لە ژێر چوارچێوەی ناوی «حیزبی ئازادی خوای کوردستان»دا ڕێك‌خست.

«عەزیز» زۆر ئیش لێهاتووبوو، ڕۆژ بەرۆژ دام و دەزگای حیزبەکەی خۆی زیاتر ئەکرد، لەمەوە ناوی دەرکرد و وای لێهات ناسرا، بێگانەکان ـ بە تایبەتی حوکوومەتی ئێران ـ بە چاوێکی سەیرەوە سەیریان ئەکرد. بەرە بەرە حوکوومەتی ئێران ڕایکێشا بۆلای خۆی و بەرزی کردەوە. لە ئاخری کارا بە هۆی ئەوەوە گەلێ لیستەی ئەم «حیزب»ە کەوتە دەست حوکوومەتی ئێران و کەوتە گرتنی ئەندامانی ئەم حیزبە!. عەزیزیش بە تەواوی خۆی بوو بە پیاوێکی پیاوانی «ئێران»!.

پاش ئەم کارەساتە نرخێکی ئیتر لەلای پاشماوەکانی حیزب نەما و هەموو بڕوای خۆیانیان لێ وەرگرتەوە و بەڵکوو بە چاوی پیاوێکی گزیکەرەوە سەیر ئەکرا.

لە پاش ئەو حسیەنی فرووهەر لە پایەی سەرۆکی حیزبایەتیا شوێنی عەزیزی گرتەوە و کاروباری کۆمەڵە ئیتر لە ژێر چاوێری ئەوا ئەڕۆیشت بەڵام هەر بە جۆرێکی بێدەنگی، تا ڕۆزگاری «ئێران» گۆڕا و جەنگی دووهەم بەتەواوی کەوتە ناوەوە.

کۆمەڵەی «ژ.ك» بەرە بەرە پەرەی سەند و دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی نهێنیەکانی دڵی خۆیان و پروپاگاندە کردن بۆ ڕزگار کردنی کوردستانی گەورە. کۆمەڵە پەرەی سەند و زیادبوو. تیپ تیپ خەڵك ئەهاتنە ناویەوە، وای لێ هات پێویستی کەوت بەوە کە سەرۆکێکی دڵسۆزی ناوداری هەبێ. باوەڕی کۆمەڵە هاتە سەر ئەوە کە «قازی موحەممەد» شایانی ئەم سەرۆکیەی هەیە.

قازی کرا بە سەرۆك، هەر بەوە کە ئەو بوو بە سەرۆك کۆمەڵە ئەوەندەی‌تر پشتیوانی بۆ پەیدا بوو. مەلاکانی وڵاتی موکری لەم ڕووەوە خزمەتێکی گەورەیان کرد، هەر مەلایەك لە گوندەکەی خۆی ئیشێکی وای ئەکرد ئەگەر یەکێك نەچێتە ناو ئەو کۆمەڵەی «ژ.ك»ەوە ـ کە وا خزمەتی کوردایەتی و ڕزگاربوونی کورد ئەکا ـ ئەمە بە گوناحباریەکی گەورە ئەژمێرێ.

* * *

ڕووسەکان لەولاوە ناوچەی «ئازربایجان»ی ئێرانیان داگیر کردبوو و بە هەموو جۆر دەستیان خستبووە کاروباری ئەو وڵاتەوە. حوکوومەتی ئێران لە گیانەڵادابوو، «جەعفەر پیشەوەری» ـ کە پیاوێکی بە دیمەن بوو لە وڵاتی [ئازربایجان] ـ ڕووسەکان بە هەموو جۆر یاریەیان دا حیزبێکی دیمۆکراتی لە وڵاتی ئازربایجان دامەزراندو کەوتە سەر جیاکردنەوە و سەربەخۆیی ئازربایجان!.

لەم لاشەوە کۆمەڵەی «ژ.ك» ناوێکی پەیدا کرد و بە پەرەسەندنێکی تەواو پەرەی سەند. ناوی «قازی» کەوتە دیواخانە سیاسیەکانەوە، بە هەموو جۆر هاتوچوو لە بەینی «تەورێز» و «سابڵاخ»دا پەیدا بوو. ئەفسەران و پیاوانی ڕووس لە تەورێز ـ شوێنی پیشەوەری ـ هەر زۆر زۆر کەوتنە ناوەوە.

لەم هاتوچووانەدا «پیشەوەری» دەنگی بەرزبوونەوەی کۆمەڵەی [ژ.ك]ی کوردی لەم بن‌دەستەوە بۆ خۆی بەزیان هاتە بەرچاو ئەگەر لەگەڵی نەبێ!. لەم کارەساتە ڕووسەکان تێ‌گەیشتن. ئەمجا «قازی»یان بە سەرۆکی لێژنەیەك لە «عەلی ڕەیحانی» و «قاسمی حاجی بایزاغا» و چەند کەسێکی‌تر بە بانگێشتن بانگ کرد بۆ «باکۆ» بۆلای «جەعفەر باگرۆف». لێژنە لە تشرینی دووهەمی (١٩٤٥)دا چوو بۆ «باکۆ» و لەگەڵ جەعفەر باگرۆف لە ماوەی مانەوەی حەفتەیەکدا لەوێ هەموو جۆرە قسەوباسێکیان بڕیەوە

و بڕیار وادرا کە کۆمەڵەی «ژ.ك» ببێ بە «دیموکراتی کوردستان» و لەگەڵ حیزبی دیموکراتی پیشەوەریدا بۆ وەرگرتنی هەقی خۆیان ببن بە هاودەنگ.

لە پاش گەڕانەوەی لێژنە بۆ [سابڵاخ] هەموو ئەهلی شار و سەرۆکی عەشایرەکان و حەشاماتی وڵاتی موکریان بە بانگێشتنێکی ڕەسمی لە ئاخری تشرینی دووهەمی (١٩٤٥) دا بانگ کرد و لەو کۆمەڵەدا کۆمەڵەی «ژ.ك» ناو نرایە «کۆمەڵەی دیموکراتی کوردستان».

ئەم ناوە و ئەم دەنگە لە هەموو ئەو وڵاتانەدا بڵاو بووەوە و وردە وردە عەشایرەکانی ئەو ناوە وەکوو پوورەی هەنگ لە دەورەی ـ قازی و سابڵاخ ـ کۆبوونەوە و هیوایەکی گەلێ بەرز کەوتە ناو کوردەوە. بە تایبەتی دەستەی [مەلا موستەفای بەرزانی] و بەرزانییەکان ـ کە ڕوویان کردبووە سابڵاخ ـ ئەوەندەی تر هیوا و ئومێدی دابوو بە هەموو لایەك. بە هەر دوولاوە بەرە بەرە خەریکی بڵاوکردنەوەی دەنگی کورد و سەربەخۆیی کورد بوون لەوڵاتەکانی موکریان و «بانە» و «سەقز» و «فیض اللّە» بەگیدا.

لەو ڕۆژانەدا چوونی «مەلا» و بەرزانییەکان بۆ ئێران بێجگە لەوە کە هێزێکی گەورە بوون، بۆ حوکوومەتی کوردستان، ترسێکیشی خستە سیاسەتی تارانەوە!. چونکە لەولاوە [ئازربایجان] و لەم لاوە سابڵاخ لەم کاتەدا سەریان ڕاست کردۆتەوە و ئەیانەوێ خۆیان لە حوکوومەتی [تاران] دابپچڕن، گومانی تێدا نییە کە چوونی [مەلا موستەفا] لەم وەختە ناهەموارەدا ـ بەرانبەر بە تاران ـ شل و شێواوییەك پەیدا ئەکا. حوکوومەتی «تاران» بۆ گیرسانەوەی ئەم لێشاوە چارێکی نەدۆزیەوە ئەوەنەبێ کە بنووسێ بۆ ئامر فەوجی سەردەشت «سەرهەنگ پزیشکیان» بە هەر جۆر بێت مەلا پەشیمان بکاتەوە لەوە کە پاڵ بدا بە حوکوومەتی [سابڵاخ]ەوە!..

«پزیشکیان» بە هۆی «مام عەزیزی قەرەنیاغای مامش»ەوە دەمی گەیشت بە مەلا و گەلێ شتی بۆ هەڵڕشت؛ لەوشتانە: کە ئەمانە ئێستە بەرانبەر بە ئێران بێگانەن و حوکوومەتی [ئێران] بە ناوی پەنابەرانی سیاسییەوە ئەتوانێ داڵدەی ئەمانە بدا و زەویوزاریان بداتێ و مەلا خۆیشی لە تاران «نائب»ێك بێت و هەموو دەم لە پارلەمان و لەگەڵ وەزیرەکان و «شا»دا بێ!. حوکوومەت ئەمانەی لەگەڵ ئەکا و ئیتر ئەویش وازبێنێ لەوە کە بداتە پاڵ حوکوومەتی سابڵاخ!..

دیارە «مەلا» ئەمانەی نەچوو بە گوێچکەدا و بە پێچەوانەی ئەمانە ڕۆیشت و خۆی گەیاندە قازی و شاری سابڵاخ. چوونی پیاو و لەشکرێکی واو پڕچەك لە وەختێکی وادا گومانی تێدا نابێ کە هێزێکی مەعنەوی هەرەگەورە ئەبێ بۆ ئەو کەسانە کە ئەیانەوێ حوکوومەتێکی کۆرپەو و تازە دروست بکەن.

❁ ❁ ❁

ڕۆژەکانی ئەو وڵاتە هەرجارە پەردەیەکی تری پیشان ئەدا، لەناو ئەم پەردە ڕەنگاو ڕەنگانەدا کوتوپڕ لە [١١ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥]دا «جەعفەر پیشەوەری» لە تەورێز جمهووریەتی ئازربایجانی بڵاو کردەوە و ئەوەی دەربڕی کە وڵاتی «ئازربایجان» لە حوکوومەتی «تاران» و ئێران جیابووەوە و لەو ڕۆژە بە دواوە خۆی سەربەخۆ ئەژیت!.

لەگەڵ بڵاوکردنەوەی ئەم ئاگادارییەدا هەموو وڵاتی «ئازربایجان»یان لە نەیروو کاربەدەستانی حوکوومەتی [تاران] پاك کردەوە، مایەوە سەر شاری «ورمێ» کە «ئەحمەد زەنگەنە» ئامر فەوجی ئەوێ هەتا بەینێك شاری نەدا بە دەستەوە، پاشان ئەویش بە هۆی عەشایرە کوردەکانی ئەو دەورەو ئەهلی [ورمێ ]خۆیشیەوە گیرا و «ئەحمەد زەنگنە»ش خرایە ژێر محاکمە و لێ پرسینەوەوە.

لەو سەردەمانەدا کە «پیشەوەری» جمهووریەتی ئازربایجانی بڵاو کردەوە لەم لاوە «قازی موحەممەد» لێژنەیەکی بە سەرۆکی «موحەممەد حسەینی سیفی قازی» ناردبوو، بۆ [تەورێز] بۆ ئەوە هەر دوولا لەبەینی یەکا ڕێکەون و بە پشتیوانی یەك دەستی حوکوومەتی [تاران] لەو ناوەدا ببڕن.

پاش بڕانەوەی قسەوباسی [سیفی قازی] لە تەورێز، لە [١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥]دا کۆبوونەوەیەکی زۆر گەورە لە سەرۆکی عەشایەرەکان و ئەهلی ناوشار و قوتابیانی قوتابخانەکان لە ناو شاری سابڵاخ کراو «قازی موحەممەد» بڵاوی کردەوە کەوا لەم تاریخە بەدواوە وڵاتی «سابڵاخ» و کوردەواری لە حوکومەتی تاران جیابووەوە و لە ئێستە بەدواوە ئیعلانی سەربەخۆیی کرد.

لە ڕۆژی [١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥]دا بەیداخی حوکوومەتی تاران لەسەر دایەرەکان هێنرایە خوارەوە و لە ناو چەپڵەڕێزانی مەردما بەیداخی کوردستانی لە شوێن دانراو ئاڵای کوردستانی پیرۆز هەڵکرا. دروشمی ئاڵاکەش بەم جۆرە بوو:

سەرەتا پارچەیەکی سوور، پاش ئەو، سپی کە بە ئەندازەی چوار ئەوەندەی سوورەکە، پاش ئەو سەوز بە ئەندازەی بەشێ لە چوار بەشی سپیەکە. لە ناوەڕاستی پارچە سپیەکەدا نیو کورە ڕۆژێك. بەسەر ڕۆژەکەوە قەڵەمێك، لەم لاو لەولای ڕۆژەکەوە دوو گوڵە گەنم بە ڕەنگی زەرد. لەسەراوردی هەموانەوە بەشکڵی چەنبەر نووسرابوو «دەوڵەتی جمهووری کوردستان».

ئەم دەنگە بەم جۆرە لە هەموو وڵاتەکانا بڵاو بووەوە و تەنانەت دیواخانە سیاسییەکانی دەرەوەشی گرتەوە، لەهەموو کونو قوشبنێکی وڵاتی کوردستانی، ئەو وڵاتەوە پۆل پۆل خەڵکی ڕوویان ئەکردە «سابڵاخ» و دیدەنی دەوری تازەی کوردستان!.

کە ئەندامانی کۆمەڵەو هاتوچووکەرانی ژێر ئاڵای تازە تەماشایان کرد وەختی ئەوە هاتووە کە [جمهووریەتی کوردستان] بە جۆرێکی ڕەسمی بڵاوکەنەوە، لە [٢٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥]دا لە پاش کۆبوونەوەی هەموو ئەهلی سابڵاخ و سەرۆك عەشرەتەکانی وڵاتی موکری و «فیض اللّە» بەگی و ئەو ناوە «قازی موحەممەد» بە جۆرێکی ڕەسمی لەناو دنیایەکی خۆشی و شادمانیدا «جمهووریەتی کوردستانی» بڵاو کردەوە.

پاش ئەوە «موحەممەد حسیەنی سیفقازی» بە جلوبەرگی جەنەڕاڵیەوە لە شوێنێکی بەرزا ڕووبەڕووی خەڵکەکە ناوی [پێشەوا و سەرۆکی جمهووریەتی کوردستان]ی بۆ قازی موحەممەد بڵاو کردەوە. ئەمجا پێشەواش بە جلوبەرگی جەنەڕاڵی و بە ناوی سەرۆکی هەموو هێزی کوردستانەوە لە شوێنێکی بەرزا سوپاسگوزاری ئەم باوەڕ و بەراتەی خەڵکی کرد، سەربازان و قوتابیانی کورد نمایشێکیان لە بەردەمی پێشەوا و خەڵکەکەدا نواند و ئەوی پێویستی ڕەسمیاتی دروستکردنی حوکوومەتێکی تازە بێت بەجێیان هێنا. ئەمجا «قازی موحەممەد»ی پێشەوا بەم جۆرەی خوارەوە وەزارەتی کوردستانی دروست کرد و ئەندامی بۆ هەموو وەزارەتێك بەم جۆرە دانا:

١ـ سەرۆك وەزیر: حاجی بابەشێخی جەمیان.

٢ـ وەزیری جەنگ: موحەممەد حسیەنی سەیفی قازی.

٣ـ وەزیری پۆست و تەلگراف: کەریم ئەحمەدی.

٤ـ وەزیری فەرهەنگ: مەناف کەریمی.

٥- وەزیری کیشوەر: موحەممەد ئەمینی موعینی.
٦- وەزیری تەگبیر (مشاور): حاجی ڕەحمانی ئێلخانیزادە.
٧- وەزیری ڕێگەوبان: ئیسماعیل ئێلخانیزادە.
٨- وەزیری ئابووری: ئەحمەد ئیلاهی.
٩- وەزیری بازرگانی: حاجی موستەفای داودی.
١٠- وەزیری کشتوکاڵ: مەحموودی وەلیزادە.
١١- وەزیری کاروفرمان: خەلیل خەسرەوی.
١٢- وەزیری پرۆپاگاندە: سدێق حەیدەری.

لە ڕۆژی [١٤ی کانوونی دووهەمی ١٩٤٦]دا کۆبوونەوەیەکی گەورە کرا بۆ ئەوە کە «پێشەوا» سوێندی سەرۆك کۆماری بخوا، -کە ئەمە شتێکی قانوونی و ڕەسمیە لە هەموو نیزامێکی کۆماری و پادشایەتیدا -

[پێشەوا] فەرمانیدا بە ئەندامانی کۆمیتەی مەرکەزی کە قورئانی پیرۆز و دروشمی ئاڵای کوردستان ئامادە بکرێ. ئەندامانی کۆمیتە و وەزیرەکان یەك لە شوێنی یەك کەوتنە پشت سەری «قرآن» و «ئاڵا» کە -کە بەدەست مەلا حسەینەوە بوو- تا چوونە ژووری پێشەوا، پێشەوا هەستا و بە دەستی خۆی سەرپۆشەکەی لەسەر «قورئان» و ئاڵا کە لادا و ئەم سوێندەی خوارەوەی خوارد: -

«سوێند ئەخۆم بە خواو بە قرآنی پیرۆز و بە نیشتمان و شەرافەتی قەومی کورد و بە ئاڵای پڕ لە «ئیفتیخار»ی کورد، تا دوایی هەناسەی ژیانم و تا دوا تنۆکی خوێنم بە گیان و بە ماڵ لە ڕێگەی مانەوەی ئازادی کورد و بەرزکردنەوە و پایەداری ئاڵای پڕ لە ئیفتیخاری کوردا کۆشش بکەم و دوا نەکەوم، وە بەسەرۆکی کۆماری کوردستان و یەك گرتنی کورد و ئازربایجان إفتخار ئەکەم و کۆشش ئەکەم بۆ مانەوەی ئەم ئامانجە!.».

❋ ❋ ❋

کۆماری کیشوەری کوردستان بەم جۆرە دروست بوو و هەموو کوردەکان بە بەرزانییەکانەوە ڕوویان کردە ئەم کیشوەرە، دەنگی ئاوازی گەیشتە پاڕلەمان سیاسیەکان،

ڕۆژنامە نووسەکانی بێگانە بە هەموو جۆر بۆ وەرگرتنی باس و خواس ڕوویان تێ کرد.

لە پێش ئەم تاریخە و لە پاش ئەم تاریخەش هێزی کوردی کەوتە داگیرکردنی ئەو وڵاتە کوردەوارییانەی کە لە ژێر فەرمانی تارانابوون. لەو ناوەدا سەربازی ئێران لە «میاندوواو» و هەندێ پۆلیسی ئێرانی لە «بۆکان» مابوونەوە؛ بۆکان هەر دەمێك بوو لە هێزی ئێران پاك کرایەوە، ئابڵۆقەی «میاندوواو»یشیان دا، ئامر فەوجێ میاندوواو «عەقید موستەشاری» لە ئاخرا کە تێگەیشت بەرانبەری پێ ناکرێ، خۆی و شاری دابەدەستەوە و داوای ئەوەی کرد لە حوکوومەتی کوردستان کە ڕێگەی بدەن و بڕوا و شار بەجێ بێڵێ. ئەمانیش ڕێگەیان دا و لە ڕێگەی «هەوشار»ەوە ڕۆیشت و وڵاتی میاندوواو لە [١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥]دا بەتەواوی لە ژێر حوکمی تارانا دەرچوو.

لەم لاشەوە ڕوویان کردە «سەردەشت» دەورەیان دا، ڕێگەی هاتوچووی نەیرووی ئێرانی بەینی «سەردەشت» و «بانە»یان بڕی، لە جنووبی ڕۆژهەڵاتەوە هێزی نەیرووی کورد گەیشتە «سەقز»، ڕێ هاتوچووی هێزی ئێرانی بەینی «بانە» و «سەقز»یشیان بڕی. بەکردنی ئەم ئیشانە مەعنای وابوو هەموو ناوچەکانی کوردەواری ئەو وڵاتە کەوتنە ژێر فەرمانی حوکوومەتی کوردستانەوە و فەرمانی حوکوومەتی [تاران] نرخێکی لەو ناوەدا نەما.

هەر سەربازێکی حکوومەتی ئێران کە لەو ناوچانەدا هەبوو بە هەموو جۆر لەلایەن هێزی کوردییەوە ئابڵۆقە دران و ڕێگەی ڕزگاربوونیان بڕا. ئەم سەرکەوتنی لەسەر یەك و پەرەسەندنی هێزی کوردییە حوکوومەتی ئێرانی خستەسەر ئەو باوەڕە کە زۆری پێ ناچێ ئەمانە پەلاماری «سنە» و «کرماشان» ئەدەن و بەڵکوو هەموو ڕۆژئاوای ئێران دائەگرن!. لە ڕاستیشدا ئەو بینەی کە ئەمان پێیانەوە نابوو ئەو ئارەزووەی بەجێ ئەهێنا.

بە تایبەتی لە ناوچەکانی «سەقز ـ بۆکان» و «بۆکان ـ میاندوواو»ەوە بە هەموو چەشنە ئیش کردنێك ئیش ئەکرا. وەکوو ئەوە لە [٣٠ی نیسانی ١٩٤٦]دا حوکوومەتی ئێران هێزێکی گەورەی سوارەو پیادەی بە هەموو جۆرە چەکێکەوە نارد بۆ ڕزگار کردنی ئەو هێزانەی کە لە شیمالی سەقز ـ ەوە لە لایەن نەیرووی کوردییەوە ئابڵۆقە درابوون. ئەمانەش ئەبوایە بچوونایە بۆ «قارەوا» و «ئاڵتوون»ی سەرو. لێرەدا هێزی بەرزانی، [قادرخانی] و «فیض اللّە» بەگی» لێیان ڕاپەڕین و «قارەوا» و هەموو دەوروبەریان

گرت. (١٨) سەرباز و ئەفسەریان لێ بریندار کردن، (٤٩) کەسیان لێ کوشتن و چەك و تالانێکی زۆریشیان دەست کەوت. ئەم شەڕە تا (١٢)ی مارس درێژەی کێشا.

لە خەتی «ئالتوون»ی سەرووەوە ڕوو بە ڕێگەی «بانە» دیسان هێزی بەرزان ئەو ناوەشیان گرت و بەریان لە ئێرانییەکان بڕیەوە. لەلای «بۆکان»یشەوە هێزێکی کوردی باش ئەو ناوەی داگیر کردبوو. «عەمەرخانی شەریفی»ش لە قۆڵی «تەمووتە»وە جادەی بەینی «سەقز» و «بانە»ی داگیر کردبوو. دەستەیەکی تریش خەتی بەینی «بۆکان ـ میاندوواو»یان گرتبوو. لە لای «سەردەشت»یشەوە عەشایری هەرکی، گەورگ و کلاسی ئەو ناوەیان گرتبوو.

بەم جۆرە ئەم وڵاتانە هێزی حوکوومەتی ئێرانیان تێدا کز کرابوو و هێزی کوردی بەوەرگرتنی فەرمان لە «سابڵاخ»ەوە هەنگاو بە هەنگاو تێدایا ئەبزووتنەوە.

ئەو هێزە ئێرانیانە کە لە «میرەدێ» و «بانە» و «سەردەشت»دا بوون و لە لایەن هێزی کوردییەوە دەورە درابوون، لەلایەن گوزەران و ڕابواردنەوە حاڵێکی شڕیان هەبوو، چونکە ئەمانە لە «سەقز»ەوە مانگانە و شتومەکیان بۆ ئەهات، ڕێگەی [سەقز] لەمانە هەموو گیرابوو. قیادەی ئێران لە [سەقز] ویستی هێرشێك بکا و خەتی بەینی خۆی و ئەو شوێنانە بەرەڵا بکات، بەتایبەتی خەتی بەینی «سەقز ـ سەردەشت» ـ کە ئەم شوێنە بەتەواوی شپرزەبوو ـ

لە [١٦ی مارسی ١٩٤٦]دا پێنجسەد سەرباز بە هەموو جۆرە چەك و جبەخانەیەکەوە پەلاماری گردی «سەیدەگردە»ی دا ـ کە ئەم گردە تەنها (٨) سەربازی کوردی لێ بوو. لە پاش سەعات و نیوێك شەڕ هێزی ئێران بەشکانێکی خراپ شکان!. ئەم شکانە شکانێکی مەعنەوی زۆر ناهەمواری دا بە هێزی ئێران؛ سەیر ئەکرا لێرەوە ئەم شکانە ناشیرینە ڕووی دا، لەلایەکی ترەوە بەرزانییەکان و [حەمەرشیدخان] و شکاك ئەوا خەریکن ڕێگەی «دیواندەرە» ئەگرن، «تەموتە» و «هەیەجانان» بەتەواوی کەوتە ژێر حوکمیانەوە، «سەرشیوی سەقز» خەریکە پاك ئەبێتەوە، ئەگەر بەم جۆرە بڕۆن زۆری پێ ناچێ لووت ئەنێن بە مەریوان و هەورامانەوە و «سنە»ش ئەڕوا!.

لەبەر ئەمانە قواتی ئێرانی بەتەواوی چوار چمکی خۆی کرد بەلادا و خۆی ئامادەی شەڕێکی گەورە کرد. دوو هەزار سەربازی پڕچەکی ئەو ناوە بە هۆی هێزی ئاسمانی

و تانك و دەبابە و زرێلی و تۆپەوە بەرێ‌کەوتن بۆ گردی «مامەشا». لەم شوێنەدا «موستەفا خوشناو» بە (٣٨) سەربازی کوردەوە ڕەگی خۆی داکوتابوو. ئەو هەموو هێزی ئێرانە پەلاماری ئەو دەستەیەدا، لە (١٧)ی مایسدا هەر لە سەر لەبەیانەوە جەنگ گەرم بوو، قواتی ئێرانی لە هەموو لایەکەوە سنگی ئەیهێنایە پێشەوە، فڕۆکە لە ئاسمان و تۆپ و دەبابە لە خوارەوە وەکوو بارانی بەهار گوللە و بۆمبایان ئەباراند.

هێزی کوردی بەرانبەر بەم هەموو ئاگرە ئەجەنگی و سنگی کردبوو بە مەتاڵ، شەڕ لەوانەبوو، بوو بە دەستەویەقە، قیادەی شەڕی «مامەشا» وا هەڵئەسووڕێنرا ئێرانییەکان وا تێ‌ئەگەیشتن کە ئەو هێزی کوردییەی لەگەڵ ئەوان شەڕ ئەکەن نابێ کەمتربن لەدوو هەزار سەرباز بە هەموو چەکێکەوە، لەگەڵ ئەوەشا ئەمان لە (٣٨) کەس زیاتر نەبوون!.

ئەو ڕۆژە تا ئێواری جەنگێکی دلێرانە کرا و کوشتارێکی زۆر زۆر لە هێزی دوژمن ڕووی دا، ڕۆژی دوایی جەنگ دەستی پێ‌کردەوە و هەرجار تاکی تەرازوو بەلایەکا «قورس» ئەبووا. لەدەمەو ئێوارەدا ئێرانییەکان خەریکی کشانەوە و گەڕانەوە بوون، واتە لەسەر شکان بوون، کوتوپڕ هەڵەیەك لە دەستەی ئەم‌لا ڕووی دا و ئەو هەڵەیە لە ئاخرا بوو بە هۆی ئەوە کە گردی «مامەشا» بەجێ بێڵن!.

ڕاستە گردەکەیان بەجێ هێشت و لە شوێنێکی‌تر سەنگەریان گرت بەڵام زیانێك کە ئەوان لە هێزی [ئێران]یان دا و ئازایی و بەجەرگییەك ئەوان لەو شەڕەی [مامەشا]دا نواندیان هەموو ئەفسەرەکانی ئێرانییان سەرسام کردبووا. لە پاشا بە هەموو سەرسڕمانێکەوە شەڕی مامەشایان باس ئەکرد و نەئەچووە دڵیانەوە کە لەو شەڕەدا کەمتر لە دوو هەزار کەس سەری ڕێی پێ‌گرتبێتن!. لەم شەڕەدا (٥) کەس لە دەستەی کوردی شەهیدکرا، یەکێك لەوان «خۆشەوی خەلیل» بوو کە لەم شەڕەدا بریندار بوو پاشان برایە خەستەخانەی [سابڵاخ] و لەوێش چار نەکرا لە ئاخرا مرد و بە کۆبوونەوەیەکی ڕەسمی لەلایەن حوکوومەتەوە تەرمەکەی نێژرا.

کوشتاری هێزی ئێرانیش گەیشتبووە ئەندازەیەك کە حوکوومەت لە [سەقز] مەنعی گەڕانی شەوی کردبوو، یەکێ لەو ئیشانە کە ئەم مەنعەی بۆ کراوە هێنانەوەی کوژراوەکانی شەڕی [مامەشا]یە بۆ ئەوە خەڵك نەیانبینێ و لە چاوپێ‌کەوتنی کوشتارێکی وا زۆر ورە

بەرنەدەن! وەکوو ئەوانەی لەو شەڕەدا بووبوون و ئەیانگێڕایەوە لە کەم شوێن وا ڕێ کەوتووە هێزی ئێران ئەوەندە کوشتار بدا بە دەستەوە.

* * *

کە ئیش گەیشتە ئەم شوێنە سەرلەشکری ئێران «ڕەزمئارا» کەوتە سەر ئەوە کە ئیشێکی وابکا لەگەڵ کوردەکانا دەمیان بگا بە یەك و بەڵکوو ڕێکەوتنێك دروست بکا. بە جۆرێکی ڕەسمی داوای کرد لە حوکوومەتی [سابڵاخ] کە چەند کەسێك بە ناوی «ممثلە»وە بنێرێ بۆ [سەقز] بۆ قسەکردن لەکاروباری ئەو ناوەوە.

لە [٢٦ی مارسی ١٩٤٦]دا حوکوومەتی سابڵاخ «عیزەت عەبدولعەزیز»، یاوەر ئیبراهیم، یاوەر جەعفەر کەریمی» بە ناوی «ممثلە»وە نارد بۆ «سەقز» کە لەگەڵ ڕەزمئارادا قسەبکەن. ڕەزمئارا وتی:

«لەبەر ئەوە کە «قوام‌السلطنە» و «پیشەوەری» و «صدری قازی» لەم وەختەدا کەوتوونەتە گوفتوگۆی ئەوە کە کار و فرمانی وڵاتی ئێران، «ئازربایجان» و «کوردستان» بە جۆرێکی هێمنی و ئاشتی ببڕێننەوە پێویستە لەم ناوچانەشا شەڕ بووەستێنرێ تا ئەوان ئەگەن بە شوێنێك!.».

نێرراوەکانیش ڕەزامەندی خۆیانیان دەربڕی و لەسەر ئەم شتانەی خوارەوە ڕێکەوتن:

(١ـ ئەم نێراوانە بە ناوی حوکوومەتی خۆیانەوە خەبەر بنێرن بۆ ئەو هێزانەیان کەوان لەبەرانبەری هێزی حوکوومەتی ئێرانەوە بۆ ئەوە شەڕ بوەستێنن، وەکوو چۆن ئەم فەرمانە ئەکرێتە سەر هێزی ئێرانیەکانیش، شەڕ بوەستێنن تا ئاخر قسەی پێشەوایانی هەر سێ حوکوومەت دەرئەکەوێ.

٢ـ بۆ ئەوە هیچ تەنگ‌وچەڵەمەیەك لە بەینی هێزی «ئێرانی» و «کوردی»دا ڕوونەدا، کوردەکان (٤) کیلومەتر لەدەوری [سەقز] و سێ کیلومەتر لە شیمالی جادەی سەقز ـ سەردەشت بکشێنەوە دواوە و لە ڕووباری سەقز و «زەڕینەڕوود» نەیەن بەم لاوە.

(مومەسیلەکان وتیان بڕیاردان لەسەر ئەم بەندە لە دەسەڵاتی ئێمەدا نییە، ئەتوانین تا ماوەی (٢٤) سەعات ئەم قسەیە بگەیەنین بە «سابڵاخ» بزانین ئەوان بڕیار ئەدەن یان نەء؟.).

٣ـ نه، دەستەی هێزی ئێران، نه، هێزی کوردی حەقی ئەوەیان نیە، ئەو هێزانەیان کە ئێستە لەمەیدانی شەڕان و سەنگەرەکانی خۆیانیان گرتووە پشتیوانیان بکەن و هێزیتریان بۆ بنێرن، تا گوفتوگۆی پێشەوایەکان ئەبڕێتەوە، ئەوەندە هەیە فڕۆکەی ئێرانی ئەتوانێ تا (٤) کیلومەتری شیمالی «سەقز» و جادەی سەقز ـ سەردەشت بفڕێ، ئەمەش بۆ چاوێری کاروبار نەوەك شتێکیتر.

٤ـ بۆ ئەوە کە وا هەر دوولا دڵنیابن لە بەئەنجام گەیاندنی ئەم پەیمانە تا گوفتوگۆی پێشەوایەکان دوایی دێت سێ‌کەس لەلایەن حوکوومەتی دیموکراتی کوردستانەوە دابنرێت، یەکێ لە [سەقز]، یەکێ لە [بانە]، یەکێ لە [سەردەشت] کە ئەمانە لەگەڵ فەرماندەکانی ئێرانا لەو شوێنانەدا ئەگەر تەنگ‌وچەڵەمەیەك لەو ناوچانەدا ڕووی دا بیبڕێننەوە.

٥ـ مەفهوومی بەندی دووی ئەم پەیمانە بۆ ئەوە جێ خۆی بگرێ تا ڕۆژی (٢٨)ی مارس درێژ ئەبێتەوە!.).

ئەم بەندانە بەم جۆرە لە هەر دوولاوە ئیمزا کرا و تەنانەت لە دەستەی ئازەری ـ ش [ئیبراهیم عەلیزادە، خەلیل ئازەرئابادگان و حەسەن جەودەت] لە قومیتەکەدا هەبوون، ئەوانیش ئیمزایان کرد.

بەڵام ئایا ئەم پەیمانە کە بەم جۆرە بڕیاری لەسەر درا بردیان بەڕێوە؟. نەء، نەبرا بەڕێوە!. نەبرا بەڕێوە چونکە «ڕەزم‌ئارا» لە دانانی ئەم پەیمان و بەندانە مەبەستی ئەوەبوو کوردەکان بکاتە خەو تا خۆی ئیشی خۆی بەتەواوی قایم ئەکاو لەشکرەکانی [سنە] و [کرماشان] ئەگەیەنێتە ئەو وڵاتە، ئەو وەختە کە نەیرووەکانی خۆی بەهێز کرد پەیمان و بەندەکانی پەیمان وەکوو خەتی سەر ئاوی لێ‌دێت!..

کوردەکان لە پاش ماوەیەك کەزانیان ئەمە، داوە [ڕەزم‌ئارا] بۆی ناونەتەوەو یەك دووجار بێ‌پەیمانیان بە پێ ئەم بەندانە بۆ دەرکەوت، ئەو وەختە ئەمانیش ئیتر بە قۆڵ بەستراوی بۆی دانەنیشتن.

لە پاش ماوەیەك [ڕەزم‌ئارا] کە سەیری کرد ئیشی بەم جۆرە بۆ ناچێ بەڕێوە کەوتە سەر ئەوە کە لەگەڵ [قازی] خۆیدا بکەوێتە قسەکردن و ئەمجا بە جۆرێکیتر بێتە مەیدانەوە!..

لەسەر ئەم نیازە دەستی کرد بە ڕاسپاردن بۆ لای [قازی] کە لە شوێنێك یەك بگرن و لە کاروباری ئەو وڵاتەوە قسە بکەن. قازیش لەبەر ئەوە کە ئەیەویست ئیش بە خۆشی ببڕێتەوە خۆی دوور نەئەخستەوە لە چاوپێکەوتن و قسەکردن. بەم هۆیەوە گوندی «سەراو»ی دانا بۆ شوێنی ئەو چاوپێکەوتنە.

لە ڕۆژی [١٧ی حوزەیرانی ١٩٤٦]دا «قازی» خۆی و چەند کەسێك گەیشتنە «سەراو» و لەم لاشەوە «ڕەزمئارا» لە [سەقز]ەوە بەڕێکەوت، سواری جیبێك بووبوو، کە ئاڵای کوردستانی بەسەرەوەبوو، بە هەموو سەربەستیەکەوە خۆی و چەند کەسێك لە عەینی ڕۆژدا گەیشتنە «سەراو» و لەگەڵ قازی ـ دا کەوتنە قسەکردن. ئاخر قسەیان لەسەر ئەم شتانە بڕیاریان دا:

(١ـ حوکوومەتی کوردستان ڕای لێ بێ حوکوومەتی ئێران لەسەقزەوە خواردەمەنی و بەرگ بنێرێ بۆ ئەو هێزە ئێرانیانە کە لە [میرەدێ] و [بانە] و [سەردەشت] لەلایەن حوکوومەتی کۆمەڵەوە ئابلۆقە دراون، ئەویش بەمەرجێك ئەم شتانە وەختێك دەرباز ئەبن کە لەلایەن هێزی کوردییەوە بپشکێنرین و دڵنیابن لەوە کە هیچ جۆرە چەك و گۆبەندێکی شەڕی تێدا نییە.

٢ـ چەك و شتومەکی جەنگ بۆ ئەو شوێنانە بە هیچ جۆر ڕێنادرێ، هەروەها ئەو ئەفسەر و سەربازانە کە لە شوێنە ئابلۆقەدراوەکانان نابێ بگۆڕێن، مەگەر نەخۆش وە یا بریندارێك نەبێ، ئەوە گۆڕین و بردنی ئەوە دروستە.

٣ـ هەر کاروانێکی ئازۆخە و جل‌وبەرگ کە لەلایەن حوکوومەتی ئێرانەوە ئەچێ بۆ ئەو هێزە ئابلۆقە دراوانە ئەبێ لە پاش پشکنین، پیاوی کۆماری کوردستانی بەرەسمی لەگەڵ بێ.

٤ـ ئەگەر لەشکری ئێران بە پێچەوانەی ئەم بەندانە بجووڵێتەوە نەیرووی کوردی حەقی ئەوەی هەیە بەربەست بکا و نەیەڵێ شتومەك بچێ بۆ ئەو شوێنانە کە ناوبران!).

لە پاش ئەوە کە لەسەر ئەم بەندانە ڕێکەوتن قسە هاتەسەر ئەوە کە دوو کەس لەلایەن کۆماری کوردستانەوە بەناوی نمایندەوە لەگەڵ [ڕەزمئارا]دا بچن بۆ [سەقز] و لەوێوە بۆ بانە و سەردەشت بۆ ئەوە مەفهوومی ئەم بەندانە بە هەر دوو لەشکری ئەو ناوە بگەیەنن.

لەسەر ئەم تەگبیرە حاجی شێخ و عەقید نانەوازادە لەگەڵ ڕەزمئارادا بەڕێکەوتن بۆ [سەقز]. لەوێوە هەرسێکیان چوون بۆ [بانە]. بەرزانییەکان لە «قشلاخی ساڵح بەگ» لە ژێر فەرماندەیی «میرحاج»دا پێشوازییەکی باشیان کردن. ئەم پێشوازی و خزمەتکردنەی ئەوان ئومێدێکی زۆری دا بە [ڕەزمئارا] بۆ ڕێکەوتنەکەیان.

ئەم دەستەیە شەوی (١٩)ی حوزەیران چوونە «بانە» و لەبەیانیا چوون بۆ «سەردەشت» و ئەوی قسەوباس بوو لەو ناوەدا بە هەر دوو لەشکریان گەیاند و لە ڕۆژی (٢١)دا گەڕانەوە بۆ «سەراو» و دیسان [ڕەزمئارا] چاوی بە [قازی موحەممەد ] کەوتەوە و پاشان ئەو گەڕایەوە بۆ [سەقز] و لەوێوە بۆ «تاران» بۆ ئەوە ئەم کەین وبەینە لە حوکوومەتی تاران بگەیەنێ.

لەم ڕۆژانەشا لە قۆڵی «مەریوان»ەوە «حەمەخانی کوڕی مەحموودخانی کانیسانان» بەو نیازە کە خۆی بگەیەنێ بە حوکوومەتی کوردستان لەوێوە بۆ وڵاتی کۆمەڵە بەڕێکەوت، لە ڕێگەدا «عەلی بەگی ولەژێری» ـ کە سەر بە ئێرانییەکان بوو ـ سەر ڕێگەی بەدەستەی حەمەخان گرت، دەستەی حەمەخان، عەلی بەگ و تفەنگچییەکانی عەلی بەگیان شکان و بەڵکوو لە «قامیشەڵە»ش دەریان پەڕاندن!.

پاش ئەوە کە [ڕەزمئارا] و نمایندەکان لە «بانە» و «سەردەشت» گەڕانەوە و پاش ئەوە کە ڕێگەکانی ئەو ناوە ـ کە لەوەختی خۆیا هێزی کوردی خراپی کردبوون ـ چاك کرانەوە بەپێ پەیمانەکان، حوکوومەتی ئێران لە [سەقز]ەوە شتومەکی ئەنارد بۆ هێزەکانی خۆی کە لەو ناوەدا بوون و ئەم شتومەکانەش لە لایەن کاربەدەستانی کوردەوە ئەپشکێنران.

ماوەیەك بەم جۆرە تێپەڕی، کوتوپڕ جارێك کە کاروان پشکێنرا سەیریان کرد گەلێ تفەنگ و فیشەك و تۆپێکی تێدایە کە لە [سەقز]ەوە لە لایەن حوکوومەتی ئێرانەوە نێراوە بۆ هێزی [سەردەشت]!. ئەمە پێچەوانەی بەندەکان بوو، لێرەدا کاربەدەستانی کورد ئەم شتومەکانەیان گرت و بە پێ بەندەکان زەوتیان کرد.

بێجگە لەمەش «سەرتیپ ئایرم» کە فەرماندەی [سەردەشت] بوو ئەویش پەیمانی شکان و پەلاماری هێزی کوردی ئەو ناوەی دا!. لەبەر ئەمە هێزی کوردی ڕێگەی سەقز ـ بانە ـ سەردەشتیان گرتەوە و نەیانهێشت ئیتر کاروان بێت. لەم وەختەدا کاروانێکی

عەسکەری ئێران ـ کە (٢٤) سەرباز و ئەفسەرێك بوون و شتومەکی جەنگییان بۆ هێزی [سەردەشت] هێنابوو ـ کوردەکان بەدیل گرتنیان و هێنایانن بۆ [سابڵاخ]. ئیتر لەسەر ئەم کردەوانە بەینی حوکوومەتی ئێران و حوکوومەتی کوردستان تێك چووەوە!.

* * *

ئیش و کار هەتا ئەهات بەلای ئێرانیەکانا ڕووەو خراپتر ئەڕۆیشت. لەولاوە [ئازربایجان] بەو جۆرە دەستی دابوویە و لەم لاشەوە حوکوومەتی قازی هەر ناوچەی حوکمی خۆی بڵاوتر ئەکردەوە. «حکیم الملك»یش لە تاران پەیتا پەیتا بە فەرمان و بە ڕادیۆ، ڕووی ئەکردە هێزەکانی خۆی کە لەولاوە بگەڕێنەوە بۆ «هەوشار» و لەم لاوە بۆ [سەقز]. هەتا ئەو ئەم جۆرە فەرمانانەی بڵاو ئەکردەوە هێزی ئازەری و کوردی زیاتر تەنگیان بە نەیرووی [ئێران]ی هەڵئەچنی!.

لە ئاخرا چارنەما «حکیم الملك» لە وەزارەت لاچوو، ئەحمەد «قوام السلطنه» وەزارەتی دروست کرد و دەستی کرد بە ئیش کردن. لە پێش هەموو شتێکا ڕەئیسی ئەرکانی نەیرووی ئێرانی لابرد. قاپی سەربەستی دیموکراتی خستە سەر گازی پشت. ئەو حیزبانە کە داخرابوون ئیجازەی بە هەموویان دایەوە و ئەحزاب کەوتنەوە ئیش. لە گەورەکانی «توودە» و شیووعی ـ کە وەزارەتی پێشوو حەپسی کردبوون ـ هەموویانی بەرەڵا کرد. «ضیاءالدینی طباطبائی» و هاوڕێکانی ـ کە ئەمانە سەر بە ئنیگلیز بوون ـ هەمووی گرتن و لە بەندیخانەی توند کردن!.

لەپاش ئەوە کە ئەمانەی کرد ئەمجا داوای لە پیشەوەری کرد کە هەندێ کەس لە لایەن [ئازربایجان] و کوردستانەوە بچن بۆ [تاران] بۆ قسەکردن. دەستەی ئازەری لە ژێر سەرۆکی پیشەوەری و نێراوی حوکوومەتی قازیش «موحەممەد حسەین خانی سەیفی قازی» بوو، لە [١٠ی نیسانی ١٩٤٦]دا چوون بۆ [تاران]، هەزار و یەك قسە لەو کۆبوونەوەیەدا کرا و حوکوومەتی «قوام» بناغەی گەلێ وەعدی دارشت و بە ئیمڕۆ و سبەی ئیش دوائەخرا و وەعدەکانیش هیچی نەئەهاتنە ئەنجام!. [موزاهەرە] و هەمهەمە بۆ گەڕانەوەی لێژنە لە [تاران]، لە [ئازربایجان] و [سابڵاخ] دەست پێ کرا. لێژنە گەڕانەوە و پەیمانەکان هیچیان بەجێ نەهێنران!.

بەندێکی هەرەزلی ئەو پەیمانە کە لەبەینی قەوام و لێژنەدا قسەی لێوە کرا ئەوەبوو کە قەوام وتی:

«دانانی فەرماندەی لەشکر و پۆلیس لە وڵاتی [ئازربایجان]دا بەدەست ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازربایجان بێت، ئەو ئەنجومەنە کێی دانا حوکوومەتی ئێران بڕیاری لەسەر بدا.!».

کەچی کوتوپڕ لەسەرەتای نیسانا قەوام قسەکەی هەڵگێڕایەوە و بەم جۆرەی لێ کرد:

«دانانی فەرماندەی نەیروو پۆلیس لە ئازربایجانا لە دەست حوکوومەتی ئێرانایە و ئەو ئەبێ دایبنێ، بەڵام لەبەر ئەوە لێژنە وا تێ‌نەگەیشتووە و بە بارێکی‌ترا بۆی چووە، وا ئەو پەیمانە سەری نەگرت و هەڵوەشێنرایەوە!.».

ئەم تەسریحە ناهەمواره لەم وەختەدا کە قەوام دەری بڕی دەنگێکی زۆر ناشیرینی لە [ئازربایجان] و کوردستانا دایەوە، بەتایبەتی لە وڵاتی کوردەواریدا هەر زۆر پێچەوانەی ئەو مەرامە بوو کە ئەویسترا. لەبەر ئەمە «پێشەوا» دەستی کرد بە خۆکۆکردنەوە و گەورەکانی وڵاتی حوکوومەتی کوردستانی کۆ کردەوەو کەوتنە قسەی ئەوە کە پەیمانێکی دوو سووچی لەگەڵ [ئازربایجان]دا ببەستن.

لە [٢٤ی نیسانی ١٩٤٦]دا لە کۆشکی مەجلسی میللی ئازربایجان، سەرانی ـ حوکوومەتی ئازربایجان و کوردستان ـ کۆبوونەوەو بە ناوی دوو کیشوەری سەربەخۆوە پەیمانێکی جەنگی و ئابووری ـ یان پێکەوە بەست.

ئەندامانی دەستەی حوکوومەتی کوردستان بۆ ئەو پەیمانە ئەمانە بوون: ـ

(١) پێشەوا سەرۆکی حوکوومەتی کوردستان [قازی موحەممەد].

(٢) ئەندامی کۆمیتەی دیموکراتی کوردستان [سەید عەبدوڵڵای گەیلانی].

(٣) ئەندامی دیموکراتی کوردستان [عەمەرخانی شەریفی] سەرۆکی عیلی شکاك. (٤) ئەندامی حیزبی دیموکرات ڕەشیدبەگی جیهانگیری سەرۆکی عیلی هەرکی. (٥) ئەندامی حیزبی دیموکرات. زێڕۆبەگی بەهادوری. (٦) نمایندەی وڵاتی [شنۆ] قازی موحەممەدی خدری. (٧) وەزیری جەنگی حوکوومەتی کوردستان [موحەممەد حسەین خانی سەیفی قازی].

ئەندامەکانی حوکوومەتی میللی ئازربایجانیش ئەمانەبوون:

(١) سەرۆکی میللی مەجلسی ئازربایجان «حاجی میرزا عەلی شەبوستەری».

(٢) سەرۆکی وەزارەتی میللی ئازربایجان «جەعفەر پیشەوەری».

(٣) معاونی دەستەی مەرکەزی «حیزبی دیموکراتی ئازربایجان» [سادق پادگان].

(٤) وەزیری ناوخۆی حوکوومەتی ئازربایجان «سلام اللّه جاوید».

(٥) وەزیری فەرهەنگی حوکوومەتی ئازربایجان «پیریا».

بەندەکانیش کە لەسەریان ڕێکەوتن بەم جۆرە بوون:

[(١) لەو شوێنانە کە پێویستە، هەر دو حوکوومەتی ئازەری و کوردی ئەتوانن سەفیر و کونسوول لەوڵاتی یەکا دابنێن.

(٢) لە وڵاتی ئازربایجان؛ واتە لەو شوێنانەدا کە زۆرتر دانیشتوەکانی کوردن، کاروفرمانی حوکوومەت لە دەست کوردەکانا بێت. هەروەها لە وڵاتی حوکوومەتی کوردستانیشا ئەو شوێنانەی کە زۆرتر دانیشتوەکانی ئازەرین، کاروفرمانی حوکوومەت بە دەست ئازەرییەکانەوە بێت.

(٣) بۆ جێبەجێکردنی کاروباری ئابووری هەر دوولا، کۆمەڵێك لە پیاوانی هەر دوو کیشوەر دائەنرێن، ئەو شتانەی کە ئەو کۆمەڵە دایئەنێن سەرۆکی هەر دوو حوکوومەت بڕیاری لەسەر ئەدا و ئەو وەختە ئەکەوێتە ئیشەوە.

(٤) لە کاتی پێویستیدا هەر دوو حوکوومەتەی ئازربایجان و کوردستان قۆڵ ئەکەن بە قۆڵی یەکاو یەکیەتی جەنگی و سەربازی پێك دێنن و ئەوی پێویست بێ بۆ کۆمەككردنی یەك بەجێ دێنن.

(٥) ئەگەر وەختێك پێویست بوو بەوە کە قسەوباس و خواسێك لەگەڵ حوکوومەتی تاراندا بکرێ، ئەبێ هەر دوو حوکوومەتەی کوردستان و ئازربایجان پێکەوە بڕیار بدەن، ئەو وەختە بچنە ناو قسەکەوە.

(٦) ئەو کوردانەی کە کەوتوونەتە وڵاتی ئازربایجانەوە ئەبێ حوکوومەتی میللی ئازربایجان کۆشش بکا بۆ پێشکەوتنی زمان و فەرهەنگی میللییان. هەروەها حوکوومەتی کوردستانیش ئەو کۆششە بکا بۆ ئەو ئازربایجانیانە کە کەوتوونەتە خاکیەوە.

(٧) ئەگەر هاتو یەکێك وە یا هەندێك کەوتنە سەر ئەوە کە خەریك بن بۆ تێکدان و لەناوبردنی دۆستایەتی و یەك نەگرتن و لێك جیا کردنەوەی ئەم دوو میللەتە، ئەمانە بەهەر دووکیانەوە کۆشش بکەن بۆ لەناوبردنی ئەو دەستەیە و بۆ تۆڵەدانەوەی ئەو کەسە کە ئەکەوێتە سەر ئەم خەیاڵە!.].

کە ئەم پەیمانە بەم جۆرە بەسترا لە ئێستگەی تەورێزا بڵاو کرایەوە و پاشان بەندەکان بەشێوەی ئازەری و کوردی کران بە «بڵاوکراوە» و لەوڵاتەکانی ئازربایجان و سابڵاخا بڵاو کرانەوە، بە تایبەتی لە پاش بەستنی ئەم پەیمانە حوکوومەتی [قازی] بەتەواوی کەوتە ئیش‌کردن لە وڵاتەکانی کوردەواریدا. ئەو هێزانەی کە هەیبوو لە دەوروبەری «بانە» و «سەردەشت»دا ئەوەندەی‌تر بەهێزی کرد، لە وڵاتی «سەقز» و «سەراو»دا ـ کە مەرکەزی قیادەی کوردی بوو ـ بنکەی تەواوی داکوتا. بەگزادەکانی [سوێسنایەتی] و [گەورك] لە دەوروبەری سەردەشت لەگەڵ بەرەی پشدەریەکانی عێراق ئاشنایەتی خۆیان لەگەڵ سابڵاخا تازە کردەوە، لە دەوروبەری «سەقز»یش لەلایەکەوە «حەمە ڕشیدخان» و لەلایەکەوە «فیض‌اللّە بەگی»یەکان ئەوناوەیان قایم کرد. بەرزانییەکان لەناو ئەو هەموو خاکانەدا ڕایەڵێك بوون لە بەینی [سابڵاخ] و ئەو شوێنانەدا بۆ ڕێ‌پیشاندان و بۆ قایم‌کردنەوەی سنوور و جەنگەکانی ئەو ناوچانە!.

❁ ❁ ❁

کارەساتی حوکوومەتی «قازی موحەممەد» لەگەڵ حوکوومەتی پیشەوەریدا، دوو زنجیرە زنجیرن و لەگەڵێ لاوە پێکەوە بەستراون، لەبەر ئەوە پێویستە لە هەندێ شوێنا چاوێك بەو هاتوچووانەدا بگێڕین کە تەورێز لەگەڵ تاراندا ئەیانکرد.

ئەوەبوو لە [١٠ی نیسانی ١٩٤٦]دا دەستەیەك بە سەرۆکی «جەعفەر پیشەوەری» بۆ قسەکردن لە کاروباری [ئازربایجان] و لەگەڵ ئەویشا کوردستان، چوون بۆ [تاران]. ئەوشتانە کە ئەمان لە حوکوومەتی تاران بۆ بنج بەست‌کردنی حوکوومەتی ئازەری و کوردی داوایان ئەکرد (١٤) بەند بوون. پێویست بە باس‌کردنی بەندەکان ناکا، چونکە هەر جۆرێك بوون حوکوومەتی تاران بڕیاری لەسەر نەدان!. لە ئاخرا لە [١٣ی مارسی ١٩٤٦]دا دەستەی نێرراو بەبێ ئەوە بگەن بە شوێنێك گەڕانەوە بۆ «تەورێز». دیارە ئەم

چوونەیان لە پاش ئەو پەیمانەبوو کە لەگەڵ حوکوومەتی قازی موحەممەددا بەستبوویان. هەر ئەو پەیمانەش بوو کە ئیشێکی وای کرد حوکوومەتی تاران بکەوێتە تەلاشی ئەوە کە لەگەڵ هەر دوولایانا ڕێکەوێ، لەگەڵ ئەوەش هەر ڕێ نەکەوتن!.

کە ئەمان گەڕانەوە بۆ [تەورێز] ئیتر دەستیان دا بە بەئەنجام گەیاندنی ئەو بەندانەوە کە لەگەڵ حوکوومەتی «قازی»دا دایاننابوون. حوکوومەتی تاران کە سەیری کرد ئەمانە بەتەواوی دەستیان داوەتێ لەوانەیە ئەگەر بەم جۆرە بڕوا ئیش و کار بەلای تارانا هەتا دێت بێهێزتر ئەبێ!. پەشیمان بووەوە لەوە کە وەختی خۆی لەگەڵ نێرراوەکانی تەورێزا ڕێنەکەوتووە. ئەمجا بە ناچاری، ئەو، دەستەیەکی لە ژێر سەرۆکی «مظفر فەیروز»دا ڕێك خست و لە [١١ی حوزەیرانی ١٩٤٦]دا ناردنی بۆ تەورێز بۆ ئەوە سەرلەنوێ بکەونەوە گوفتوگۆکردن لە چۆنیەتی بەینی تاران ـ تەورێز ـ سابڵاخ ـ ەوە.

ئەم دەستەی تارانە لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ سەرانی حوکوومەتی «ئازربایجان» و «سابڵاخ»دا قومیتەیەکیان چنی و کەوتنە قسەکردن. لە «١٤» بەندەکەی پێشوو ـ کە وەختی خۆی دەستەکەی [تەورێز] بۆی چووبوونە تاران ـ (٧) بەندی تێدا هەبوو کە زۆرتر ڕازی نەبوونی تاران لەو (٧) بەندەدا بوو، ئەمجارە «موزەففەر فەیروز» لەلایەن حوکوومەتی تارانەوە لەو بەندانەی توزێ شل کردەوە و لە عەینی وەختا تەورێز و سابڵاخیش دیسان توزی شلیان کردەوە و لە ئەنجاما بەیەك گەیشتن.

موزەففەر فەیروز ئەم بە یەك‌گەیشتنەی بەسەرکەوتنێکی زۆر زل زانی و هەر لە ڕادیۆی تەورێزا بەندەکان و ڕێکەوتنەکەی بڵاو کردەوە، ئەمجا لەگەڵ پێشەوەریدا ئیمزای بەندەکانیان کرد و بەسەرکەوتووی گەڕایەوە بۆ «تاران».

ئەبێ ئەوەش بزانین کە هەندێ لەو کەسانە کە لەگەڵ موزەففەر فەیروزدا بۆ ئەم قسەکردنە چووبوون بۆ تەورێز لە ئەفسەرانی لەشکری [ئێران] بوون. هەندێك لە بەندەکان ئاشنایەتییان بە کاروباری ئەرتەشی ئێرانەوە هەبوو، ئەم ئەفسەرانە بۆ ئیمزاکردنی، خۆیان ئەگرت. لەبەر ئەمە دیسان ئەوان وتیان بۆ ئەم بەندانە پێویستە دەستەیەکی‌تر لە ئازربایجانەوە بچنەوە بۆ تاران قسە لەگەڵ ئەرتەشی تارانا بکەن. لەبەر ئەمە ئەوان ئیمزای بەندەکانیان لەلایەن ئەرتەشەوە نەکرد و هەروا بە بێ‌ئەوە بگەن بە بناوانێ، گەڕانەوە بۆ «تاران»!.

ئەمجا بۆ جاری دووهەم دەستەیەکی‌تر لە ژێر سەرۆکی «شەبوستەری» سەرۆکی مجلیسی میللی «ئازربایجان»دا لە [٢٠ی ئاغستۆزی ١٩٤٦]دا چوونەوە بۆ «تاران» بۆ قسەکردن لە کەینوبەینی ئەو بەندانە کە وەختی خۆی هەزار و یەك قسەی لەسەر کراوە!. نمایندەکانی ئازەری چەند بەندێك هەبوو ئەمانەیان زۆر مەبەست بوو، وەکوو ئەوە:

(١ـ ئەو ئەفسەرانە کە لە لەشکری «ئێران» هەڵاتوون و چوونەتە لەشکری ئازربایجانەوە، ئەمانە بگەڕێنەوە بۆ لەشکری «ئێران» بە زیاد لە پایەکەی خۆیان.

٢ـ ئەو ئەفسەرانە کە لە لەشکری دیموکراتدا هەن، [ئێران] هەموویان بە ئەفسەری تەواو بناسێ.

٣ـ حوکوومەتی «ئێران» لە ساڵا ملیون‌ونیوێك تمەن بخاتە ناو میزانیەوە بۆ ژیانی لەشکری «ئازربایجان».

٤ـ فەرماندەی لەشکر و ئامر فەوجەکان بۆ [ئازربایجان] ئەبێ بە قسەی «ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازربایجان» بمێننەوە.

٥ـ سەربازی ئیجباری ئازربایجان ئەبێ هەر لە ئازربایجان بمێنێتەوە.

٦ـ ئەگەر ئاژاوە و هەرایەك بوو بە ڕیشی ئێرانەوە، هێزی [ئازربایجان] لە پاش ئەوە کە «ئەنجومەتی ئەیالەتی» بڕیاری لەسەردا ئەتوانێ بچێ بۆ ئێران جەنگ بکا.

٧ـ ئەفسەرەکانی ئازربایجان نەچن بۆ شوێنێکی‌تر، هەروەها ئەفسەری شوێنێکی‌تریش نەیەت بۆ [ئازربایجان] مەگەر بە قسەی «ئەنجومەنی ئەیالەتی» نەبێ.)

کێشەکەیان زۆرتر لەسەر ئەم شتانەبوو، ماوەیەکی زۆر مانەوە، تا قەوام ڕازی ئەبوو، ئەرتەش ڕازی نەئەبوو، تا ئەمانە ڕازی ئەبوون «شا» ڕازی نەئەبوو!. بە کورتی هەر دەستی دەستییان پێ‌ئەکرا. ئەمانە ماوەیەکی زۆر لە «تاران» مانەوە، لەم‌لاوە لە «تەورێز» و «سابڵاخ» سەیریان کرد «لیژنە» نەگەیشتۆتە ئەنجامێك و شوێنێکیشی دیار نییە کە بێتەوە، دەست‌کرا بە [موزاهەرە] کردن بۆ هاتنەوەیان و لەسەر یەك، لەسەر یەك داوایان ئەکرد کە بگەڕێنەوە، لە ئاخرا لیژنە لە پاش مانەوەی نزیکەی دوو مانگ و نیو گەڕانەوە بەبێ ئەوە شتێك لەگەڵ خۆیان بێننەوە!.

هەروەها لە تەمووزی (١٩٤٦)دا حوکوومەتی ئێران بە جۆرێکی ڕەسمی «قازی موحەممەد»یشی بانگ کرد بۆ [تاران] دیسان ئەمیش هەر بۆ قسەکردن لە کاروباری کوردەوارییەوە، پێشوازیەکی باشیان کرد. لەپاش قسەکردنێکی زۆر و ڕێنەکەوتن، «قوام السلطنه» لە دەرگایەکی ترەوە سەری دەرهێنا، وتی:

«ئەگەر بێت و قازی و حوکوومەتی کوردستان واز لە دۆستایەتی و هاریکاری ئازربایجان بێنێ، حوکوومەتی ئێران هەچ ناوچەیەکی کوردەواری لە ئێرانا هەیە وازی لێ دێنێ بۆ ئەوە هەمووی بکەوێتە سەر حوکوومەتی کوردستانی قازی موحەممەد!..».

قازی ئاشنا نەبوو بەم قسەلووسانە و حوکوومەتی ئێران وەڵامێکی لێ وەرنەگرتەوە. کە، لەم دەرگاشەوە هیچ نەکرا بە هۆی «عبداللّە»ی ئێلخانیزادەوە کەوتنە ژێر پێی «قازی موحەممەد» کە بچێت چاوی بە «شا» بکەوێ، شا، ڕازی ئەکا و ئەشینێرێ بۆ «ئەمەریکا» بۆ سەیرانکردن!!..

دیارە لەم ڕووەشەوە هەر هیچ نەکراو پاش ئەوە «قازی» گەڕایەوە بۆ «سابڵاخ»!.

❋ ❋ ❋

لەو ڕۆژانەدا کە جەنگی گەورەی دووەم کاروباری هەموو وڵاتێکی تێکدابوو، جیاییەك نەبوو لە بەینی ئەو شوێنانەدا کە تێکلاوی شەڕ بووبوون لەگەڵ ئەو جێگایانەدا کە تێکڵاو نەبووبوون!.

وڵاتی «ئێران» یەکێك بوو لەو شوێنانەی کە گۆیا تێکڵاو نەبووبوو بەڵام لە مارسی (١٩٤١)دا کە سوێندخوارەکان چوونە ناویەوە کاروباری گەلێ لەو وڵاتانە خراپتر بوو کە ئاڵابوون بە جەنگەوە!. بڕیاری سوێندخوارەکانیش لەگەڵیا ئەوەبوو کە هەر لەگەڵ شەڕ دوایی هات ئەوان لەشکری خۆیان ئیتر لەو وڵاتە بکێشنەوە!.

لە [٢٦ی نیسانی ١٩٤٥]دا شەڕ دوایی هات، بە پێ ئەو پەیمانانە ئیتر ئەمان ئەبێ دەرچن، دەرچوونیش زۆر ستەمە چونکە ئەمان هەموو ڕۆژئاوای ئێرانیان کردووە بە وڵاتی خۆیان، واتە لە نیوەی شیمالیەوە تا نیوەی جنووبی. ئینگلیز لە «عەبادان»ەوە ئەسووڕێتەوە تێدایا تا ئەگاتە «سنە». ڕووسیش لە «تەورێز»ەوە تا ئەگاتە «سەقز»!.

ئەمە و بێجگە لەمەش لە ژێرەوە ئینگلیز ئەڵێ: ڕووس دەرچێ تا منیش دەرچم.

ڕووسیش عەینی قسە ئەڵێ ئینگلیز دەرچێ تا منیش دەرچم!. بەڵێ بە ئاشکرا ئەمە ناڵێن چونکە پەیمانەکە ئەمەی تێدا نییە، واتە ئەم بڕوبیانووە، بەڵام لەبەر ئەوە کە ئەم دووە، لەدڵا دڵیان لە عاستی یەك پاك نییە، ئەم بڕوبیانوانە دێننە ناوەوە. دیسان ئەو شوێنانە کە ئەمان هاتوچووی تێدا ئەکەن هەمووی شوێنی نەوتە، نەوتیش بۆ ئەو ڕۆژە لە هەموو سەرمایەیەك بەنرخترە.

ئینگلیز هەر لە زۆر لەمێژە دەستی لە نەوتی «عەبادان» گیر بووە و لەگەڵ ئێرانا هاوبەشە تیایا و ئەتوانێ بە ناوی هەڵسووڕاندنی بەشە نەوتی خۆیەوە پێ‌دابگرێ!. بەڵام ڕووس هیچی بە دەستەوە نییە و ترسێکی گەورەش ڕووی تێ کردووە؛ ڕووس نەوتی هەیە و لە قەوقاز «باکۆ»دایە، باکۆیش کەوتۆتە خاکی خۆیەوە، ئەوەندە هەیە بێجگە لەوە کە بیرەنەوتەکانی قەوقاز زۆرتریان بە هۆی شەڕەوە پەکیان کەوتووە، ڕەگ و دەماری ئەو نەوتەی کەوتۆتە وڵاتی [ئازربایجان] و کوردەوارییەوە. ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان لە وڵاتی ئازربایجان بیرێك لێ بدرێ مەعنای وایە نەوتەکەی «باکۆ»ی ئەو هەمووی وشك ئەکا!..

هەر ئەم ترسەیە کە لەسەدەی نوزدەهەمەوە وا لە دڵی ڕووسا و لەو وەختە بەدواوە هەموو دەمێك لە کۆششی ئەوەدابووە کە بەڵکوو ئیشێکی وابکا ئەو وڵاتی «ئازربایجان» و کوردەوارییەی بکەوێتە ژێر دەست و لەو ترسە ڕزگاری ببێ!.

لە دەورەی شایەکانی قاجارا هەر هەرا و هوریایەك کە لە بەینی ئێران و ڕووسا بووە هەر لەسەر ئەوە بووە، هەر ئەو ترسەش بوو کە شایەکانی قاجاری وا لێ کردبوو هەموو وەخت وەلیعەهد لە تەورێز دانیشێ!. لەشەڕی گەورەی یەکەما ـ ڕووسی قەیسەری ـ سەری تیاچوو هیچ نەکرا. لەشەڕی گەورەی دووهەما سەرەتا ئینگلیز و ڕووس گیریان خواردبوو بە دەست جەنگی هیتلەرەوە. کە ئەو جەنگەش دوایی هات هەرچەندە لە (١٩٤١)دا لە دەوری ڕەزاشادا ئەگەر «ئینگلیز» لێی تێك‌نەدایە زۆری نەمابوو ئیمتیازەکەی دەستکەوێ، کەچی سەرباری ئەمە ئاو و هەوا لە دەورەکان پێشوو گەلێ خراپتربوو، بۆ ئەوە کە ڕووس نەوتی «ئازربایجان»ی دەست نەکەوێ وە بەڵکوو هەر لە دەستی دەرچێ!. چونکە لەملاوە ئینگلیز بە جۆرێکی ئاشکرا و ڕاستەوڕاست دەستی لە ئێرانا هەبوو،

ئەیتوانی پێی خۆی لەگەڵ ئێرانا نەبڕێ، ئەیتوانی ڕۆژێ لە ڕۆژان بە ناوی دۆستایەتییەوە لەگەڵ «ئێران» ڕێ‌کەوێ و هەڵی خەڵەتێنێ بۆ ئەوە دەست بکا بە بەرهەمهێنانی نەوتی «ئازربایجان»!. کە ئەم نەوتە پێك هات ڕووس لە خاکەکەی خۆیشیا تنۆکێ نەوتی بۆ نامێنێتەوە و ناشتوانێ هیچ قسەبکا، چونکە ئێران ئەڵێ: «کەری خۆمەو گوێی ناڵ ئەکەم!.». واتە نەوتی خۆمە و لە خاکی خۆمایە و چی لێ ئەکەم لێی ئەکەم!.

جا ئەم ترسە، «ڕووس»ی وا لێ کردبوو کە بەهەر جۆربووە ئیشێکی وا پێك بێنێ، بەڵکوو بەلانی کەمەوە وڵاتی «ئازربایجان» لە ژێر چاوێری ئەوابێت و تۆزێ لەو ترسە ڕزگاری ببێ!.

هەڵگیرسانی ئەم شەڕی گەورەی دووهەمە زۆر لە باربوو بۆ ئەوە، کە حوکوومەتە گەورەکان، واتە شەڕ هەڵگیرسێنەرەکان لەبەر بەڕێوە چوونی کاروباری خۆیان شەیپوورێ بگرن بە دەمەوە و بە دنیادا بڵاوی بکەنەوە بڵێن: قەومەکەمەکان، وە یا قەومە ئازادی لێ زەوت کراوەکان ئەبێ ئازادی و سەربەخۆیی خۆیانیان بدرێتێ!.

ئەم قسەیە دارێکی چاك بوو بۆ ئەو ڕۆژە کە ڕووس بیگرێ بە دەستەوە و بڵێ «ئازربایجان» و کوردستانیش ئەبێ سەربەخۆی خۆیانیان دەست کەوێ. بێ‌گومان ئەگەر ئەمان لە ڕێگەی ئەوەوە بگەن بەو سەربەخۆییە هیچ شك لەوەدا نییە کە نەوتی ئەو وڵاتە ترس لێ نیشتووەکانی دەست ئەکەوێ و ئیتر هیچ شتێك نامێنێتەوە کە ببێ بە کۆسپ لە ڕێگەیا!.

بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش ئەبێ کۆشش بکرێ، کۆششەکەش ئەوەیە کە لەناو دانیشتووەکانی ئەو وڵاتانەدا بڵاو بکرێتەوە کە بڵێن «ئێمە سەربەخۆییمان ئەوێ». بۆ ئەمەش ئەبێ پیاویان لەو وڵاتانەدا بگەڕێ و پیاوی ئەمانیش بچنە وڵاتی ئەوانەوە!.

لەو ناوەدا و لەو دەورەدا «کلینسکی» و «ئەسمبرنوف» و «ئەسداف» یا خۆیان وە یا پیاوەکانیان ئەگەڕان و خۆیان لەخەڵك هەڵئەسوو، لەملاشەوە هەرجارە پیاوێ وەکوو «قازی موحەممەد» و «پیشەوەری» و «شەبوستەری» بانگ ئەکران بۆ وڵاتی «ڕووسیا» و «قەوقاز» هەر بۆ چاوپێ‌کەوتن و دەم بەیەك گەیشتن!.

ئەم هۆیانە هەموو یەکیان گرتبوو بۆ ئەوە لەو وڵاتانەدا دەنگێك بەرز ببێتەوە و

ئەوی پێ بکرێ کەڵکێك لەو ڕۆژە وەربگرێ. کزی و بێ تینی حوکوومەتی ئێرانیش زیاتر زەوییەکەی ئاو ئەدا. وەزارەتەکانی «صدر» و «حکیم الملك» هیچیان بە کەڵکی ئەوە نەئەهاتن کە بتوانن بەتەواوی کاروبار بگرنە دەست. ئەوەبوو کوتوپڕ لەم وەختە ناسکەدا «قوام‌السلطنە» هاتە مەیدانەوە و وەزارەتی ئێرانی دروست کرد. دەرگایەکی سەربەستی خستە سەر گازی پشت، ئیجازەی دایەوە بەحیزبە داخراوەکان، سێ ئەندامی لە حیزبی «تودە» خستە ناو وەزارەتەکەیەوە، ئینگلیز خواکانی گرت و خستینە بەندیخانەوە!.

کە ئەمانەی کرد ئەمجا حیزبێکی بەناوی [حیزبی دیموکراتی ئێران]ەوە دروست کرد. دانانی ئەم حیزبەی بناغە بوو بۆ پشت شکاندنی [حیزبی دیموکراتی ئازربایجان] و [حیزبی دیموکراتی کوردستان!.]. چونکە بەرە بەرە لە پیاوانی ئەو دوو حیزبەی ڕائەکێشا و ئەیخستنە ناو حیزبەکەی خۆیەوە، زۆرتر کۆششی ئەوەی ئەکرد، کە سەرۆك عەشرەتەکانی ئەو وڵاتانە بخاتە ناو جغزەکەی خۆیەوە.

هەروەها لە ڕۆژی [١٧ی شوباتی ١٩٤٦]دا وەزارەتەکەی خۆی خستە پێش چاوی پارلەمان و باوەڕی لێیان وەرگرت. ڕۆژی دوایی، واتە ڕۆژی (١٨)ی شوبات باڵی گرتەوە «مۆسکۆ» بگرە و هاتم! لەوێ تا [٧ی مارتی ١٩٤٦] مایەوە، چاوی بە «ستالین، مولوتوف و سادچیکۆف» کەوت و پاش ئەو ماوەیە گەڕایەوە بۆ «تاران»!.

❋ ❋ ❋

ئەم چوونەی «قوام‌السلطنە» بۆ «مۆسکۆ» لە باری پیلان و سیاسەتەوە ناوچەیەکی زۆر زلی هەبوو؛ ئەوەبوو لەو وەختەدا ڕووسەکان بۆ دەست خستنی نەوتی «ئازربایجان» زۆر لە پەرۆشا بوون، ئەو هەموو لاپەڕە سیاسیانە کە لەو وڵاتەدا هەڵئەدرایەوە هەمووی هەر لە بۆ ئەو نەوتە بوو.

کە قەوام ڕۆیشت و چاوی بە کاربەدەستانی ڕووس کەوت پێی‌وتن «ئاو و هەوای ئێرانی ئیمرۆژ ئەوە هەڵناگرێ کە بەو جۆرە پارچە پارچە ببێتەوە. ئەو نەوتەی کە کەوتۆتە شیمالی ئێرانەوە و ئەوسەری بەستراوە بە «باکۆ» و «قەوقاز»ەوە و ئەم‌سەری تا سەر ڕووباری چەغەتوو ـ میاندوواو دێت. من بەو ناوەوە کە سەرۆکی حوکوومەتی خاوەن نەوتم، ئەتوانم ئیمتیازی ئەو نەوتە بدەم بە ڕووس، ئیتر ئاو بکرێ بە ئاگرا!.».

ئەوقسانەی قەوام فێنکیەکی دا بە دڵی کاربەدەستانی ڕووس و لەسەر ئەم بناغەیە چوونە سەر مێزی قسەکردن و پەیمان‌دانان بۆ ئەم باسە.

ئەو پەیمانانە کە لەم ڕووەوە لەلایەن قەوامەوە بۆ ئەم باسە دانرا ئەمانە بوون:

(١ـ ئەم لە پێشا بەو ناوەوە کە سەرۆکی حوکوومەتی ئیمزای ـ دانی ئەم ئیمتیازی نەوتە بە ڕووس ـ بکات.

٢ـ لەم تاریخەوە تا ماوەی (٧) مانگ ئەو پاڕلەمانەی کە ئێستە لە ئێرانا هەیە بیخات و پاڕلەمانێکی‌تر دروست بکاتەوە بۆ ئەوە ئەو پاڕلەمانی تازەیە بڕیار لەسەر دانی ئەم ئیمتیازە بدات، بۆیەش ئەم پاڕلەمانە بخات، چونکە ئەمەی ئێستە بە جۆرێکی سەربەستانە نەهاتوونەتە ناوەوە! ئەبێ بۆ ئەم مەسەلەیە «پاڕلەمان»ێکی وا بێت کە هەموو ئەندامەکانی بە ئەوپەڕی سەربەستی میللەتەوە هەڵبژێرێن.

٣ـ لە ئێستە بەدواوە ڕووس لەشکری خۆی لەناوچەی نفووزی ئێران ـ بە تایبەتی ئازربایجان و کوردستان ـ بکشێنێتەوە بۆ ئەوە لەکاتی هەڵبژاردنی نائیبەکانی پاڕلەمانی تازەی ئێرانا هیچ دەنگێکی بێگانە لەو ناوانەدا نەمێنێ، ئەمەش بۆ ئەوە نەوەك خەڵکی دەست بکەن بە قسەکردن بڵێن هەڵبژاردن سەربەست نەبووەو لەمەوە قسەی‌تری لێ ببێتەوە!.).

ئەو مەرجانەش کە کاربەدەستانی «ڕووس» لەم ڕووەوە دایاننا ئەمانە بوون:

(١ـ بە هەموو مەعنایەك ئەبێ هەڵبژاردن سەربەست بێ لە هەموو ناوچەکانی «ئێران»دا و نابێ دەمی بێگانە لە هیچ لایەك لەم ڕووەوە ورتەی لێوە بێت.

٢ـ مەسەلەی «ئازربایجان» و دەوروبەری ئەبێ بە هێمنی و سیلم ببڕێتەوە.)

هەر دوولا لەسەر ئەم مەرجانە ڕازی بوون و ئیمزایان کرد و قەوام بە خۆی و بە پەیماننامەیەوە گەڕایەوە بۆ «تاران» و کەوتە کۆڕی ئیش کردنەوە، لە هەموو زیاتر ئەوەی بڵاو کردەوە کە ئەبێ سەر لەنوێ هەڵبژاردنێکی سەربەست لە وڵاتا دەست پێ بکرێ بۆ ئەوە ئازربایجان و کوردستان نائیبی خۆیان بە جۆرێکی ئازادانە بنێرن بۆ [پاڕلەمان] و ئەو وەختە ئەوان چە بڕیارێکیان‌دا لە بارەی پاشەڕۆژی وڵاتەکەیانەوە حوکوومەتی «ئێران» لەبەر ڕووناکی ئەو باوەڕەی ئەوانا ئەچێ بەڕێوە!..

* * *

لەبەین بەینی ئەم تەئریخانەدا ئەوەبوو کارەساتەکانی کوردەواری لە هەموو ئەو وڵاتانەدا لە جووڵەجووڵا بوون، هێزەکانی کورد هەر ڕۆژە لە لایەکەوە پێش ئەکەوتن. حوکوومەتی ئێران زۆرتر وەختی بەوەوە ڕائەبوارد کە ئاژاوە و شەڕی بە ڕیشەوە نەبێت، وا دیار بوو هەوای ئەو ڕۆژەی بەباش نەئەزانی بۆ خۆی!.

لەو سەردەمانەدا قسەوباسێك لەبەینی [تاران] و [تەورێز]دا هەبوو کە «زەنگان» لەسەر ئازربایجان نەمێنێ و بەڵکوو بکەوێتە سەر وڵاتێکی‌تر لە وڵاتەکانی ئێران. بەرانبەر بەمە حوکوومەتی «ئێران» بە هەموو مەعنایەك «تیکاب» و «سەردەشت» چۆڵ بکا و «دیموکراتی ئازربایجان» بچنە ناویەوە. دیارە ئەو دیموکراتانەش کە لەو ناوەدابن هەر دیموکراتی کوردستانە و ئەوان ئەچن داگیری ئەکەن. ئەمە وای لێ‌هاتەوە کە «تیکاب» و «سەردەشت» بەبێ هیچ قسەیەك بوو بە هی حوکوومەتی «کۆمەڵە».

تەنانەت لەسەر ئەم ڕاو تەگبیرەش «صدری قازی» لەلایەن حوکوومەتی کوردستان و [قازی موحەممەد]ەوە نێررا بۆ [سەقز] کە قسە لەگەڵ [همایوونی] فەرماندەی نەیرووی ئێرانا بکاو ئەم باسە ببڕێننەوە. کە چوو، فەرماندە بەم باسە ڕازی نەبوو، «صدر» قاقەزێکی ڕەزامەندی «قوام السلطنە»ی ـ کە لەم ڕووەوە دابووی بە «دوکتۆر جاوید» لە تەورێز وە وێنەی ئەم قاقەزە کەوتبووە لای «صدر» ـ دەری هێناو پیشانی‌دا.

کاغەزەکەش ئەوەبوو کە قەوام نووسیبووی بۆ دوکتۆر جاوید فەرماندەی «ئازربایجان»:

(ئێمە ڕازین بە (١٥) ڕۆژ دوای چۆڵ‌کردنی زەنگان، تیکاب و سەردەشت لە نەیرووی ئەرتەشی پاك بکرێتەوە و هێزی نیزامیان بین بە هێزی دیموکراتی ئازربایجان. ئەحمەد «قوام السلطنە» ٤ی تشرینی دووهەمی ١٩٤٦).

هومایوونی و عەلەوی کە بە ناوی فەرماندەی لەشکری سێ‌وە لەوێدا بوون دانێکیان بەم فەرمان و ڕێکەوتنەدا نەنا و وتیان لەلایەن ئەرتەشەوە ئێمە لەم ڕووەوە هیچمان وەرنەگرتووە. بەبێ ئەوە بگەن بە ئەنجامێك «صدر» گەڕایەوە بۆ «سابڵاخ»!.

❋ ❋ ❋

«قوام» لەگەڵ ڕووسەکان ئەوەبوو ڕێکەوتبوو و بڕیاری هەڵبژاردنی سەرلەنوێ درا، لەم ماوەیەدا ئەو تەکتیکانە کە ئەکرا هەموو بۆ ئەوە بوون کە، تا لەلایەکەوە حوکوومەتی

ئێران تۆزێ ئیشی خۆی قایم ئەکاتەوە، لەلایەکی‌تریشەوە بەڵکوو لەم ماوەیەدا ڕووس لەشکری خۆی لە ئازربایجان بکشێنێتەوە.

وەخت زۆری نەمابوو بۆ دوایی هاتنی ئەو ماوەیە کە قەوام و [سادچیکۆف] دایاننابوو بۆ دوایی هاتنی هەڵبژاردنەکە. ڕووس بە پەلە و بۆ ئیمتیازی نەوتەکە، ئێرانیش بە پەلە بوو بۆ دەرچوونی ڕووس لە خاکەکەیا!. لە ئەنجاما ڕووسەکان هەر ئەیانکردە سەر قەوام بۆ بڕاندنەوەی ئیش. قەوامیش ئاخر وەڵامی ئەوەبوو کە بە پێ پەیمانەکەمان ئەبێ ئێوە لە وڵات دەرچن ئەو وەختە ئێمە بکەوینە سەر هەڵبژاردن.

لێرەدا ڕووس چاری نەما و هیچ بیانوویەکیش نییە بیگرێ بەدەستەوە بۆ دەرنەچوون، لەبەر ئەمە وردە وردە لە ئەیلوولی (١٩٤٦)دا دەستی کرد بە گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆی و ئازربایجانی چۆڵ کرد لەسەر ئەو نیازە کە قەوام پاڕلەمانێکی تازە لە ئێرانا دروست بکا و «پاڕلەمان» ئیمتیازی نەوت بدا بە ڕووس!.

کە ڕووسەکان دەرچوون قەوام مەیدانی بۆ چۆڵ بوو بۆ ئەو هەڵبژاردنە، کە خۆی ئەیەوێ. وردە وردە لە شوێنەکانی‌تری ئێرانا دەستی پێ کرد و پاشان هاتەسەر- ئازربایجان و کوردستانی ئازربایجان - بە پێ هەندێ لە بەندەکانی پێشوو - کە لەسەری ڕێکەوتبوون - وڵاتەکانی ئازربایجان و کوردستان خۆیان بە هەموو سەربەستیەکەوە ئەتوانن نائب بۆ خۆیان دابنێن.

لەم کاتەدا کوتوپڕ «پیشەوەری» برووسکەیەکی لە قەوامەوە وەرگرت: «کە هێزێکی عەسکەری ئەبێ‌بێت بۆ ئازربایجان بۆ ئەوە چاوێری هەڵبژاردن بکا، ئەمەش بۆ ئەوە نەوەك گەمە و گاڵتەی تێدا بکرێ!.».

ئەم خەبەرە کارێکی پێچەوانە و سەیری کردە سەر دڵی «پیشەوەری»!. بە ناچاری پیشەوەرییش وەڵامی بۆ ناردەوە کە:

«بە پێ هەندێ لە بەندەکانی پەیمانی پێشوو - کە لە سەری ڕێکەوتبووین - لەشکری «ئازربایجان» لەشکری ئێرانە. کە ئەم پەیمانە هەیە و لەشکری‌ئازربایجانیش ئێستە هەیە، کەواتە پێویست بە هاتنی لەشکری «ئێران» ناکا. لەشکری [ئازربایجان] خۆی ئەتوانێ بە بێ‌لاینگری چاوێری هەڵبژاردنی خۆی بکا.»

قەوام لەو وەختەدا کە ئەو برووسکەیەدابوو بە «پیشەوەری» عەینی ئەوەشی لە لایەن کوردستانەوە دابوو بە قازی موحەممەد. قازی ـ ش وەکوو وەڵامەکەی پیشەوەری وەڵامێکی وای دایەوە بە قەوام کە وڵاتی کوردەواری خۆی لەشکری خۆی هەیە و پێویست بە هاتنی لەشکری حوکوومەتی «ئێران» ناکا بۆ ئەم هەڵبژاردنە.

دیارە کە قەوام ئەو برووسکانەی‌دا بە پیشەوەری و قازی، مەعنای وایە پەیمانی تاران ـ تەورێز حوکمی نەماوە و بە هیچ دائەنرێ!. لەبەر ئەمە دوو دەستەی ئازەری و کوردی لە [١٦ای تشرینی یەکەمی ١٩٤٦]دا لە «تەورێز» کۆبوونەوە و ئەم بڕیارانەی خوارەوەیان دا:ـ

(١ـ دروستکردنی لەشکرێکی ئازەری ـ کوردی کە شوێنی لە «تەورێز» بێت.

٢ـ ناردنی لەشکری نیزامی ئازربایجان بۆ قۆڵی سەقز لە کوردستان. وە ناردنی لەشکری غەیری نیزامی کوردستان بۆ «ئازربایجان» ئەگەر پێویست بوو.

٣ـ دانانی «جەنەراڵ عەزیمی» ئازربایجانی بە سەرۆکی گشتیی لە قۆڵەکانی «سەقز» و «سەردەشت» لە کوردستان وە لە «هولاسۆ ـ هەوشار» لە ئازربایجان.

٤ـ دانانی «مەلا موستەفای بەرزانی» بە سەرۆکی گشتیی کوردی و ئازەری لە ناوچەی «سەقز».

٥ـ ناوچەی «هەوشار» لە ئازربایجان لە ژێر چاوێری «موحەممەد حسەین سەیفی قازی» دابێت.

٦ـ «قازی موحەممەد» سەرۆکی گشتیی هەرە بەرز بێت لەسەر هێزەکانی ئازربایجان ـ کوردستان، بەڵام لە ژێر ڕەنگ ڕشتنی جەنەراڵ عەزیمیدا.

٧ـ «پیشەوەری» سەرۆکی هەرە بەرزبێت بۆ هێزە شەڕکەرەکانی کوردی ـ ئازەری «لە ئازربایجان».

٨ـ هێزی کوردی هەر یارمەتیەکی‌تری ویست «ئازربایجان» دەستی بۆ درێژ بکات.)

بەم جۆرە ئەم پەیمانەش بەستراو ئەمجا ئیتر قۆڵیان کرد بە قۆڵی یەکا بۆ بەگژاچوونی حوکوومەتی ئێران بە هەرجۆرەی کە پێیان بکرێ. «فعلا» بەندەکان جێ‌بەجێ کران و کەوتنە کۆڕی شەڕەوە. لەولاوە هێزی ئازربایجان لە قۆڵی «زەنگان» و «میانە» ـ کە ئەم دوو شوێنە نرخێکی زۆری هەبوو بەرانبەر بە وڵاتی ئازربایجان ـ وە لەملاشەوە هێزی کوردی لە قۆڵی ـ سەقز و بۆکان و بانە و سەردەشت ـ کەوتنە ئیش‌کردنەوە.

لەبەر ئەوە کە گرتنی «زەنگان» بۆ ئێرانییەکان بەرانبەر بە ئازربایجان کاریگەرییەکی زۆری هەبوو، هێزی ئێرانی هەموو کۆششێکی خۆی لەو قۆڵەوە خستبووە سەر گرتنی ئەوێ.

لە [٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦]دا حوکوومەتی ئێران بە پشتیوانی فڕۆکەکانی ئەمەریکی لەهەر دوو قۆڵەکەوە دەستی کرد بە شاڵاو هێنان. لە ڕۆژی (٩)دا کوتوپڕ هێزی ئێران لە «سەقز» کشایەوە!.

کشانەوەی ئەم هێزە دوو مەبەستی تێدا هەبوو؛ یەکەم ئەوەبوو کە ئەیەویست هەر بە هێزی هەوایی و فڕۆکەی ئێران و ئەمەریکی بکەوێتە ناوەوە، چونکە ئەیزانی بەهێزی سەرزەوی باشاری کوردەکان ناکاو پاشەڵی پیس ئەبێتەوە!. دووهەم ئەیەویست ئەو هێزی قۆڵی «سەقز»ە زۆر بەخێرایی بگەیەنێتە خەتی «تیکانتەپە» بۆ ئەوە هێزی ئەولا بەهێزتر بکا و بکەوێتە بەینی هێزی کوردی و ئازەری، ئەمەش بۆ ئەوە کە بەیەك نەگەن. دیسان هەر لەو قۆڵی [هۆلاسۆ]ەوە [جەبهەی ئێرانی] هەستی بە سستییەك کردبوو لەخۆیا، ئەگەر ئەم فیکرەی نەکردایە حاڵی شڕئەبوو لەوێدا.

هەرچەندە حوکوومەتی «ئێران» لە [٢٤ی تشرینی دووهەمی ١٩٤٦]دا «زەنگان»ی لە دەست ئازربایجان هەڵپڕووکاندبوو، بەڵام ترسی هەرەزۆری ئەو لە قۆڵی «تیکانتەپە» و «هەوشار»ەوەبوو، کە ئەگەر لەوێدا هێزی کوردی و ئازەری بگەنەوە بەیەك تازە ئەو ناتوانێ باشاریان بکا. لەبەر ئەم ترسە ئەو پیلانە عەسکەرییەی ڕێك خست!.

❋ ❋ ❋

وا دیار بوو قسەکردنەکانی «قوام» و «سادچیکۆف» لە مۆسکۆ جێگەی خۆی بەتەواوی گرتبوو، بۆیە ڕووسەکان لەشکری خۆیان لە «ئازربایجان» کشاندبووەوە، بێجگە لەوە کە لەشکریشیان کشاندبووەوە تەمێ [پیشەوەری]شیان کردبوو، کە بە جۆرێکی هێمنی لەگەڵ ئێرانا بزوێتەوە!. وا دیاربوو سەرەتا [پیشەوەری] گوێ بەو ئامۆژگارییە نەدابوو، بۆیە هاتبوو لەگەڵ حوکوومەتی «قازی»دا ئەو پەیمانی (١٦)ی تشرینی یەکەمی بەستبوو. کە ڕووسەکان زانیان [پیشەوەری] بە دەسیاوی قازی وا هەر چووەتە کۆڕی شەڕەوە و بەربەرەکانێ حوکوومەتی ئێران ئەکا، بۆ جاری دووهەم

سەرلەنوێ بە جۆرێکی توند و تیژتر وەڵامیان بۆ ناردەوە کە نابێ بەربەرەکانێ ئێران بکاو ئەبێ دەست لەشەڕ هەڵگرێ!.

هەر لەبەر ئەمەبوو کە بە جۆرێکی کوتوپڕی لەشەوی [١١ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦] دا لەناکاو ـ بەلاغێکی لیژنەی مەرکەزی حیزبی دیموکراتی ئازربایجان ـ دەرچوو کە ئەبێ شەڕکردن لەگەڵ حوکوومەتی «ئێران»دا بووەستێنرێ و ئیتر جەنگیان لەگەڵ نەکرێ!.

کە ئەم بەلاغە بیسترا، هێزی کوردی دەمی خۆی گەیاند بەقیادەی گشتیی بۆ ئەوە بزانێ چەباسە؟!. ـ قیادەی موشتەرەکە ـ وەڵامی دایەوە: «کە ئەم شەڕی ئێمە و حوکوومەتی ئێرانە ئەبێتە هۆی شەڕێکیتری گشتی عالەمی، لەبەر ئەوە پێویستە کە ئیتر جەنگ نەکرێ!.».

دیارە وەرگرتنی ئەم خەبەرە دەماری حوکوومەتی قازی و کوردەکانی خاو کردەوە و لەگەڵ ئەوەشا کەوتنە دەریای سەرسڕمانەوە!. لەکوێ پەیمانەکەی ئەمان و ئازربایجان؟. وەلەکوێ ئەم خەبەرە!!..

لەبەر ئەمە «قازی موحەممەد» لەشەوی (١٢)ی کانوونی یەکەمدا لەماڵی خۆیان لە «سابڵاخ» کۆبوونەوەیەکی زۆر گەورەی کرد و هەموو وزەرای حوکوومەت و سەرۆکی عەشایرەکانی کۆ کردەوە و کەوتنە قسەکردن لەم باسەوە. لەئاخرا باوەڕیان هاتە سەر ئەوە: «لەبەر ئەوە کە پەیمان لەبەینی ئەمان و ئازربایجاندا هەیە و ئێستەش ئازربایجان ئەم بەلاغەی بڵاو کردۆتەوە، ئەمان ناچارن بە گوێ بکەن و وەکوو ئەوان ئیتر شەڕ بوەستێنن، بۆچی؟. بۆ ئەوە ئەم شەڕکردنەی ئەمان نەبێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕێکیتری سێهەم لە عالەما!.».

لە پاش ئەم کۆبوونەوە و بڕیارە، فەرمان دەرکرا کە هەچ هێزێکی کوردی لە دەوروبەری «سەقز» و «سەردەشت» و ئەو ناوەدا هەیە هەموو بکشێنەوە و ڕێگە بۆ هێزی حوکوومەتی ئێران چۆڵ کەن بۆ ئەوە بچنە ئەو شوێنانەوە.

ئەم کردەوەیە بە تەبیعەت ئەوەی پیشاندا کە هێزی کوردی تەرکی هەموو شتێکی کردووە و مەیدانی بە هەموو مەعنایەك بۆ حوکوومەتی ئێران بەرەڵا کرد کەچی ئەکا بیکا!. قازی و دەوروبەرەکەی قازی وەکوو ئەم فیکرە چووبووە دڵیانەوە ئەوەش چووبووە مێشکیانەوە کە گۆڕانی ئەم پیلانە لە باری پێشووەوە بۆ ئەم بارە بەدەسیاوی ڕووسەکان

بووه، بێگومان کە ئەمان لەم پلەیەدا ئەگەر هاتو بە گوێی ئەوانیان کرد ئەوانیش چاویان لەمان هەر ئەبێ.

هەر لەو شەوەدا -کە بەلاغەکەی لێژنەی مەرکەزی -دەرچوو بۆ وەستانی شەڕ، لەبەیانیا، واتە لە ڕۆژی [١١ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦]ەوە هێزی حوکوومەتی ئێران چووە ناو شاری «تەورێز»ەوە و تەورێزی گرت، لەم لاشەوە ئەوەبوو هێزی کوردی لە هەموو وڵاتەکان کشانەوەو حوکوومەتی ئێران بەرەبەرە ئەو ناوچانەی داگیر کردەوە!.

* * *

«بۆکان» هەرچەندە خۆی شارێکی بچووکە و ئەو سەردەمە (٦) هەزار کەسێك دانیشتووی هەبوو. کەوتۆتە بەینی [سەقز] و [سابڵاخ]ەوە. (٣٠٠) کیلومەتر لە [سەقز] و (١٠٦) کیلومەتر لە [سابڵاخ]ەوە دووره. بەڵام لەچاو ئەو ناوچە چەنگیانەی کوردەواری ئەو ڕۆژەوە ئەهەمیەتێکی زلی هەبوو. هێزی حوکوومەتی ئێران لە [١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦]دا چووە ناویەوە و گرتیەوە. بە چوونە ناوی [ئیعلانی عورفی] تێدا دامەزراند. ئەمجا لەشکری ئێران لەوێوە ڕووبەڕووی «سابڵاخ» بووەوە.

سەرەتا فیکرە وابوو کە «عەبدوڵڵای ئێلخانیزادە» و «مام عەزیزی قەرەنیاغای مامش» -کە ئەمانە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ حوکوومەتی ئێران بوون -حوکوومەت بیانهێنێ جل وبەرگی سەربازی بکا بە بەر پیاوەکانیانا و سەرەتا ئەوانە بچنە ناوشاری سابڵاخەوە!. ئەمەش بۆ ئەوە کە لە چوونی ئەمانە بۆ ناوشار ئەگەر هاتو ئەهلی شارەکە دەستیان کردەوە -چونکە ئەمانە ناپیاوەتی ئەکەن لە ناوشارا -یەکەم بۆ ئەوە با کوژراو هەر لە بەینی کوردەکان خۆیانابێت!. واتە دەستەی ئێلخانیزادەیە هەر کوردە و دەستەی سابڵاخیشە هەر کوردە.. دووهەم بۆ ئەوە پاشان حوکوومەتی ئێران فوو بکا، بەشەیپووردا بڵێ لە پاش ئەوە کە شەڕ وەستێنرابوو حوکوومەت ئەچووە «سابڵاخ»ەوە، کوردەکان هاتن سەربازە ئێرانییەکانیان کوشت!!.

لە بەر ئەمانە «قازی موحەممەد» لەگەڵ «جەنەڕاڵ هومایوونی» سەرۆکی عەسکەری ئەو ناوە قسەی کردو هومایونی پەشیمان کردەوە لەو باوەڕە کە لە پێشا کوردەکان بە جلی سەربازییەوە بنێرێنە ناوشار.

ئەمجا لە ڕۆژی [١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦]دا نەیرووی قۆڵی «بۆکان» لەولاوە و هی «میاندوواو» لەملاوە پێکەوە گەیشتن و چوونە ناوشاری سابڵاخەوە و «سابڵاخ» گیرا. بە پێچەوانەی هەموو دوژمنایەتیەك [قازی موحەممەد] و خەڵکی شار پێشوازییان لە لەشکری تازە سەرکەوتوو کرد.

لەشکری سەرکەوتوو ـ لەشکری ئێران ـ کە چوونە سابڵاخەوە وەنەبێ بە پیاوەتییەکی پیاوانە چووبێتنە ناوشارەوە، بە چوونەکەیان دەستیان دا بە توند و تیژی و خەڵك گرتنەوە، مەحکەمەی عورفییان دانا، قازی موحەممەدیان گرت، کەوتنە ناوەوە لەوانەی کە سەر بە قازی بوون هەموویان گرتن. لەو سەردەمانەدا [سەدری قازی] ـ کە وەختی خۆی نائب بوو لە پارلەمانی ئێران ـ لە «تاران» بوو، بۆ ئەوە لەم ڕووەوە لەگەڵ حوکوومەتی «تاران»دا ئەوەی پێی بکرێ قسە بکا. لەویش ئەو گیرا و هێنرایەوە بۆ «سابڵاخ».

«قازی» و سەر بەقازی هەموو گیران و خرانە بەندیخانەوە، بەڵام لەبەر ئەوە لەو ڕۆژانەدا [مەلا موستەفای بەرزانی] لەڕێ هاتوچووی تارانا بوو ئیشی ئەو هێشتا لەگەڵ حوکوومەتی تارانا دوایی نەهاتبوو، ئەوەندە بە توندی لەگەڵ ئەمانە ئەبزووتنەوە. کە ئیشی مەلا، لەگەڵ ئێرانا یەك لایی بووە ئەمجا لەگەڵ دەستەی قازیدا بەتەواوی تێ هەڵچوون!.

بەڵێ ئیشی مەلا، یەك لایی بووبوووەوە، بەڵام لەملاوە عەشایرە کوردەکانی تری سنوورەکانی ئێران، عێراق و تورکیا هەر لەمەیدانا بوون، لەبەر ئەوانە گۆیا وا ئەدرایە بەرچاو کە لەگەڵ قازی و دەستەی قازیدا زۆر بە هێمنی و لەسەرخۆیی لەگەڵیان ئەبزووتنەوە، بەتایبەتی مەحکەمە ئەوەندە میهرەبانە لەگەڵیان مەگەر هەر باوك ئەوەندە میهرەبان بێ!. هیچ پرسیار و شتیان لێ ناکەن، لە بەندیخانەکەدا هەر وەکوو لە ماڵی خۆیانا بن وانە!. وەکوو گوڵ بەخێو ئەکرێن!..

لەم ماوەیەدا حوکوومەتی «ئێران» بە پڕوپاگاندە کەوتە ناو سەرۆك عەشایەرەکانی ئەو ناوە بۆ ئەوە دڵیان لە عاستی «قازی» هەڵبگێڕێتەوە!. بێجگە لەمەش بانگی کردن بۆ [تاران] و لەڕۆژی [٣٠ی کانوونی دووهەمی ١٩٤٧]دا گۆیا لە بانگێشتنەکەدا «شاهەنشا»شیان زیارەت کرد و شاهەنشا خەڵاتی یەکە یەکەی کردن و هەموو بوون بە «شاه دۆست»، ئیتر کوردی چی و قازی چی و سابڵاخی چی!!..

کە حوکومەت بەم جۆرە ڕەوشتانە وردە وردە هەندێ لە کوردەکانی لە [قازی موحەممەد] هەڵگێڕایەوە ئەمجا هێنای خستیە ژێر موحاکەمەوە، موحاکەمەش بەناو موحاکەمە بوو، بەڵکوو بۆ چاوبەستن بوو ئەگینە ئەبوایە «قازی» هەر بکوژرایە.

لە ئاخری موحاکەمەیەکی گۆیا دوور و درێژا هیچیان لەسەر قازی نەدۆزیەوە تەنها دوو شت نەبێ؛ یەکەم ئاڵای حوکومەتی ئێرانی گۆڕیوە، سوورەکەی خستۆتەسەرەوە و سەوزەکەی هێناوەتە خوارەوە و لەباتی «شێر و ڕۆژ» گوڵەگەنمی لێداوە و کردوویە بەهی «جمهووریەتی کوردستان»!.

دووهەم لەو تەمسیلانەدا کە لە دەوری حوکومەتی ئەوا ئەکران هەموو جار تابلۆیەکیان ئەهێنا ئەمەیان لەسەر ئەنووسی: «بمرێ ئەو کەسەی کە نایەڵێ ئازادی کورد سەر بگرێ!.». حوکومەتی ئێران ئەمەی بەتاووت ئەزانی بۆ خۆی، وای ئەوت کە ئەمە گۆیا لەگەڵ ئەویانە!.

گوناحی «سەدری قازی»ش ئەوەبوو کە ئیشی لەگەڵ «قازی موحەممەد»دا کردووە، هەرچەند وتی وەختی خۆی من نائیب بووم لە [تاران] و لە هەموو وەختێکما هەر خەریکی ئەوەبووم، کە ئیش و کاری بەینی حوکومەتی ئێران و حوکومەتی «قازی» بکەوێتە بارێکی هێمنیدا، ئەم قسانە بە گوێی مەحکەمەدا ئاشنا نەبوون!.

گوناحی «سەیفی قازی» ئەوەبوو کە جلی جەنەڕالی لەبەر کردووە!. ئەمیش هەر چەند وتی «قوام السلطنە» منی بە ناوی فەرمانداری سابڵاخەوە داناوە، ئەویش کەڵکێکی لەمە وەرنەگرت.

لە [٢٠ی کانوونی دووهەمی ١٩٤٧]دا حوکمی خنکاندنی هەرسێکیان لە مەحکەمە دەرچوو!.

لەو ڕۆژانەدا هێشتا کاروباری بەرزانییەکان بەتەواوی نەبڕابووەوە، عەشایەرەکانیتر هێشتا بەتەواوی نەخرابوونە داوەوە، حوکومەتی ئێران لەبەر ئەمانە نەیئەویست بەتەواوی دەستی بداتێ، بەڵکوو بۆی نەئەکرا چی خۆی ئەیەوێ ئەوە بکا!. ئەوەی کرد بە بیانوو گۆیا نەوەك ئەو مەحکەمەیە جەوریان نواندبێت، پێویستە هەندێکیتر لە تارانەوە بێن بۆ ئەوە چاوبخشێننەوە بە مەحکەمەکەدا. ئەمەش لەڕاستیدا وانەبوو، بەڵکوو بۆ ئەوەبوو کە تۆزێ وەخت درێژترکەنەوە، بەڵکوو لەم ماوەیەدا ئیشیان بۆ

یەك لایـی ببێتـەوە، ئەگینـا ئـەوان ئیش هەرجۆر ببوایە، واتە بەهـەق وە یا بە ناهەق ئەبوا ئەوانەیان هەر بخنکاندایە!.

ئەمجا لەسەر ئەو نیازە سەرهەنگ «نجات‌اللّهی ضرغامی» لە تارانەوە هات و چاوی گێڕا بە کاروباری مەحکەمەکەدا، سەیری کرد تەواوە و هیچ کەم و کوڕیەکی تێدا نییە، ماوەی ئـەوە هاتـووە کە بخنکێنرێن!. ئەویش فەرمانی بە خنکاندنیان دەرکرد و لە [٣١ی مارتـی ١٩٤٧]دا «قـازی موحەممـەد» و «سـەدری قـازی» و «سـەیفی قـازی» لـە ڕێگـەی ئازادی کورددا لە ناو شاری [سابڵاخ ]خنکێنران!.

بەڵـی سـەعات سـێ پاش نیوەشـەوی، [٣١ی مارتـی ١٩٤٧] سـەعاتێکی ترسـێنەربوو لەناوشـاری سـابڵاخا. هـەر لـەو سـەعاتەدابوو قەنارەکانیان هەڵواسیبوو، سـەربانی هەموو کۆشـك و شـوێنە بەرزەکان پڕ کرابوون لە مەترەلۆز و چەکی ئاگریـن، دەبابە و تۆپ ئەو ناوەی هەمـوو داگیـر کردبـوو. ئەمانـە هەموو بۆ ئەوە کە [قـازی موحەممەد] داوای حەقی خۆی کردبوو، سەرباری ئەوە کە حەقەکەشیان نەدایە ئەوا خەریکن ئێستە ملی ئەکەن بە پەتەوە!. پەتی جەور، پەتی زوڵم، پەتی ناعەداڵەتی و خوانەناسی.

«قازی موحەممـەد» چە لە وەختی خنکاندنەکەیا و چە لە وەختی موحاکەمەکردنەکەیا هەمـوو جار ئـەوەی ئەوت: «کـە خوێنی من بۆ ئێوە بێت بەڵام سـەدری برام بێ‌گوناحە و لێی‌خۆش بن، من بۆ خوێنی خۆم ناپاڕێمەوە بەڵام بۆ سـەدری برام ئەپاڕێمەوە، ئەو، بێ‌گوناحـە لێی‌خـۆش بـن.» دادگای مەحکەمـە و حوکوومەتـی ئێران لـەم قسـانە وەکوو گوێزیان بۆ بژمێرن وابووا!.

[قـازی موحەممـەد] لـە پێش ئەوەدا ببرێتە بەر سێدارەکە دەستنوێژێکی شـورد، کە بردیانە بەر [قەنارە]کە بە هەموو دڵ‌فراوانییەکەوە دوو ڕکات نوێژی کرد و گەلێك لەخوا پاڕایەوە، مەعنەویاتێکی بەهێزی هەبوو، چووە بەر سێدارەکەو وتی:

ئێوە ئێسـتە قـازی موحەممەدێـك ئەکـوژن و ئیعدامـی ئەکەن، بەڵام شـەعبی کوردی هـەر یەکـە قـازی موحەممەدێکن، بڕوام وایـە ئەو قازی موحەممەدانـە زۆر دڵ‌ڕەق ئەبن بەرانبـەر بـەو کەسـانە کـە بـوون بە جەلادی شـەعبی کـوردی!.. ئەمـەی وت و پەتەکەی کردە ملی خۆیـەوە.

«موحەممەد حسەین خانی سەیفی قازی» لەو کاتەدا کە بردیانە بەر قەنارەکە وتی: [شانازی ئەکەم بەوە کە لە ڕێگەی نیشتمانا ڕۆیشتم، بژی حوکوومەتی کوردستان]!. پاش ئەمە ئەویش پەتەکەی خستە ملی خۆیەوە.

[سەیفی قازی] پیاوێکی کەڵەگەت و بەدیمەن بوو، کە سەرخرا بۆ سێدارەکە، پەتی سێدارەکە پچڕا، ئەبوایە ئیتر ئیعدام نەکرایە لەگەڵ ئەوەش هەر بەدەست خنکاندیان!..

پاش ئەمان «سەدری قازی»ش هێنرا و ئەویش بە دەستووری ئەوان ملی کرا بە پەتەوە. سەدر تا ئەو وەختە ملی کرا بە پەتەکەوە هەر لەو بڕوایەدا نەبوو کە ئەیکوژن. چونکە گوناحی ئەو هەر نائیبێك بوو لە [تاران] و ڕاسپێرێك بوو لەم ئاخرەدا لە بەینی حوکوومەتی «تاران» و حوکوومەتی [سابلاخ]دا و هیچی‌تر.

لە پاش خنکاندنی ئەمانە لە ڕۆژی [٧ی نیسانی ١٩٤٧]دا چەند «قەنارە»یەکی‌تریان لە دەشتی ناوشاری سابلاخا دامەزراند و ئەمانەی خوارەوەشیان خنکاندن:

١ـ ڕئیس حمید مازووجی. ٢ـ ڕئیس ڕەسوول نەغەدێی. ٣ـ ملازم «عبداللّه» ڕەوشەن فیکر. ٤ـ ملازم موحەممەد نازمی.

گوناحی ئەمانەش لەبەر چاوی ئێرانییەکانەوە ئەوەبوو کە لە قۆڵی سەردەشتدا پێویستی ویژدانی خۆیانی بەرانبەر بە جمهوورییەکی کوردستان بەجێ‌هێناوە.

ئەمانە قوربانییەکانی «سابلاخ». لە ناوشاری بۆکانیش ئەمانەی خوارەوە ئیعدام کران:

(١) عەقید عەلی‌بەگی شێرزادی. (٢) عەقید موحەممەد ئەمینی کەسنەزانی. (٣) ئەحمەد خانی فارۆقی، خۆی و دووبرای کە ئەمانە لە سەرۆکی عەشرەتی «فیض‌اللّه»بەگی بوون. (٤) ئەحمەدخانی کەڵتەگە. (٥) مەحموودخانی تورکمان کەندی لەسەرۆکی عەشرەتی «فیض‌اللّه»بەگی. (٦) موحەممەدخانی باباخان بەگ لەسەرۆکی عەشرەتی «فیض‌اللّه»بەگی. (٧) موحەممەدبەگی شێرزادی لەسەرۆکی عەشرەتی «فیض‌اللّه»بەگی. (٨) ئاغا سدیقی یازی‌بلاخی لە دانیشتوانی سەقز. (٩) عەلی ئاغای تەمووتە لە سەرۆکەکانی گەورك. (١٠) ڕەسوول ئاغای میرەدێ لە سەرۆکەکانی عەشرەتی گەورك.

ئەوانەی کەوا بە فەرمانی عەسکەری ئیعدام کران تا (٥٠) کەسێك ئەبوون، ئەمانەش ئەوانەبوون کە داوای حەقی خوراوی خۆیانیان کردبوو، تۆڵەکەشیان ئەوەبوو کە پێیان درایەوە!.

لە دەوری حوکوومەتی قازیدا لە [سابڵاخ] ڕۆژنامەی کوردستان دەرئەچوو کە زمانی حاڵی حوکوومەتەکەبوو، هەموو کارەسات و قەوماوی حوکوومەتی تێدا ئەنووسرا. هەروەها گۆڤاری [نیشتمان] و بڵاو کراوەیتریش دەرئەچوو.

* * *

بەم جۆرە پەردە لەسەر حوکوومەتی کوردستان و ئازربایجان‌دا درایەوە!. مایەوە سەر ئەوە ئایا کارەساتی ئیمتیازی نەوتەکە لەولاوە بە چی گەیشت؟.

ئەوە بوو «قەوام» وتی پێویستە بە پاڕلەمانێکی تازە بۆ ئەوە بڕیار لەسەر ئیمزاکەی من بدا بۆ دانی نەوتەکە. ئەو بەندانەی لەگەڵ ڕووسیادا بەست و ئەم دەورانەی گێڕا، ڕووس نەیرووی خۆی کشاندەوە، ئەمیش بەناوی ئینتیخاباتی ئازادەوە وڵاتەکانی داگیر کردەوە، چونکە ڕووس چاوەڕێ ئیمتیازی نەوت ئەکا نابێ دوا بخرێ!.

لە پاش ئەوە کە ئەم، وڵاتەکانی داگیر کردەوە لەڕاستیدا پاڕلەمانی تازە دروستکرا و باسی دانی ئیمتیازی نەوت بەرووسیا کەوتە ئەو پاڕلەمانەوە. پاڕلەمان پێی دا بەزەویا وتی من بڕیار لەسەر، دانی ئەم ئیمتیازە نادەم!. دیارە ئەم کاسەیە بێ‌ژێرکاسە نەبووا!. واتە بێ‌گومان ئەبێ لە ژێرەوە لەم ڕووەوە «قەوام» قسەی لەگەڵ ئەم پاڕلەمانەدا کردبێ!.

قەوام لە ڕووالەتا دەستی کرد بە هاوارکردن لەگەڵ پاڕلەمانا وتی: «وەختی خۆی من ئیمزام داوە بە ڕووسیا، ئێستە چۆن ئێوە بڕیاری لەسەر نادەن؟!.» پاڕلەمان وتی ئێمە دان بەو ئیمزایەدا نانێین!. قەوام لەسەر ئەمە گۆیا لە پاڕلەمان تۆرا و پاشان وەزارەتەکەی خۆی ـ بەو ناوەوە کە پاڕلەمانی تازە باوەڕی نادەنێ ـ لە حوکم کشاندەوە و لە ماڵی خۆی دانیشت!. ڕووسیاش کەوتە قسەکردن وتی کوا ئیمتیازەکە؟ قەوام وەڵامی بۆ ناردەوە، وتی: «من بڵێم چی؟ خۆتان ئەزانن وەختی خۆی من ئیمزام دانێ و وتم ئەتاندەمێ، ئەوا ئێستە پاڕلەمان ڕازی نابێ، وەنەبێ سووچێکی منی تێدا هەبێ!.»

تازە ڕووسیش نەیرووی خۆی لە وڵات بردۆتە دەرەوە هیچ بیانوویەکی‌تر بە دەستیەوە نییە بۆ هێنانەوەی نەیروو!. بە قسەی کوردی ئەڵێ: «بۆریش چوو سمێڵیشی نایە سەری!.» نە ئیمتیازەکەی دەستکەوت وە نە حوکوومەتەکانی کوردستان و ئازربایجانیشی بۆ مایەوە!..

لەلاپەڕەی سیاسی «قوام السلطنه»ی سەرۆك وەزارەتی ئێرانا ئەم کردەوەیە بە گەورەتر شانازییەکی

ژیانی دائەنرێ و بەڵکوو شایانی گەلێ ستایشە کە چۆن توانی ئەم پەردانە هەڵبگێڕێتەوە؟!..

❋ ❋ ❋

سەرەنجامی ئەم شۆڕشانەی کورد لەم ڕۆژانەی دواییدا وایان بەسەر هات کە چاومان پێ‌کەوت. ئەگەر ئاورێکی‌تر لە بارێکی‌ترا بدەینەوە، ئەم هەموو چەوساندنەوەو دەربەدەریانە کە لەم ئاخرەدا هاتن بە سەر کورددا دوور نییە ئۆباڵی هەمووی بخرێنە ئەستۆی ئینگلیز و پاشان ئەمەریکا!.

ئینگلیز جەورێکی زۆری کرد لە کورد؛ لە پاش شەڕی (١٩١٤-١٩١٨) لە هەموو گۆشەیەکی کوردەوارییەوە، لە هەموو ئەو وڵاتانەوە کە کوردیان تێکڵاو بوو، ئینگلیز بە هەموو جۆر دەستی تێ‌خستن و بە هەموو چەشنە قسەیەك هاتە مەیدانەوە؛ کە باری تێك ئەچوو لەگەڵ حوکوومەتەکانی کورد تێکڵاوبوودا بای ئەدایەوە لای کورد و قسەی بۆ هەڵ‌ئەڕشتن، کە باری چاك ئەبووەوە قەوانێکی‌تری ئەخستە سەرا.. کە ئەکەوتە ناو کوردەکە خۆیشیەوە بە سیاسەتە وشکە ستەمکارانەکەی هەر تاقە کوردێکی ئەخستە سەر نەزمێك!..

لەبەر ئەمانە ئەتوانم بڵێم ئینگلیز زۆر زاڵم بوو، زۆر بێ‌بەزەیی بوو، زۆر بێ‌سیاسەت بوو، پەنجا ساڵ لەمەوپێشتر بە چە جۆرە سیاسەتێك لەگەڵ ئەو عالەمەدا ئەبزووتەوە ئێستەش بە عەینی سیاسەت ئەهاتە ناوەوە، دنیا گۆڕا، سیاسەتی ئەو نەگۆڕا!. لە درۆ بەولاوە هیچ کردەوەیەکی‌تری نەنواند لەگەڵ کورددا!.

«باشچاوش»ە بە پایە گەیشتووەکانی لە عێراقا بە هۆی ئەوەوە، ئەیانوت لە «ئینگلیز» چاکتر نییە بۆ کورد چونکە سەربەستی داوەتێ و ئەتوانێ بە ئاشکرا بڵێ من کوردم!..

ڕاستە! هەرکە بە پێی نەفسیەتی خۆی قسە ئەکا. ئینگلیز بۆ ئەوان باش بوو چونکە پایە درۆزنەیەکی پێ‌دابوون، بەڵام بۆ کورد ئەگەر باشی ئەوە بێ کە لەماوەی پەنجا ساڵا کورد هەر ئەوەندەی پێ ببڕێ بڵێ «من کوردم» دەخوا ئەو باشییە ببڕێ!. لەماوەی ئەو پەنجا ساڵەدا پەنجا قەوم لە چاڵی نزمییەوە گەیشتنە چڵەپۆپەی بەرزی و سەربەستی، کەچی سەربەستی کورد ئەوە بوو کە بتوانێ بڵێ من کوردم!. دیسان ئەڵێم خوا ئەو چاکییە ببڕێ!..

بەڵێ ئەمە ڕاستە کە دنیای ئیمڕۆژ و دنیای پێشینیش لەسەر قازانجی شەخسی براوەتەوە و ئەبڕێتەوە، دوور نییە قازانجی ئینگلیز بە پێی ئەو ڕۆژانەی ڕابردوو و

لەوەدا نەبووبێ کە کورد ببێ بە شتێك، لەم ڕووەوە با لۆمە نەکرێ، بەڵام لۆمەکردن و جەورەکەی لەوەدابوو، کە کوردی ئەکرد بە قۆچی قوربانی بۆ قازانجی خۆی!. وەکوو بڵێیت لە «ئینجیل»دا بۆی نووسرابوو کە ئەبێ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و خوارووددا بۆ پێشکەوتنی ئیشی ئەو ئەبێ قەومی کورد بکا بە گاوگەردوون!!..

ئەگەر ئەمە لە ئینجیلدا نووسرابێ، بێگومان ئەوەش هەر نووسراوە کە ئەبوایە ئینگلیز بۆ ئەوە تووشی ئەم ڕۆژەی ئێستە نەبێ سیاسەتی پەنجا ساڵەی تێك بدایە و بیزانیایە کە ڕۆژان ڕۆژی لە دوایە و ڕەورەوەی دنیا لەگەڕانایە و ڕووەو پێشەوە ئەڕوا!.

ئەمە ئینگلیز ئەمجا ئەمەریکا:

ئەمەریکا تا شەڕی دووهەمی گەورە بە گۆشەگیری لەوڵاتی خۆیا بۆ خۆی دانیشتبوو و خەریکی بازرگانی بوو. کە شەڕی دووهەم هاتە پێشەوە لە کولانەی خۆی دەرپەڕی و کەوتە کۆڕی سیاسەتی عالەمییەوە، «سینی»یەکی خستە سەردەستی، هەندێ نوقڵ و نەباتی تێخست و گێڕای بە عالەما، هەرکە لەو نوقڵ و نەباتە بخوا ئەبێ کەوایەکی ئاوەڵدامانی ئیستیعماری بۆ لەبەر بکا!.

ورده ورده بەم سینیەوە بینی پێوەنا تا گەیشتە ئێران و تورکیا، تا گەیشتە عێراق و پاشان وڵاتە عەرەبەکان، لە ئاخر چۆڕا گەیشتە وڵاتی کوردستان و لە خاکەکەیا بە هەموو جۆر لە هەموو لایەکەوە کەوتە بنج داکوتان. نوقڵ و نەباتی بڵاو ئەکردەوە بەم وڵاتانەدا، وەکوو کورد ئەڵێ ئەبێ «خێری دایکی شای کردبێ!.» ئەمە پەندێکی کوردییە بۆ ئەم جۆرە شتانە ئەوترێ!.

بەڵام ئەگەر لە ڕاستیا ورد ببینەوە ئەمە خێر نەبوو بەڵکوو خوێنمژین و هێزمژین بوو، لەناوبردنی پیاوانی پیاو و ئازا بوو، بناغە داکوتانی ئیستیعماری بوو بۆ خۆی بۆ ئەوە تا زەمانێکی دێرینە لەم وڵاتانەدا بمێنێتەوە.

کارەساتەکەی «مصدّق» و «زاهدی» لە تاران گەواهی ئەوەمان بۆ ئەدا کە «ئەمەریکا» بۆ لەناوبردنی پیاوان و پێشکەوتنی ئیشی خۆی چە جۆرە پەنجەیەکی ئیش ئەکا و چە جۆرە پیاوانێك بۆ خۆی دروست ئەکا؟!.

وە یا فرۆکەکانی، کە وڵاتی [قازی موحەممەد] و کوردستانی ئازادی قازی موحەممەدی،

پێ بۆردمان ئەکرد، ئەم شاهیدییەمان بۆ ئەدەن کە تا چە ئەندازەیەك ئەمەریکا دڵی بە وڵاتی کوردەواری ئەسووتێ!. وا دیارە عەدالەت پەروەری و دیموکرات پەروەریی ئەمەریکا لە وڵاتی کوردەواری وێنەی «واشنتن» ئەگێڕێتەوە!..

وڵاتی کورد هەر هی کوردە، وڵاتی کوردی ئێستە غەیری وڵاتی کوردی پەنجا ساڵ لەمەوپێشترە، وڵاتێکی دەوڵەمەند، سەرمایەی حوکوومەتە پێشەسازەکانی تێدایە، بووە بە شوێنی تەماشای هەموو کەسێك، ئەگەر [ئەمەریکا] بە جۆرێکی پیاوانە و مەردانە لە وەختی خۆیا لەگەڵی بهاتایەتە مەیدانەوە تووشی ئەم ڕۆژە نەئەبوو، کە هەر ئەبێ بیکوتێ و نەیگاتێ!.. هەموو ئیستیعمارێك ئەبێ دوای بێت، وە هەموو قەومێك ئەبێ ئازادی ببینێت. ئەوانەی کەوا سیاسەتیان غەیری ئەم دوو قسەیەیە، بێگومان ئەبێ چاوەڕوانی پووکاندنەوەی خۆیان بکەن!.

بەڵێ!. بێجگە لە [ئینگلیز] و [ئەمەریکا] میللەتەکانی تریش، ئەوانیش ئەو گاڵتەیە کە ئەوان بە کوردیان کردووە و ئەیکەن ئەمانیش کردوویانە و ئەیکەن! بەڵام لاموایە کوردەکە وەکوو وڵاتەکەی غەیری وڵاتی پەنجا ساڵ لەمەو پێشترە خۆیشی غەیری قەومە -کەی پەنجا ساڵ لەمەو پێشترە، ئەگەر ئەو هەستەی تا ئێستە بۆ پەیدا نەبووبێ، کە خەڵکی لە وەختێکا ئیشیان پێیەتی بە گاڵتەوە قۆڵ ئەکەن بە قۆڵیانا و پاش ئەوە، کە ئیشەکەی خۆیانیان بنج بەست کرد ئەمجا دەستیان لە دەست ئەکەنەوە و ئەکەونەوە چەوساندنەوەیان!. ئەگەر ئەم هەستەیان تا ئێستە بۆ پەیدا نەبووبێ، بێگومان چە ئێستە و چە لەمەودوایش ئەو هەستەیان ئیتر بۆ پەیدا بووە و ئەبێ و بڕوا ناکەم ئیتر هەڵبخەڵەتێن.

جا لەبەر ئەمە ئەوانەی کە تەماع ئەکەنە کورد لاموایە وەنەبێ ئیشێکی باش بکەن، لەگەڵ کورددا بە برایەتی بژین گەلێ باشترە بۆیان کە بێنن هەڵیانبخەڵەتێنن، باشترە بۆیان چونکە ڕەوڕەوەی زەمان بە جۆرێکی تر سنگ ئەنێ بۆ پێشەوە، تەبیعەت لە ئاسۆی ڕزگاری‌دایە نەوەك لە هی دیلی و چەوساندنەوەدا!. دیارە کوردیش ئەمانەی هەموو لەبەر چاوە و بە دەنگی دهۆڵ تا ئەندازەیەك شوێن ئەکەوێ!.

◇◇◇

## شۆڕشی عێراق

ئەم وڵاتەی ئێستە کە بە عێراق ناو ئەبرێ پانایییەکەی (٤٧٤ و ٤٤٤) کیلومەتری چوارگۆشەییە، (٧٥) هەزار کیلومەتری چوارگۆشەیی، واتە (٣٠) ملیۆن دۆنم ـ ی لێ ئەکرێ بە کشتوکاڵ. (١٢) ملیۆنی لەوڵاتەکانی کەرکووك هەولێر، سولەیمانی و مووسڵدا (١٨) ملیۆنیش لە شوێنەکانی جنووبی و ناوەڕاستی عێراقا[1].

لە عێراقا زەویساڵێك ئەکێڵرێ و ساڵێك بە بایەری ئەهێڵرێتەوە. ئەم ژمارەیە کە ئێمە دامان بە دەستەوە لەسەر ئەو ئیعتیبارەیە کە هەر ساڵە ئەوەندە ئەکێڵرێ، ئەگینا ئەوی کە بەکەڵکی چاندن بێ دوو ئەوەندەی ئەو ژمارەیەیە. هەروەها عێراق (١٤) لوا و (٦٣) قەزا و (١٧٢) ناحیەیە. سەرژماری لەبەینی شەش و حەوت ملیۆن‌دایە.

دراوسێ‌کانی: لە ڕۆژئاواوە پاڵی داوە بە ـ سووریە و شەرقی ئەردنەوە ـ لە ڕۆژهەڵاتەوە بە خاکی ئێرانەوە، لە جنووبەوە بە حوکوومەتی «سعوودی» و لە شیمالەوە بە کۆماری تورکیاوە.

عێراق لە پێشا یەکێك بووە لەشەش وڵایەتەکەی عوسمانی. لەشەڕی (١٩١٤-١٩١٨) کە حوکوومەتی عوسمانی بەشکرا و هەر شوێنێك بوو بە هی یەکێك، عێراقیش گۆیا ڕزگاری بوو، ئینگلیز «فەیسەڵ»ی کوڕی شەریفی «مەککە»ی لە وڵاتی «حیجاز» و پاشان «سووریا»وە هێنا و لە (١٩٢١)دا کردی بە پاشای عێراق. لە (١٩٣٣) فەیسەڵ لە سویسەرە مرد و لە (٨)ی ئەیلوولی ئەوساڵەدا «غازی» کوڕی فەیسەڵی لە شوێن

---

١. کە ئینگلیز ڕێی‌کەوتە عێراق نزیکەی ٤١٦ و ٣٣٣ کیلومەتری چوارگۆشەیی زەوی‌وزاری عێراق مڵکی میری بوو، ئینگلیز و نۆکەرەکانی وایان بە باش ئەزانی کە زۆرتر لەم زەوی و زارانە بکەونە دەست چەند کەسێك، لەم ڕووەوە هانەهانەیەکی باشیان‌دا.

بۆ وێنە: سەیرت ئەکرد (١٨) ملیۆن دۆنم لە چاکتر شوێنی عێراق بوو بەهی (٦١٩ ، ٣) خاوەن مڵك، لەمانەش تەنها (٢١٧) کەسیان بوون بە خاوەنی (٦) ملیۆن دۆنم!. بنەماڵەی «فەیسەڵ» و «عبدالإله» کە هاتنە عێراقەوە خۆیان و داروودەستەکەیان بوون. کە شۆڕشی (١٤)ی تەمووز ڕووی دا ئەو وەختە خەڵك تێ‌گەیشتن کە ئەمانە لە چاکتر شوێن لە زەوی و زاری عێراق خاوەنی ٥٩٦ و ١٧٧ دۆنم ـ ن!.

هەندێ لە وەزیرەکانی دەوری شانازی، هەر لەگەڵ دەمیان هەڵئەهێنایەوە دەستیان ئەکرد بە کڕوزاندنەوە کە ئێمە هیچمان نییە، وە یا بەواتەیەکی‌تر ئەیوت: «من چیم هەیە دەرۆزە ئەکەم!.» وا دیارە ڕاستی ئەکرد، چونکە ملیۆنێ دیناری عێراقی وە یا پێنجسەد هەزار لەچاو چەند ملیۆن و زەوی‌وزاری هاوڕێکانیا زۆر کەم بوو، ئێمە پیاوێکی خراپ بووین کە ناهەقمان ئەگرتن!..

دانرا. لە چواری نیسانی (١٩٣٩)دا غازیش لە بەغدا مرد و هەر لەو ڕۆژەدا فەیسەلی کوڕی غازی ـ کە ئەو سەردەمە تەمەنی پێنج ساڵان بوو ـ لە شوێنی غازی دانرا و بوو بە پادشای عێراق. فەیسەل مناڵ بوو ئەبوایە «وصی»یەکی بۆ دابنرێ، هێنایان «عبدالإله» ـ کە خاڵی بوو ـ کردیان بە وەسی بۆی. لە چواری نیسانی (١٩٣٩)دا دیواخانی پیران و پارلەمانی نێراوان کۆبوونەوە و عەبدولئیلاه ئەم سوێندەی خوارەوەی خوارد، وتی:

«سوێند ئەخۆم بە خوا کە ئاگاداری دستوور بکەم، سەربەخۆیی وڵات ڕاگرم، دڵسۆز بم بۆ نیشتمان و میللەت، گزییان لێ نەکەم!.».

عەبدولئیلاه تا مارسی (١٩٥٣) «وصی» بوو، لە [١٤ی مارسی ١٩٥٣]دا «فەیسەڵ» گەیشتە تەمەنی قانوونی بۆشایەتی، خۆی لە سەر تەخت دانیشت و عەبدولئیلاه بۆ بە «وەلی عەهد»ی.

لە [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]دا شۆڕشە پیرۆزە بەناوبانگەی «عێراق» بە سەرۆکایەتی «عەبدولکەریم قاسم» پەیدا بوو، عەبدولئیلاه و فەیسڵ لەناوبران، دەوری پادشایەتی و «ملوکیت» ڕوخێنرا و عێراق بوو بە حوکوومەتێکی «کۆماری» و چووە ڕیزی کۆمارەکانی گێتیەوە. هەر لەو ڕۆژەدا دیواخانێکی سیادەی بۆدانرا کە ئەندامەکانی سێ کەس بوون: «نەجیب ڕەبیعی» سەرۆك، «خالد نەقشبەندی» و «موحەممەد مەهدی کوبە» ئەندام. «عەبدولکەریم قاسم» ڕەئیسی وزەرا و سەرۆکی هەرچی هێزی چەکدارە لە عێراقا.

❋ ❋ ❋

«نووری سەعید»؛ نووری سەعید گەلێ دەوری لە عێراقا گێڕا، لە پێش ئەوەدا فەیسەڵی یەکەم بێتە عێراقەوە نووری بە خزمەتکردنی ئەو بنەماڵەیەوە خەریك بوو. کە بنەماڵەی پادشایەتی دامەزرا. نووری سەعید لە یەکەم وەزارەتی جەعفەر عەسکەری لە (١٩٢٣)دا کرا بە وەزیری جەنگ، جار لە سەر جار هەر بە وەزیری هات، تا لە (١٩٣٠)دا یەکەم وەزارەتی دامەزراند، لەو وەختەوە تا ١٩ مارسی ١٩٥٨ (١٣) جار وەزارەتی دامەزراند و ناوبەناو هەر وەختێکیش خۆی وەزارەتی دروست نەکردایە ئەبوو بە وەزیری یەکێ لە وەزارەتەکان!. زۆرتر وەزارەتی دفاع و هەندێ جاریش خارجیە. بەمانەوە نەوەستا کە، لە [١٢ی مارسی ١٩٥٨] عێراق و ئەردن بوون بە یەك نووری سەعید لە (١٩)ی ئەو مانگەدا بوو بە ڕەئیسی وزەرای «ئیتتیحاد»، واتە عێراق ـ ئەردن، لە [١٥ی

تەمووزی ١٩٥٨]دا وەکوو عەبدولئیلاه و فەیسەڵ ئەویش سەری تێداچوو.

وەکوو لێکی ئەدەینەوە لەماوەی (٣٧) ساڵ حوکوومەتی شایەتی عێراقا «نووری سەعید» (٢٩) ساڵ حوکمی گێڕاوە، چە بە سەرۆکی، چە بە وەزیری. ئەم ڕێکەوتە بۆ کەم کەس بووە.

زۆرتر ئەمەش بۆیە وابوو چونکە پێشهاتی زەمان وای بۆ ئەهێنایە پێشەوە؛ سەرەتا هەر لە شەڕی (١٩١٤-١٩١٨) خۆی پاڵی دابوو بە ئینگلیزەوە و لە شەڕەکانی ئینگلیز لەگەڵ عوسمانیدا لەگەڵ بەرەی شەریفی مەککە و جێنشینەکانی پێغەمبەر، خزمەتێکی چاکیان بە ئینگلیز کرد!. پاش هاتنەوەی بۆ عێراق ئەو خزمەتەی ڕۆژ بەرۆژ زیاتر ئەکرد، لە دەورەی فەیسەڵی یەکەمدا بەرەبەرە زیاتر هاتە پێشەوە، کە فەیسەڵ نەما و غازی دانرا دیسان پشتیوانێکی بەهێز بوو بۆ دانانی غازی، غازی ئەمەی لەبەر چاوبوو، کە غازی نەما عەبدولئیلاه، کەبوو بە «وەسی» سەرەتا بوونی خۆی بە هۆی نوورییەوە ئەزانی، گوێ لە مستی ئەوا بوو، کە «عەبدولئیلاه» خۆی گرت و بنجی داکوتا بەڵێ ئەوەندە گوێ بە نووری نەئەدا بەڵام بوونی فەیسەڵی دووهەم ـ کە نووری لە پاڵیا بوو ـ دەستی «عەبدولئیلاه»ی شکاندبوو!.

ئەمە لەلایەن بنەماڵەی شایەتییەوە، لەلایەکیتریشەوە ئەوانەی کە وا هاودەوری «نووری» بوون یەکە یەکە ڕۆیشتن، دەور بۆ نووری چۆڵ بوو؛ دەورێکی وا کە خۆی بە تاقە کەسێکی کۆنتر ئەزانی لە عێراقا، خۆی بەوە ئەزانی کە وەزیرەکانی عێراق کاتبێکن لەبەر دەستیا!. ئەمەش ڕاست بوو چونکە هەموو قوتابی قوتابخانەکەی خۆی بوون!. ئینگلیز لەوێ بووەستێ!.

وەنەبێ پیاوەکانی دەوری نووری لە نووری کەم خزمەتگوزارتر بوونایە بۆ ئینگلیز، بگرە هەندێکیان گەلێ کۆششیان ئەکرد بۆ زیادکردن، بەڵام وەکوو نوورییان لێ نەئەهات لە ئاخرا [نوری] و [عەبدولئیلاه] وایان لێهات خۆیان بەخاوەنی سەروماڵی عێراق ئەزانی!. نەوەك هەر ئەوەندە بەڵکوو توغیانیان گەیشتە شوێنێك هیچ جۆرە ئیعتیبارێکیان بۆ باوەڕی کەسیتر نەهێشتەوە.

پیاوانی هەرەبەرزی سیاسی ئەگەر گەیشتنە شوێنێك زانیان ئیتر ڕزگار بوون، لەو شوێنەدا نییە ئەیانەوێ بە مردنێك بمرن، کە کەمتر نەبێ لەشەرەفی دەوری سیاسەتیان؛ وەکوو ئەوە: دێنن یا خۆیان بە گوللەیەك ئەکوژن، یا زەهر ئەخۆنەوە، یا خۆیان ئەدەن بە

دەم گوللەی یەکێکی ترەوە، یا بە جۆرێ خۆیان ون ئەکەن کە تاریخیش نەیاندۆزێتەوە وەکوو هیتلەر ئەمەی کرد. بەڵام ئاخر پلەی ژیانی «نووری سەعید»ی بلیمەتی عێراق هیچ یەك لەمانە نەبوو!!.. ئەمە بوو ئاخری پیاوە هەرە دیکتاتۆرەکەی عێراق، وە یا ئەمە بوو ئاخری ژیانی «نووری سەعید» کە تەئریخ قسەی لێوە بکا!. گەلێ جاری واش بووە، کە پیاو لە وەختی تەنگ‌وچەڵەمەدا بەرگی ژنانی لەبەر کردووە و ڕزگار بووە، بەڵام لام وایە ئەو دەورە ژن لەبەرگێکی ترابوو، ئەگەر ئەو بەرگە بمایە ڕەنگبوایە «نووری سەعید»یش ڕزگاری ببوایە!..

* * *

کارەساتی فلیمەکانی «عەبدولئیلاھ» و «نووری سەعید» لە عێراقا بڕواناکەم هیچ قەڵەمێ بتوانێ بیگێڕێتەوە. مەگەر ئەوەندە نەبێ کە قەڵەم بڵێ هەر زوڵمێ لە ئەندازەی خۆی دەرچوو ئەبێ زەواڵی بۆ بگا و ئەبێ سەرەولێژ ببێتەوە. لەگەڵ ئەوەشا پێویستە خوێندەواری ئەم کتێبە کەمەکێکی زۆر کەم ئاگاداری پەیداکا بەسەر تۆزێ لەو شتانەدا کە زیاتر ئەو جووتە ئەیانگێڕا:

شەڕ زۆر ناخۆشە بەڵام لەبەر ئەوە لەپاش دوایی هاتنەکەی ئاشتی و ئازادی پەیدا ئەبێ ڕەنگبێ خۆش بێ!. «عێراق» لەژێر باری جەوری عوسمانییەکانا ئەیناڵاند، شەڕی (١٩١٤ ـ ١٩١٨) دەورەیەك بوو بۆ ئەوە عێراق لەو جەور و زوڵمە ڕزگاری ببێ، بە ـ حوکمی واقع ـ ڕزگاری بوو، بەڵام پیاوە خودپەرست و قازانج پەرەستەکانی ئیشێکی وایان کرد دیلی و کۆیلەیی عێراق لە جاری جاران خراپتری لێ‌هات!. لە پەیمانەکانی (١٩٢٠)ەو بیگرە تا ئەگاتە (١٩٥٨) یەك لەیەك خراپتر بوون بۆ بەستنەوەی عێراق. سەرباری ئەمەش لوتوپووتی خاوەن حوکمەکان ئەوەندەی‌تر دەردی وڵاتەکەی گرانتر کردبوو. بۆ ئەوە ئەمەمان بۆ دەرکەوێ با هەندێ لە «یادداشت»ەکەی من بخوێنینەوە لە بارەی هەندێك لەو کەسانەوە:

سوێندەکەی عەبدولئیلاهمان خوێندەوە لە کاتێکا کەبوو بە «وصی» لە عێراقا. جارێکی‌کەش بگەڕێوە سەری و بیخوێنەوە بۆ ئەوە بەتەواوی لەبەری کەی!.

عەبدولئیلاهی وەسی ماوەیەك بە بێ‌دەنگ و سەنگ مایەوە، یەکەم شت کە لێوە ڕووی‌دا گەڕانە بەناوبانگەکەی بوو، لەساڵی (١٩٤٥) بە ئاورووپادا ـ کە ئینگلیز پاڵی پێوە نا بۆ ئەو گەڕانە. لەو ساڵەدا لەبەر ئەوە کە پاشەلەقەی شەڕی بەینی «هاوپەیمان»ەکان

و «محوەر» هەبوو گرانیەکی هەر زۆر خراپ کەوتە وڵاتەوە؛ ئەبوایە هەموو ماڵێك دوو زەلامی تەرخان بکردایە لە پێش نیوەشەوەوە بچوونایە بەر دەرکی نانەواخانەکانیان بگرتایە تا پاش هەتاو کەوتن، سائەگەر چەن نان وە یا سەمونێکی ڕەشیان چنگ ئەکەوت یا نەئەکەوت!. بە کورتی ئیش وای لێ هات لەوەدا نەما کە هەڵگیرێ، هاوار و دادی ئافرەت لەبەر بێنانی لە شاری بەغدادا ـ کە پایتەختی عەبدولئیلاه بوو ـ ئاسمانی ئەهێنایە گریان!.

لەم کاتەدا عەبدولئیلاهی وەسی لەو گەڕانەیدا دوو ملیۆن دیناری عێراقی هەڵگرت و لە ئاهەنگ و بەزمی ئاوروپادا خەرجی کرد!. سەرەڕای ئەوەش کە گەڕایەوە، بەقسەی باشچاوشەکانی نزیکەی نیو ملیۆنیتر خەرج کرا بۆ تەرتیباتی پیریبەوە چوون و بانگێشتنی سەر بە دەرەوە بووەی شارەکانی عێراق و دروستکردنی تاق و عەنعەناتی شاهی!. ئەمە بۆ ئەوەکە عەبدولئیلاه گەڕاوەتەوە بۆ پایتەخت!..

* * *

هەرکەس خەریکی هەرشتێك بوو خۆی لەو کۆڕەدا ئەبینێ. سەرگوزەشتی «بوناپارت ناپلیون»م خوێندەوە کە لە ڕۆژی حەوتی کانوونی یەکەمی (١٧٩٧)دا گەڕایەوە بۆ شاری «پاریس»، ئاڵاکەی لەبەر دەمیەوەبوو؛ ئەو ئاڵایە کە (٦٧) هەرای لەگەڵ ئەڵمانیا و ئیتالیادا لێ نووسرابوو ئەوانەی هەموو هێنابووە ژێر ڕکێفی خۆی. شاری پاریسم لەبەر هاتنەوەی ناپلیون بە جوانتر کاتێ چاوپێکەوت لە ژیانی پاریسدا، وەشەعبی فەرەنسیم بە کامەرانتر وەختیان هاتە پێش چاو هەر لەبەر هاتنەوەی «ناپلیون». شاری بەغدا و هەندێ شەعبی عێراقیشم لەبەر هاتنەوەی «عەبدولئیلاه» چاوپێکەوت، ئەمانەم بەلاوە جوانتر و کامەرانتر بوو لە شاری پاریس و لە شەعبی فەرەنسی!.

بەڵام ئەوەندە هەبوو شەعبی فەرەنسی ئەوەیان بۆ ئەو [بوناپارت]ە کرد کە فەرەنسەی لە چنگی مردن فڕاندەوە و «ئیتالیا، نەمسە، ئەڵمانیا و ڕووسیای» داگیر کرد و تەنگی بە دوورگەکانی بەریتانیا هەڵچنی و قاپیەکیتری تارێخی بەشەرەفی بۆ فەرەنسە کردەوە. نازانم باشچاوشەکانی عەبدولئیلاه ئەمەیان بۆ کێ کرد و لەبەر چی کردنیان؟!. ئەم دوو ملیۆن و نیوە لە خەزێنە هەڵگیرا؛ ئەو خەزێنەیە کە لە زەریبە و سەرانەی [شەعبی عێراقی] پێکەوە نرابوو، ئەگینا «عەبدولئیلاه» تا ئەو ڕۆژە کەبوو بە وەسی لەبەر بێشتی مووچە خۆرێکی

بچووك بوو لە وەزارەتی خارجیە. وە یا بە جۆرێکی‌تر بیڵێین هەر هاتوچووی «ڕایسز»ی ئەکرد؛ ئەو «ڕایسز»ە کە لە پاشا کردی بە مایەی لات‌بوونی شەعبی عێراقی و کیسەپڕکردنی خۆی و حوکوومەتی شۆڕشی عێراق هەڵی‌گرت و عالەمی لەو بەڵایە ڕزگار کرد.

دیسان لە ساڵی (١٩٤٩)دا بۆ دوو مانگ گەشتێکی‌تری ئاورووپای کرد و عەینی مەخارجی هەڵگرت، ئەمەیان لە کاتێکا بوو کە میزانیەی حوکوومەتی عێراق بە جۆرێك لات کەوت ئەگەر بانگەکان نەکەوتنایە فریای، حوکوومەت سەری تێدا ئەچوو!. ئەمە خەزێنەی حوکوومەت، ئەمەش گەڕان و ئاهەنگی «سمۆی وصی»؟!!. ئەمە ئەو پیاوە بوو کە وتی: «دڵسۆز ئەبم بۆ نیشتمان و میللەت و گزییان لێ ناکەم!.».

ئەمە تەنها دوو لاپەڕەی کورتی ژیانی «عەبدولئیلاه» بوو. ئیتر بێجگە لە، دڵ‌ڕەقییەکەی، لە کەس نەناسینەکەی، لە هەموو کەس بە بەندەزانینەکەی، لە خیانەتە ناپاکانەکەی بەرانبەر بە هەموو شەعبی عێراقی لە ڕێگەی پاراستنی قازانجی تەنها خۆیا، لە فەرماندان بە کوشتنی بێ‌گوناحەکان لە سووچی بەندیخانەکانا لەبەر تینووبوون بە خوێنی شەعبی عێراقی، لە ڕووتانەوەی گەورە و بچووك و لە فەسادەکەی بەرانبەر بە میللەت!.

❋ ❋ ❋

ڕەنگبێ هەواخواکانی «نووری سەعید» وە یا بێگانەکان بڵێن نووری سەعید پیاوێکی گەورەی سیاسی و پیاوێکی زۆر بەکەڵك بوو بۆ عێراق، گەلێ خزمەتی کرد بە عێراق و گەلێ وڵاتان گەڕا بۆ بەرز بوونەوەی عێراق!. ڕەنگبێ ئەمە بڵێن، بەڵام ئایا ئەمە قسەیەکی ڕاستە؟ یا هەر لەبەر ئەوەیە کە «چاوی ڕەزامەندی کەم‌وکوڕی نابینێ؟.». لام وایە ئەگەر پیاو لەم باسە بکۆڵێتەوە بەتەواوی ڕاستییەکەی بۆ دەرئەکەوێ.

نووری سەعید، ئێمە وتمان (٢٩) ساڵ لە حوکما بووە لە عێراقا بەڵام ئەگەر ڕاستییەکەت ئەوێ هەر (٣٧) ساڵە کە حوکمی عێراقی کردووە. لەم ماوەدا ئەگەر بوترێ خزمەتی ئینگلیز و خزمەتی «ئەنانییەتی نەفسی» خۆی کردووە ئەمە ڕاستە، ئەو خزمەتەی ئەو هی ئینگلیزی کرد کەسێکی‌تر لە عێراقا ـ هەرچەندە خەریکیش بووبێ ـ نەیکردووە، لەم ڕووەوە قابلیەتێکی تەواوی هەبوو. لە «ئەنانیەتی نەفسی»شدا عەینی قابلیەتی هەبوو؛ ئەو ڕۆحەی وای لێ کردبوو هەموو کاتێ لە کۆششی ئەوەدا بوو کە هاودەورەکانی، وە یا مونافەسەکانی،

وە یا ئەو بیٚگوێیانە کە بە گوێیان نەئەکرد لەناویان بەرێ وە یا لەناو بچن بۆ ئەوە مەیدان بۆ خۆی چۆڵ ببێ و بە هەموو ئارەزوویەکیەوە ئەنانیەتە نەفسییەکەی تێربکا!.

نووری سەعید تەنها «حبی ظهور» و «حبی ذات» نەبێ هیچیتر نەفسی ئەوی تێر نەئەکرد. پیاوێکی بێخزم و عەشرەت، بێبنەماڵەیەکی ناودار نەئەگەیشت بەم ئارەزووە تەنها بەوە نەبێ کە بە هەموو مەعنایەك ئارەزووەکانی ئینگلیز بەجێبێنێ و بۆ ئاسایشی ئینگلیز گۆشتی خۆی وا تاڵ کا، ئەگەر هەر ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو شەعبە کە ئەو حوکمی ئەکرد بەسەریانا بۆیان ڕێك کەوتایە لەشەکەیان بەسەر شەقامەکانا ڕائەکێشا. وەکو ڕایانکێشا لە ڕۆژی [١٥ی تەمووزی ١٩٥٨]دا!..

«نووری سەعید» با لە ڕواڵەتیشا دەری نەبڕیایە بەڵام لە دڵا دەمێك بوو ئەیزانی کە پاشەڕۆژی ژیانی ئەو ئەبێ وای لێ بێ، ئەوەندە هەبوو لەبەر «ئەنانیەتە نەفسی»یەکەی ئەوەی نەئەخستە خۆی!. پێ نەنگ بوو لابکاتەوە بەلای خواوە و جارێك لە جاران بڵێت خوایەك هەیە و تۆڵەسەندنەوەیەك هەیە!. پێ نەنگ بوو لایەك بکاتەوە بەلای شەعبەوە و بڵێت شەعبێك هەیە و تووڕەبوونی شەعبێك هەیە. لەباوەڕی ئەوا «ئینگلیز» لە هەموو کەس گەورەتر بوو، ئەو کە ئینگلیزی هەیە ئیشێکی بەخوا نەماوە، وەکارێکی نییە بە تووڕەبوونی شەعبەوە!. لەگەڵ ئەوەدا خوا لە هەموو کەس و لە هەموو شت گەورەترە، وەلە پاش خوا [ئیحتیرامی شوعووری شەعب] گەورەترە نەوەك ئینگلیز. بەڵگەی ئەم قسەیەش ئەوەیە کاتێ کە خوای لێ ڕەنجا و ویستی تۆڵەی لێبکاتەوە، وە کاتێ کە شوعووری شەعبی لێ تووڕە بوو ئینگلیز هیچی پێ نەکرا کە ڕزگاری بکات.

کارەساتی ئاخر هەناسەی ژیانی «نووری سەعید» و «عەبدولئیلاه» دەرزێکی زۆر بەنرخە بۆ هەموو گەورە و بچووکێك، بۆ هەموو خاوەن پایە و بێپایەیەك، بۆ هەموو پادشا و بێنەوایەك کە خوا لە ژوور هەموو کەسێکەوەیە وە ئەبێ هەرکەس لە ئەندازەی دەسەڵاتی ئیشی خۆیا «شوعووری شەعب»یش ڕابگرێ.

مایەوە سەر ئەوە کە هەواخواکانی «نووری سەعید» بڵێن لە ماوەی حوکمی خۆیا گەلێ خزمەتی کرد بە عێراق، گەلێ بازاڕ و دووکان لە دەورەی ئەوا دروستکرا، گەلێ شەقام ڕاکێشرا و قیرتاو کرا، گەلێ قوتابخانە کرایەوە و مستەوای خوێندەواری بەرز

کرایەوە! وەکوو «نووری سەعید» لە زەمانی خۆیا هەموو جار ئەم قسانەی ئەکرد و بەرانبەری دەوری عێراقی ئەکرد لەگەڵ زەمانی تورکا و ئەیوت لەو دەورەدا کۆشکی بەرز بەرز نەبوو ئێستە هەیە، لەو دەورەدا قوتابخانە و شەقام نەبوو ئێستە هەیە... هتد!. باشچاوشەکانیشی بۆیان ئەدا بە سنگا و ئەیانوت «ئەشهەدو بیللا ڕاست ئەکەی!.»».

بەڵام ئایا ئەم قسانە کە ئەکرا و ئەوترا ڕاست بوون؟. یا هەر وا قسە بوون و وەختیان پێوە ڕائەبوێرا؟!.

لام وایە ڕاست نەبوون، چونکە ئەگەر «نووری سەعید»یش نەبوایە شەقامەکان هەر وا ئەکرانەوە و قیرتاو ئەکرا، قوتابخانە هەر ئەکرایەوە و خوێندەوار پەیدا ئەبوو، کۆشکی بەرز بەرز ئەچوو بە ئاسمانا، بۆیەش ئەبوون چونکە قانوونی گۆڕان و «تطوّر» لەناوا هەیە، مادام گۆڕان هەیە ئەبێ هەمووشت هەر ڕۆژە پێ‌پلیکانەیەك بگوێزرێتەوە. بە پێچەوانەی ئەمە بەڵکوو «نووری سەعید» زۆری ئەخستە سەر ڕەورەوەکە بۆ ئەوە بە سستتر بسووڕێتەوە!.

ئەگەر سەیرێکی عێراق بکەین لەماوەی ئەم (٣٧) ساڵەدا کە ئینگلیز و «نووری سەعید» تیایا حوکمیان کردووە و سەیری شوێنێکی‌تریش بکەین لە ئینگلیز و «نووری سەعید» تێدا نەبووە، ئەمەیان بە ئاشکرا بۆ دەرئەکەوێ کە ڕەورەوەی پێشکەوتن لە عێراقا کەمتر لە هی گۆڕانە ئەسڵیەکەش بزووتۆتەوە!.

بەڵێ ئینکار ناکرێ لە عێراقا هەندێ شت بە جوانی هەنگاوی هاویشتووە و قسەکەی «نووری سەعید» و «عەبدولئیلاه» دێنێتە دی کە بۆ پێشەوە ڕۆیشتووە، ئەوشتەش [فەسادی حوکم] و نارەوایی و ناهەقی حوکم بووە، لەم لایەنەوە بەڕاستی دەورەیەکی ڕووناکە بۆ لاپەڕەی ژیانی نووری سەعید و هاوکارەکانی!. بەسایەی ئەو و لە سایەی ئەوا چەندکەسێك کورسی حوکمیان وەکوو تۆپێ چەغزین ئەخست بۆ یەك و ئەیانگرتەوە و لەبەر ئەوە کە خۆیان بە ئایەری ئەزانی لەباتی ئەوە عەدل و دادپەرستی بڵاوکەنەوە خەریکی کیسە پڕکردن و خەریکی تێك‌چوونی کاروباری عەداڵەت بوون، ئەمەش هەر بۆ ئەوە کە کیسەکەی خۆیان پڕکەن!. تەنانەت ئەمە یەکێکە لە قسەی یەکێ لەو کەسانە کە جارێك ڕەئیسی حوکوومەت بۆ ئەیوت: «ماڵی ئەم حوکوومەتە وەکوو کەلاك وایە، کێ ئازایە شتێکی بۆ خۆی لێ بکاتەوە!.»». ئەمە قسەی ڕەئیسی حوکوومەت بوو لە کاتێکا کە شکاتی خراپی حاڵ و

ئەحواڵی وڵاتیان لائەکرد ئەویش وای وەڵام ئەدانەوە!. وە یا یەکێکی‌تر لە وەزیرەکان لە دەورێکا، کە وەزیر بوایە، یان نەبوایە «مودیر ناحیە» وە یا شتێکی وای بە لە (٢٠٠) دینار کەمتر دانەئەمەزراند!. دەی ئەمە حاڵی پیاوەگەورە لە ڕووەکانی حوکوومەتەکانی «نووری سەعید» بووبێ، ئایا حاڵی لەوان خوارتر ئەبێ چۆن بێ؟!.

لە کاروباری دایەرەکانا کامی ئەگیرا لەویتر خراپتر بوو، بەڵێ ئەوەی کە پێی ئەڵێن ڕۆتینی و کلیشە هەمووی هەبوو؛ عەریزە ئەدرا، تەسجیل ئەکرا، کابرا هاتۆچووی بەشوێن کارەکەیا ئەکرد و ماوەیەکی زۆری پێ ئەچوو بەڵام تا دەستی نەکردایە بە کیسەکەیا ئیشەکەی بۆ جێبەجێ نەئەبوو!..

مەسەلەی مەحسووبیەت و مەنسووبیەت گەیشتبووە شوێنێك ئەگەر یەکێ شێری بە گوێ بگرتایە مادام سەر بە یەکێك نەبوایە بەشی ئەو کەسە لە برسا مردن و چەوساندنەوە بوو، ئەوەی کە حەقی مەشرۆعی خۆی بوو کرابوو بە ژێر لێوەوە و هەزار هاواری بکردایە پوولێکی نەئەهێنا، نە کەفائەت، نە قابلیەت، نە دەستپاکی، نە ڕەوشت چاکی، ئەمانە هیچی کەڵکی نەئەگرت. لەم ڕووەوە ئەو مەسەلە سەری‌دابوو لە عێراقی پێشوو کە ئەڵێن:

«جارێك دوو کەر لە ژێر باری بەلەدیەدا بەبێ کا و جۆ لەبەر بارگرانی هەموو پشتیان بووبوو بە برین، یەکێکیان لەویکەیانی پرسی ئەرێ برا! ئائەو کەرە کە لە دوورەوە دیارە و لەناو ئەو قەرسیلەدا هەر تەراتێنیەتی و گێپەڕەی ملی باوەشی پێیانایەتەوە، خۆ ئەویش وەکوو ئێمە کەرە بۆچ بارێکی لێ نانێن؟!.» ئەویش پێ‌وت: «ئەوە تۆ شێت بوویت؟!. نازانی؟ ئەوە جاشکی کەری سەیانی سەگەوانەکەی نۆکەری ماڵی ڕەئیسە!.»».

کارەساتی دەوری بۆگەنی حوکوومەتەکانی پێشووی عێراق بە ئەوەندە دوایی نایەت بەڵکوو کتێبێکی تایبەتی ئەوێ، ئەگەر ڕۆژگار بۆی هێنایە پێشەوە ئەو کتێبەش ـ کە ئێستە ئامادەیە و نووسراوە ـ ئەیخەینە بەرچاوی خوێندەواران. بەڵام لێرەدا بە قسەیەکی کورت تەنها ئەوە ئەڵێم:

«زوڵم لە ناو هەموو قەوم و قانوونێکا ناپەسەند بووە و ناپەسەندە، بەڵام لە عێراقی پێشوا ناچار بوو پیاوبێ بە زاڵم، بۆچی؟ بۆ ئەوە کە نەبێ بە مەزڵووم!.» ئینجا لەم قسەیە ورد بەرەوە و زۆر شتی لێ وەربگرە.

کە ئیش گەیشتە ئەم شوێنە و بەو جۆرە کاسە پڕ بوو [شۆڕشە پیرۆزەکەی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨] وەکوو گزنگی ڕووناکی لەو شەوی تاریکیدا دەستی پێکرد و پەردەی پێشووی لادا و دەورێکی‌تری هێنایە پێشەوە.

لە گەلێ دەورا و لە گەلێ وڵاتا شۆڕش ڕووی داوە بەڵام وامەزانە هیچ شۆڕشێك وەکوو شۆڕشی عێراق شوێنی خۆی گرتبێ. ئەو شۆڕشانەی کە لە لاپەڕەکانی مێژوودا لە وڵاتان ڕوویان داوە بێجگە لەوەکە لافاوی خوێنیان هەستاندووە ئەنجامەکەیان وە یا پەیوەندەکەیان هەر بۆ خۆیان بووە بەڵام شۆڕشی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق بێجگە لەوە کە هەر تەنها (١٩) کەسی دابەکوشت چەندە ئاشنایەتی ـ بۆ گۆڕینی وەزع ـ بە خۆیەوە بووە دەئەوەندە زیاتر تەونی شوێنانی تێکداوە!. ئەنجامی شۆڕشی (١٤)ی تەمووزی عێراق ڕووپەڕەیەکی لە دنیای ئیمڕۆدا گۆڕێ و کارەساتێکی هەرەگەورەی بۆ پاشەڕۆژی تارێخیش هێشتەوە.

بۆیە ئەمانەی کرد چونکە لەلایەکەوە، وەکوو دەوری بۆگەنیوی زەمانی پادشایەتی پێشووی لە عێراقا تێك‌دابوو بڕبڕەی پشتی ئینگلیزی لەم ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و خوارەوەشدا شکاند. تەون و بنکەکانی «ئەمەریکا»ی هەر لەم ناوەدا تێکدا، پڕۆژەکەی «ئایزنهاوەر» ـ کە لە [٥ای کانوونی یەکەمی ١٩٥٧]دا بەردی بناغەکەی لە پێش دەمی ـ گونگریسی ئەمەریکی ـ دا، دانا و هێشتا ئەوان بەتەواوی بڕیاریان لەسەر نەدابوو، کەچی «نووری سەعید» وەری‌گرت! ـ تێکی‌دا.

لە ساڵەکانی (١٩٤٨-١٩٤٩) کە «عەبدولئیلاه» بە ناوی سەرلەشکری گشتییەوە ڕۆژێك لە عێراق بوو ڕۆژێك لە فەلەستین و خەزێنەی حوکوومەتی عێراقی بەوناوەوە خاڵی کردەوە گۆیا بۆ تێکدانی حوکوومەتی جوولەکە و بۆ لەناوا هەڵگرتنی خەریك ئەبێ کەچی لە ڕاستیشدا هەر بۆ ئەوەی ئەکرد کە حوکوومەتی جوولەکەی پێ بەهێز بکا!. شۆڕشی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق پشتی هێزی ئەو حوکوومەتی جوولەکەیەشی شکاند!.

[نووری سەعید] بە پەیمانەکەی بەینی عێراق و تورکیا کە لە ١٩٤٦/٣/٢٩دا کردی و مەبەستی هەرەزلیشی لەو پەیمانە کوشتنی کوردەکان بوو وازی نەهێنا!. ئەمجا لە (١٩٥٥/٢/٢٤)یشدا لەنگەریەکی‌تری خستە مەیدان و ناوی نا «پەیمانی بەغدا». لەلایەن

عێراقەوە خۆی و [بورهانەددین باش ئەعیان] و لەلایەن تورکیاوە «عدنان مندریس» و «فوئاد کوبرلو» هەریەکە مۆرێکی زلیان پێدا نا و خێرا ئێران و پاکستانیشی خستە کۆڕەکەوە و بەریتانیا و ئەمەریکاش قاوەگێڕ بوون لەمەیدانەکەدا! ـ شۆڕشی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق ئەو پەیمانەشی هەپروون بە هەپروون کرد!.

ئینگلیز و ئەمەریکا کە دەستیان لە پەیمانی بەغدا بڕا «شای ئێران»یان هان ئەدا بۆ دامەزراندنی «کۆمەڵەی ئاری». کۆمەڵەی ئاریش عیبارەت بن لە: ئێران، پاکستان، ئەوغان و تورکیا!.

ئەرێ ئینگلیز و ئەمەریکا خوام کرد بە گژتانا! ئێوە ئیشێ بکەن بە پیاو کە تۆزێ ڕێگەی تێ‌بچێ و خەڵك دەست نەکا بە پێکەنین. ئەوا ئێران و پاکستان و ئەوغان ئاری بوون باشە، بەڵام تورکیا چە ئاشنەیەتیەکی لەگەڵ ئاریدا هەیە؟!. ئەگەر ناوێکی‌ترت بۆ بدۆزینایەوە باشتر نەبوو؟!..

[نووری سەعید] هێنای لە [١٤ی شوباتی ١٩٥٨]دا بە پەیمانی بەغدا وازی نەهێنا دەنگی یەکیەتییە پووچەڵەکەی بەینی عێراق و ئەردنی بڵاو کردەوە و خێرا لە (١٩٥٨/٥/١٢)دا پارلەمانەکەی خۆی و هەر دووشای عێراق و ئەردن بڕیاریان لەسەر دا و لە (١٩)ی ئەو مانگەدا خۆی بوو، بە سەرۆك وەزیری، کەچی نەیزانی شۆڕشی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق سەری ئەو و سەری یەکیەتی عێراق و ئەردن ئەخوا و ئەیڕووخێنێ بەسەر یەکا!.

شۆڕشی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق وەکوو ئەمانەی کرد تیرێکیش بوو ئاوقەی دڵی شاو شازادەکانی ئەم دەوروبەرەی کرد کە لە نووستنیشا ئەو تیرە هەرکاریان تێ بکا و ناچاریان بکا بەوە کە، دان بە شەعبەکەیانا بنێن و بە تەواوی ئیمان بەوە بێنن کە هێزی شەعب ئەوەیە کەوا داروپەردووی پادشایەتی ئەڕووخێنێ و ئەوترسەیان بداتێ کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ـ ئەگەر ئەوانیش بە ناپیاو دەرچن و تۆزێ لووتیان نەیەنە خوارەوە ـ لەشەکانیان بەسەر شەقامەکانا وەکوو هێنەکانی «عێراق» ڕائەکێشرێن!..

گەلێ لە پێش ئەوەدا کە «فەیسەڵی دووهەم» تەخت وەربگرێ، بۆ دۆزینەوەی شوێنێك بۆ ئەوە عەبدولئیلاه تیاید ببێ بە پادشا هەر خەریك بوون، بە قسەی ئینگلیز و «عەبدولئیلاه» و «نووری سەعید» لە سووریایان چاکتر و بە لەوەڕتر نەدۆزیەوە!. لە هەموولایەکەوە عێلجاری

لێ‌کرا بۆ ئەوە مل بێنێتە ژێر بار و شوێن تەختی «عەبدولئیلاه» خۆش بکا!. لەلایەکەوە هانی جوولەکەی لێ‌درا، لەلایەکەوە هی حوکوومەتی [شەمعوون]، لەلایەکەوە تورکیا، لەم‌لاشەوە [عەبدولئیلاه] بە خۆی و [نووری سەعید] و پیاوەکانیانەوە بەشەو و بە ڕۆژ، بە پارە و بە چەك خەریك بوون، کەچی کوتوپڕ شۆڕشی [١٤ای تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق ئەو هەموو فاك و فیکەی تێك‌دا و هەموو فرمانەکانیانی وەکوو کورتانەکەی جەجاڵ لێ کردا!..

● ● ●

لە هەموو وڵاتی دنیادا «سەرباز» جگەرگۆشەی ئەو باوك و دایکانەن کە پێیان ئەڵێن «شەعب»وە شەعبیش ئەو دەستە خەڵکەن کە لە کۆڕی سەرباز و کاربەدەست و ئاغا و جوتیار و کرێکار و خاوەن کارگەو وەزیر و گزیرا کۆ ئەبنەوە، هەریەکە لەمانە لوێچکن لە دەریای شەعبەکە، ئەوەندە هەیە ئەمانە بەتێکرا پاسەوانێکیان ئەوێ بۆ خۆیان و بۆ ئەو خاکە کە تێدا ئەژین. ئەو پاسەوانەش کەوا ئەم ئەرکە زلە هەڵئەگرێ و گیانی خۆی وەکوو هەڵماتە بچکۆلەیەك بۆ ئەو پاراستنە ئەخاتە بەرەلەپی «سەربازە». تەنها سەربازەو لەسەرباز دێت کەشایانی ئەو فرمانە پیرۆزەی هەبێ.

ئەمجا لەناو ئەم شەعبەدا ـ کە بەم‌جۆرە باس‌کرا ـ ئەگەر یەکێك ئەوی پێویستی «شەعبیەتە» بەجێ نەهێنا مەعنای وا نییە کە شەعبەکە هەمووی بێ‌کەڵك و شایانی هیچ شتێك نییە. [شەعب] وە یا قەوم ئەبێ چاکێشی تێدا هەبێ و خراپیش، ڕێ ناکەوێ هەمووی چاك بێ وەکوو ئەوە ڕێ‌ناکەوێ کە هەمووی خراپ بێ.

لە قەومێکا ئەگەر هات و یەکێکیان وە یا چەند کەسێکیان خراپە و خراپەکاریان بەرانبەر بە قەومەکەی خۆیان وە یا قەومێکی‌تر نواند مەعنای وا نییە ئەو [قەومە] کە وا ئەو چەند خراپەکارەی تێدا هەڵکەوتووە هەمووی خراپن، هەرکەس بە هۆی خراپی چەند کەسێك لە قەومێکا «حوکم» بدا بە سەر خراپی ئەو قەومە ـ دا، ئەوە گوناح و ناپیاوەتیە کە بەرانبەر بە ویژدان و بەرانبەر بە [تارێخ] ئەینوێنێ.

ئەو قەومە وەختێك هەموویان خراپ ئەبن کە تێکرا هەموو دەمار و خوێنیان پڕ ببێ لە بیروباوەڕی پیاوە خراپەکەی کە تیایانا هەڵکەوتووە. ئەمەش لە ژوور مەحاڵەوەیە؛ چونکە تا ئەو بەرەیە و بەرەی دوای ئەوان وایان لێ‌دێ کە ئەو مەفکۆرەیە پڕ بە پڕی

مێشکیان بووەستێ ماوە و زەمانێکی ئەوێ. لە سونئەتی کونە کە چەرخی زەمان ئەوەندە ڕاناوەستێ تا ئەوان بگەنە ئەو پایەیە. کە ڕانەوەستا گۆڕان بەسەرا دێت، کە گۆڕان هات تەونی کابرای پیاوخراپ هەموو شیتاڵ شیتاڵ ئەبێتەوە!.

بەڵێ یەکێکی خراپ بۆ ئەوە [نەفسی] پیسی خۆی لە هەموو جەورێك پڕ بکات وای بە تۆ پیشان ئەدا کە فلانە قەوم هەمووی خراپن، بەرانبەر بەم کابرا خراپە خراپێکی تریش لە قەومەکەی ترا، پەیدا ئەبێ و ئەویش بە چەشنی باوەڕ ئەڵێ [فلانە قەوم] هەموویان خراپن. بە هۆی ئەم دووکەسەوە ناڕەواییەك و بێ باوەڕییەك لەبەینی ئەو دوو قەومەدا پەیدا ئەبێ و کەچی لە ڕاستیشا هیچی وا نییە.

لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەوە، ئەوە بۆ ئێمە دەرکەوت کە قەومی عەرەب، وە یا کورد، وە یا فارس ـ ئەمانە بە میسال ـ نابێ ئەفرادی ئەمیان زەمی قەومەکەی تر بکەن بڵێن هەموویان خراپن. چە کوردە چە عەرەبە، چە فارسە؛ بێ‌شکە کە چاکێشیان تێدا هەیە و خراپیش. کە وابوو من لێرەدا هەندێ جار کە ئەڵێم: «فارس وە یا عەرەب وە یا کورد». ئەوەیان کرد و ئەوەیان کرد، ئەوە دیارە مەبەست ئەو کەسانەیە کەوا بۆ پاراستنی کورسی و پایەی خۆیان جەور و ستەمەکەیان وەکوو دووکەڵێکی ڕەش وایە قەومەکەی خۆیشیان و قەومێکی تریش ئەگرێتەوە. جا ئەو جۆرە کەسانانەن کە بوون بە پشیلە نەوتینە و بە ناو قەومەکانا ئەسووڕێنەوە!.

* * *

شۆڕشی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق ئەم هەموو ئاژاوانەی لە دەری عێراقا نایەوە و ئەو هەموو تەلبەندانەی بەسەر یەکا تێك‌دا.

سەربازی عێراق و شەعبی عێراق ـ بە کورد و عەرەب ـ ەوە دەمێ ساڵە لەجەنگی نانەوەی شۆڕشێکی وادابوون، پاش (١٩١٨) وەنەبێ ئیتر هەر وا بە بێ‌دەنگ و سەنگ دانیشتبێتن. شۆڕشەکانی بەینی دوو لاپەڕەی (١٩٢٠-١٩٣٠) عەرەب لە عەرەبستانا و کورد لە کوردستانا ئەم گەواهیانە ئەدەن. لە (١٩٣٠)دا ئینگلیز و «نووری سەعید» لایان وابوو بە پەیمانەکە هەموو ئیشێکیان تەواو کردووە، کەچی شۆڕشی (١٩٣٦)ی «بەکر سدقی» بەسەراهات!. ئەوە کوژێنرایەوە شۆڕشی (١٩٤١)ی بەسەراهات. لە [٢٤-٢٧ی کانوونی

دووهەمی ١٩٤٨]دا شۆڕشە بەناوبانگەکەی گۆبەنی «پورتسموس» بوو کە شەعبی عێراقی (٧٠) کوژراو و (٤٠٠) بریندارىدا بە دەستەوە. لە (١٩٥٢)دا لە پاش ئەوە کە لەلایەن دەورو دووکانی پێشووەوە هەموو بەندیخانەکان پڕکران شۆڕشێکیتر دەستی پێ کرد بەڵام حوکم درایە دەست سەرۆکی عەسکەری ئەو وەختە و ئەویش دیسان شۆڕشی کوژاندەوە، لە (١٩٥٦)دا عەینی دەور دەستی پێ کردەوەو عەینی سەرەنێزەی جەور دایمرکاندەوە!.

لە هەریەك لەسەرنەگرتنی ئەم شۆڕشانەدا دەرزێك وەرگیرا و لەهەر سووچێکیەوە هیوایەك وەرگیرا. کە وابوو شۆڕشی (١٤)ی تەمووز شتێکی کوتوپڕی نەبوو، بەڵکوو وا دیار بوو بناغەکەی دەمێك ساڵ بوو دانرابوو، بەڵام هێشتا پوختە نەبووبوو بۆیە لە ساڵەکانی پێشووا هیچ بەرێکی نەدا بەدەستەوە.

دەمێك بوو هەموو کەس بێزی ئەهاتەوە لەو دەور و دووکانە، سەیرتر ئەوەبوو کابرا وەزیر بوو کەچی ئەویش هەر بێزی لێئەهاتەوە!. دەمی هەرکەست ئەکردەوە لە گەورە و بچووك، لە خوێندەوار و نەخوێندەوار، لە ئەفسەر و لە ئەفەندی هەموو لەو دەورو دووکانە دڵ بریندار بوون، وادیار بوو تەنها «عەبدولئیلاھ» و «نووری سەعید» و چەند کەسێك لە باشچاوشەکانیان نەبێ ـ لەبەر گومڕاهی ـ ئەگینا هەموو دانیشتووێکی عێراق دڵی بووبوو بە دانەی سەرساج!. هەر ئەو گومڕاهییەبوو کە وای لێ کردبوون هەموو کۆششێکیان بۆ بەرزبوونەوەی مەملەکەت بخەنە سەر زۆرکردنی «جاسوس» و کڕینی ویژدان، کەچی ئەوەش هەر کەڵکی نەگرت بۆیان!.

شۆڕشی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق، شۆڕشی پاڵەوانی نەبەز «عەبدولکەریم قاسم»ە. عەبدولکەریم قاسم [زەعیم ڕوکن] بوو لە نەیرووی عێراقا، پیاوێکی هێمنی لەسەرخۆی خاوەن بیروباوەڕێکی قایم بوو، حەزی بە خۆدەرخستن و عەنعەنات نەئەکرد، هەر لەبەر ئەم هێمنی و خۆدەرخستنەی بوو. کە «عەبدولئیلاھ» و «نووری سەعید» و ئەو هەموو دەستوپێوەندەیان نەیانتوانی لەو باوەڕە قایمەی [عەبدولکەریم قاسم] تێبگەن لەگەڵ ئەوەشا کە زۆر دەمێك بوو ئەو باوەڕە هاوڕێ [عەبدولکەریم قاسم] بووا!.

[عەبدولکەریم قاسم] بێجگە لەوە کەوا کاروباری ناڕەوای حوکوومەتانی پێشووی عێراق کارێکی زۆریان کردبووە دڵی و بێجگە لەوە کە فیکری لە پیاوانی عێراق ئەکردەوە؛ ئەو

پیاوانە کەوا لە دایەرەکانا و لە سوپادا فرمانی گەورە گەورەیان گرتووە بە دەستەوە لەباتی ئەوە خزمەتی وڵاتەکەیان بکەن کەچی هەموو کۆششێکیان خستۆتە سەر جێبەجێ‌کردنی فەرمانەکانی [عەبدولئیلاھ] و [نووری سەعید]ـ کە فەرمانی ئەوانەش هەر بۆ پێشکەوتنی کاروباری ئینگلیز و ئەمەریکا و دواخستنی مەسالحی عێراقە ـ بێجگە لەم باوەڕەی کاتێ کە لە تشرینی (١٩٥٦)دا فەرمانی کرایە سەر کە بەخۆی و لواکەیەوە ـ لوای (١٩) کە لە مەنسووریە بوون ـ بچێت بۆ وڵاتی «ئەردن» گۆیا بەناوی ئەوەوە کە لە «جوولەکە» بدەن!. کەچی لە ڕێگەدا سەیر ئەکا ئەمە وا نییە، بەڵکوو ئەمە لە مەعنادا بۆ یارمەتی «جوولەکە» و لە «میسر»دانە!. دیارە نەفسیەتی «عەبدولکەریم قاسم» بێزی لەمە دێتەوە و شتی واناکا.

لەو وەختەوە بەتایبەتی ـ ئەڵێم لەو وەختە بە دواوە، ئەگینا بەگەلێ ساڵ پێش ئەو وەختەش ئەو فیکرەی هەر هەبوو ـ کەوتە سەر فیکری ئەوە کە بەهەر جۆر بووە ئیشێکی وابکا، ئەم وڵاتە لەدەست ئەو گورگە خائنانە ڕزگارکا. فیکرێکی زۆر زل بوو کردیەوە، تەنها دڵە پڕ لە هێز و نهێنیەکەی [عەبدولکەریم قاسم] نەبێ کەسێکی‌تر ناتوانێ ئەو فیکرە لەدڵیا بە نهێنی بیڵێتەوە تا دێتە سەروبەری بەئەنجام گەیاندنی.!

کە لەو سەفەرەی گەڕایەوە و گەیشتە [ئێچ ـ سری] بڕیاری سەرەتای دەرخستنی شۆڕشێکی‌دا، بەڵام لەوێ بە باشی نەزانی چونکە سەیری کرد ئەوانەی کەوا ئەم داوە ناهەموارانە بۆ عێراق ئەنێنەوە ـ کە وەکوو عەبدولئیلاھ و فەیسەڵ و نووری سەعید و دەست‌وپێوەندەکانیان بن ـ هەموویان لەوێ نین. سەیری کرد ئەگەر هەندێك لەوانە بەرپەل کەون و هەندێکیان دەرباز ببن بێ‌گومان ئەو ئامانجە کە ئەو هەیەتی بە شۆڕش، بۆی پێك نایە. لەبەر ئەمە وازی لێ هێنا.

لەم ماوەیەدا هەر خەریکی تاقی‌کردنەوەی یەکە یەکەی ئەفسەرەکان بوو، خەریکی ئەوەبوو بزانێ ئایا کامیان لە مەحەك دەرئەچن. خەریکی ئەمەبوو بەبێ ئەوە سەرەتا باوەڕی خۆیشی لەلای یەکێك بدرکێنێ. لە نەتیجەی تاقی‌کردنەوەیەکی زۆرا توانی چەند ئەفسەرێکی زۆر کەم بدۆزێتەوە؛ لەو ئەفسەرانە کە جێگەی باوەڕ و سنگیان گۆڕێکی بێ‌دەنگە بۆ هەموو نهێنیەك!. ئەم چەند دانەیەش کە دۆزیەوە «مەرج» نەبوو کە ئەبێ هەر لەلواکەی ئەوابن. یا هەر یەکە لەلایەکێش بن مادام هەموویان هەر بۆ مەبەستێکی

پیرۆز کۆشش ئەکەن هەر وەکوو ئەوە وانە کە لەلای ئەو بن.

بە تایبەتی هەندێ لەوانەی کە من پێی بزانم و بەرە بەرە ئاگاداریان بەسەر نهێنیەکانی «عەبدولکەریم»دا پەیدا کرد و بەناوی «ئەفسەرانی ئازاد»ەوە ناوی نان ئەمانە بوون:

«فەریق نەجیب ڕەبیعی». ئەم پیاوە خۆشەویستییەکی تایبەتی لەناو سوپادا هەبوو وە بە دڵ هۆگری عەبدولکەریمیش بوو. هەرچەندە لە ڕۆژی گێڕانی شۆڕشەکەدا ـ ڕۆژی ١٤ی تەمووز ـ لە حیجاز بوو، بەڵام ئاگای لە هەموو کار و فرمانێکی کۆمەڵە هەبوو.

زەعیم ڕوکن محیەددین عەبدولحەمید، زەعیم ڕوکن ئەحمەد ساڵح عەبدی، زەعیم ڕوکن خەلیل سەعید، زەعیم فوئاد عارف، زەعیم حەسەن عەبود، زەعیم داود سەلمان جەنابی، زەعیم ناجی تالب. عەقید فازل عەباس مەهداوی، عەقید ماجد موحەممەد ئەمین، عەقید عەبدولکەریم جدە، عەقید موهەندیس ڕەجەب عەبدولحەمید، عەقید فەتاح شاڵی، عەقید ڕەفعەت حاجی‌سری، عەقید عەبدولوەهاب ئەمین، عەقید «شمس الدين عبداللّه»، عەقید «وصفی طاهر»، عەقید تاهر یەحیا، عەقید عادل جەلال، عەقید «عبداللطيف دراجي»، عەقید موحسن حسەین ئەلجیب، عەقید ڕەجەب عەبدولمەجید، عەقید عەبدوسەلام موحەممەد عارف، عەقید عەبدوڵلا سەعید[1].

موقەددەم «عبدالغنی عبدالستار»، موقەددەم موحەممەد مەجید، موقەددەم عەبدولکەریم فەرحان، موقەددەم شاکر مەحموود سلام، موقەددەم خزر حسەین دووری، ڕەئیس ئیبراهیم لامی، ڕەئیس «عبدالستار عبداللطيف»، ڕەئیس ئیبراهیم جاسم، ڕەئیس موستەفا عەبدوڵلا، ڕەئیس جاسم عەزاوی، ڕەئیس سەلیم فەخری، ڕەئیس سامر نورەددین.

بەڵێ ئەمانە سەرەتا بە گیانێکی پاکەوە لە ژێر ڕا و تەگبیری عەبدولکەریم قاسمدا پەلاماری پێك‌هێنانی شۆڕشی (١٤)ی تەمووزیان دا و ناوێکی پڕ لە شانازییان بۆ خۆیان وەرگرت. بەڵام داخەکەم زۆری پێ نەچوو هەندێك لەمانە ئەو ناوە پڕ لە شانازییەیان گۆڕیەوە بە ناوێکی پڕ لە نەنگی و لەککەداری و نووسانیان بەسەرشانی خۆیانەوە!..

بە قسە و پڕوپاگاندەی هەندێ لە پیاوە نەفعی پەروەرەکانی وڵاتی عەرەبستانی

١. عەبدوڵلا سەعید هەرچەندە بەراستە و ڕاست پێ نەوتبوو، بەڵام لەبەر ئەوە کە خۆی بەجێ بڕوای عەبدولکەریم قاسم ئەزانی و عەبدولکەریمیش ئەمەی ئەزانی وەکوو ئەوە وابوو کە پێی وتبێ.

غەیری عێراق کەوتنە بزووتنەوە و گزیکردن لە نیشانەکانی شۆڕشی (١٤)ی تەمووز!.. لێبووردنی «عەبدولکەریم قاسم» گەلێ زیاتر بوو لەوە، کە بە چاوی خەشمەوە ئاوڕ لەمانەبداتەوە. ئەو دەستەیە وایان ئەبردە دڵی خەڵکەوە، کە شۆڕشەکانی پێشووی عێراق و ئەمجارەش هەر لە کۆششی ئەمانەوە بووە و بەم قسەیە ئەیانویست وڵاتی عێراق ڕاکێشن و بیخەنە ژێر دەستی نەفعی پەروەرەکانی وڵاتی عەرەبستانی دەرەوەی عێراق!.. عەبدولکەریم قاسم هەر بەچاوی لێبووردن و میهرەبانییەوە سەیری کردن، ئەمەش بۆ ئەوە کە بەڵکوو ئەمانە لەم باوەڕە چەوتەی خۆیان بگەڕێنەوەو نەبێ بە ئاژاوە و ئاو لێڵکردن. ئەمانە هەر نەگەڕانەوە تا لە ئاخرا کردەوەی ناپەسەندی خۆیان ڕایکێشیان بۆ ئەوە تۆڵەی ناپیاوەتی خۆیان وەربگرنەوە!.

[عەبدولکەریم قاسم] هەر لایەنی هێمنی و لێبووردنی لەدەست بەرنەدا. کەچی لەناکاو، لە ڕۆژی (١٩٥٩/٣/٩)دا عەبدولوەهاب شەواف ـ کە وەختی خۆی یەکێك بوو، لە ئەفسەرانی ئازادی شۆڕشی (١٤)ی تەمووز ـ ئەو ناوە پڕ لە ئیفتخارەی پێ هەڵنەگیرا و بە پروپاگاندەی جەمال عەبدوناسری وڵاتی میسر، لە «مووسڵ» ئاگرێکی یاخی بوونی لە «عەبدولکەریم قاسم» و شۆڕشی (١٤)ی تەمووز هەڵگیرساند و ویستی ناوە پاکەکەی عێراق لەککەدار بکا!. ئەوەندە هەبوو عەبدولکەریم قاسم دەستی لە دەستی ئەو و لە دەستی یاریەدەرەکەی ئەو بەهێزتر و درێژتربوو، بۆیەش درێژتر بوو چونکە شەعبی عێراقی بە کورد و عەرەبە وەکوو پوورەی هەنگ دەوریان لێ داوە و بە پێشەوایەکی ڕاستی ڕاستەقینەی خۆیان ئەزانن، یەکێك ئەوەندە خۆشەویست بێ و لە هێلانەی دڵی هەموو کەسێکا بێ، بێگومان هەر بەهێز و سەرکەوتوو ئەبێ.

لە ئاخری ئەم کردەوە ناپەسەندەدا دەستەی عەبدولوەهاب و یاریەدەرەکەی بۆ ماوەی (٢٣) سەعات هەر ئەوەیان بۆ مایەوە کە ناوێکی نەنگباری و خیانەتکارانەیان بۆ هەتا هەتایی بۆ خۆیان وەرگرت و هیچیتر!.

* * *

عەبدولکەریم قاسم لە ناو ئەو ناوچە عەسکەریەدا کە ئەژیا پیاوێکی خۆشەویست بوو، لاپەڕەی ڕووناکی ژیانی هەموو ناوچەکەی کردبوو بە پەروانەی دەوری خۆی، لە هیچ کاتێکا

شتێکی وای لێوە دەرنەئەکەوت کە ببێ بە هۆی دڵڕەنجاندنی سەربازێك وە یا ئەفسەرێك. ڕواڵەت و کردەوە ڕواڵەتییەکانیشی وای پیشان ئەدا کە لەناو ئەفسەرانی سوپادا یەکێکی‌تر نییە وەکوو ئەو سەر بە بنەماڵەی پادشاهی و «نووری سەعید» بێ!. تەنانەت لەم ڕووەوە بووبوو بە شوێنی ڕەخنەی هەندێ لەو کەسانە کە ئاگاداری ناو پەردەی دڵی نەبوون.

ئەو قوتابیانەش کە لەم ماوەیەدا پێکیەوە نابوون ئەوانیشی هەر لەسەر ڕەوشتی خۆی فێری کردبوون، واتە لە ڕواڵەت و کردەوەیانا هەموو وایان ئەنواند کە هەتا ئەو پەڕی دڵسۆزییان هەیە بە بنەماڵەی شاهی!. کردەوە و بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی کە ئەیانکرد وا دیاربوو، تا (١٩٥٥) دەرزێکی تەواوی کۆمەڵەی نهێنیان نەخوێندبوو بۆیە «نووری سەعید» و دەستوپێوەندەکانی جۆرە هەستێکیان پێیان کرد و هەر یەکەیان دوور خستنەوە بۆ وڵاتێك. لە (١٩٥٦)دا دەرزیان لە هەڵەکانی پێشوو وەرگرت، ئەمجا ئەو ڕێگەیانە گرت کە باسمان کردن. بە هۆی گرتنی ئەم ڕێگەیەوە وردە وردە دڵی «نووری سەعید»یان پاك کردەوەو «کۆمەڵەی ئەفسەری ئازاد» بەرە بەرە بۆ، یەك، تێ‌کەوتن تا کۆبوونەوە وە یا، لێك نزیك کەوتنەوە.

ڕێگەی ئەم کۆمەڵە بێجگە لە «بڵاوکراوە»کەیان کە ناویان نابوو «دەنگی سەرباز» و لەساڵی (١٩٥٢)دا یەکەم ژمارەیان دەرکرد و تا ماوەیەك هەر لە سەری ڕۆیشتن، بێجگە لەوە نەیانویستووە هیچ شتێکی‌تری چاپکراویان هەبێ، بەتایبەتی کە هەموو دەرزەکانیان وەرگرت و لە هەموو هەڵەکانی پێشوو تێ‌گەیشتن هەر فەرمان و تەگبیرێکیان بووبێ هەموویان بە زمان بەیەك وتووە و نەیانویستووە بکەوێتە سەر قاقەز!. کەم‌جاریش ڕێ‌کەوتووە کە کۆبوونەوەیەکی نهێنی بۆ ئەم ئیشەی خۆیان بکەن، بەڵکوو زۆرتر شوێنی قسە و کۆبوونەوەیان لەنادی وە یا لۆقەنتەی ئەفسەران، وە یا ئەو دیواخانانە بووە، کە زۆرتر دانیشتووەکانی لە ئەفسەرانی غەیری ئەم کۆمەڵەیە بوون!. ئەگەر وەختی واش بووبێ لە کۆبوونەوەکەدا دەمیان نەگەیشتبێ بەیەك بەچاو وە یا بە ئیشارە فرمانەکەی خۆیانیان بەیەك تێ‌گەیاندووە. ئەمانەش هەموو عەبدولکەریم بەو جۆرە دەرزی داون و ڕێگەی بۆ داناون. هەر ئیشێك کەویستبێتیان بیکەن [عەبدولکەریم] نەخشەکەی کێشاوەو بەدەم بەیەکێکی وتووە و ئەویش بەیەکێکی‌تر، واتە وەکوو هەڵقەی زنجیر.

باوەڕ هەتا ئەهات قایمتر ئەبوو، هێزی عەبدولکەریم و ئەفسەرانی ئازاد ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر پەرەی ئەسەند. عەبدولکەریم هاتە سەر ئەوە کە ڕۆژی [٦ی کانوونی دووهەمی ١٩٥٨] ئاگری شۆڕش هەڵگیرسێنێ، دیسان لەبەر کۆنەبوونەوەی عەبدولئیلاھ و فەیسەڵ و نوری هەر سەری نەگرت. ویستی لە ڕۆژی کۆبوونەوەی دەرچوونی قوتابییەکانی کوللیەی جەنگدا بیگێڕێ، لێرەشا سەری نەگرت چونکە شازادەکان کۆنەبووبوونەوە.

❋ ❋ ❋

«نووری سەعید» و «عەبدولئیلاھ» بڕیاریان دا لیوایەکی دڵسۆزی سەربەخۆیان بچێت بۆ ئەردن، چوار مانگ لەوێ بێ و بگەڕێتەوە. چوونی ئەم لیوایەش لەبەر ئەوەیە کە گۆیا ئێستە عێراق و ئەردن بوون بە یەك و ئەبێ لە هەموو ڕوویەکەوە یارمەتی یەك بدەن، نەوەك لە حوکوومەتی ئەردندا دوژمنەکانی دەرەوەی تەبیەتیان تێك بدەن! ئەم لیوایە بچێت بۆ ئەوە کە ئەو دوژمنانە ئیتر نەوێرن فیکرێك بکەن!. ئەمە، شتێکی قانوونی بوو لەبەینی عێراق و ئەردندا کەس ناتوانێ ڕەخنە لە قانوون بگرێ!. کەوابوو ناردنی لیواکە، ئەبێ بەم ناوەوە بێ، بەڵام لە ژێرەوە وانەبوو، ناردنی ئەم لیوایە بۆ ئەوەبوو کە لە [لوبنان]دا یارمەتی «شەمعوون» بدا و نەیەڵن دوژمنەکانی «شەمعوون» دەستبزێوی بکەن، شەمعوون لە ژێرەوە لەگەڵ شا و شازادەی عێراق یەکێکە چۆن ئەبێ یاریدە نەدرێ؟!. ئەوەندە هەیە پەیمانێك لە بەینی عێراق و لوبنانا نییە هەتا بە ئاشکرا بتوانن یارمەتی بدەن، ئەگەر ڕاستە و ڕاست بڵێن چوونی ئەم لیوایە بۆ لوبنانە قسەوباس لە لایەن «شەعب» و نەیرووەوە پەیدا ئەبێ، بەڵام بوترێ بۆ ئەردنە ئاو ئەکرێ بە ئاگرا و هیچ قسەیەك پەیدا نابێ!..

لە ڕۆژی [١٠ ـ ١١ی تەمووزی ١٩٥٨]دا عەبدولئیلاھ لەلایەکەوە و نووری سەعید لەلایەکەوە لە ئەستەمۆڵ بوون. نووری لەگەڵ حوکوومەتی ئەستەمۆڵدا قسەی تەواو کرد، کە لە ڕۆژی (١٤)ی تەمووزدا بۆ پەیمانی بەغدا ئەندامە هەرەزلەکانی حوکوومەتانی هاوبەش لەوێ کۆببنەوە و بۆیەیەکی قەتمەرتر بەسەر پەیمانی بەغدادا بێنن، دوور نییە بۆ کوشتن و لاتکردنی عێراق بێ ئەوەندەیتر!.

هەر لەو ڕۆژەوە شەقامی ئیستقلالی ئەستەمۆڵ ڕێك خرا، بەیداخەکانی ئێران،

پاکستان، عێراق، تورکیا، ئەمەریکا و ئنگلترەی پێیا هەڵواسرا. تەنانەت گسکێشیان لێدا!.. فەوجی پاسەوانی شەرەفی تورکی تاس‌ولووسی خۆیان‌دا بۆ پێشوازی کردن، فڕۆکەخانەی ئەستەمۆڵ کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی «تورکیا» و حوکوومەتانی هاوبەشی پەیمانی بەغدا تێدایا کەوتنە جرت و فرت!.

ئەوە ئەوان لەوێوا، لەم‌لاوە «نوری» و «عەبدولئیلاه» گەڕانەوە خۆیان ئامادە کرد کە ڕۆژی (١٤)ی تەمووز لە سەعات (٧)ی بەیانی‌دا بە فڕۆکە بفڕن و سەعات دەبگەنە ئەستەمۆڵ، چونکە لەوێ لەو وەختەدا پێشوازی‌کەرانی حوکوومەتانی هاوبەشی پەیمانی بەغدا و فەوجی پاسەوانی شەرەفی شەقامی ئیستقلال چاوەڕێی مەوکبی ملووکانە ئەکەن!.. مەوکبی ملووکانەش عیبارەتە لە فەیسەڵ پادشای عێراق و لە عەبدولئیلاه وەلی‌عەهدی ئێستەی عێراق و شای پاشەڕۆژی سووریا!. وە لە نووری سەعید ڕەئیسی وزەرای یەکیەتی عێراق و ئەردن و دەست و پێوەندی ئەمانە.

ئەمانە بەم جۆرە هەموو خۆیانیان ئامادە کرد و فڕۆکەخانەی بەغدا بە خۆی و بە فڕۆکەی پادشاهییەوە شەوی (١٤)ی تەمووز هەر لە خۆ ڕێك‌خستنا بوو لەگەڵ فەوجی پاسەوانی شاهیدا، لەگەڵ وزەرا و پیاوماقووڵانی سەربەدەرەوە بووەکانی کۆشکی «رحاب». ئەمانە هەموو خۆیان ئامادە کرد بۆ ئەوە بەیانی سەعات (٧) «مەوکبی ملووکی» بەڕێ‌کەوێ، وەکوو چۆن وزەرا و پیاوەکانی [ناپلیۆن] لە پاریس ناپلیۆنیان بەڕێ ئەکرد بۆ فەتحەکانی ئەڵەمانیا و نەمسە و ڕووسیا بۆ فەرەنسە ئەمانیش وابوون!!.. «تفو باد بر چرخ گردون تفو!!.».

❋ ❋ ❋

«نووری سەعید» فەرمانی دەرکردبوو، کە لە شەوی (١٤)ی تەمووزدا لوای (١٩) بچێت بۆ ئەردن بۆ یاریەدانی وڵاتی ئەردن. فەرمانێکی‌تر کرایە سەر «عەبدولکەریم قاسم» کە چەك و جبەخانە و ئازۆخەیەکی تەواو بۆ ئەم لیوایە وەربگرێ. مەرکەزی لیواش لە «جەلەولا»یە، هیچ ڕێگەیەکی نییە بۆ ئەردن غەیری ناوشاری بەغدا نەبێ. وا دیاربوو «نووری سەعید» بۆیە وتبووی بەشەو بڕۆن نەیئەویست ئەم هێزە بە ڕۆژا بەناوشاری بەغدادا بڕوا و خەڵکی لەبەر خۆیانەوە دەست بکەن بە قسەکردن، چونکە هەر لە بناغەدا شەعبی عێراقی دلگران بوون لەم ڕێکەوتنەی بەینی عێراق و ئەردنە، جا لەبەر ئەمە قسەی زۆر لێ ئەبووەوە.

[عەبدولکەریم قاسم] وەکوو لە پێشا زانیمان زۆر دەمێك بوو داخ لەدڵ بوو و کەللەی بۆ شۆڕشێك تەمی ئەکرد. لێرەدا کەوتە فیکر کردنەوە کە ئایا واز لەم باوەڕەی بێنێ ئێستە، یان هەلیەتی و نابێ هەل لەدەست بدا؟. لەلایەکەوە فیکری ئەوەی ئەکردەوە. کە «عەبدولئیلاه» و «نووری سەعید» دەمێ ساڵە خەریکن و بە هەزاران وە بەڵکوو بە ملیۆن ژێر دەستە و هەواخوایان لە سوپا و لە ئەهالی پەیدا کردووە و ئەمیش هێزێکی وای نییە کە چاری ئەو هەموو پشتیوانانەی ئەوان بکا. کەچی هەر لە عەینی وەختیشا ئەهات بە دڵیا کە زۆر و ستەمی «عەبدولئیلاه» و «نووری سەعید» لە ماوەی ئەم چەند ساڵانەی ڕابردوودا ئەوەندە زۆر بووە دڵی هەموو کەسێکی بریندار کردووە، ئەوانەی کە وا ئێستە ئەڵێن «سیدنا» و «پاشا» لەبەر ناچاریە وا ئەڵێن ئەگینا بێجگە لە هەندێ کاسەلێس بڕوا ناکرێ ئەم شەعبە پشتیوانیان بکەن.

ئەمە و شتێکی‌تریش؛ ئەوەش تا ئێستە لە تاریخی ئەم حوکوومەتەدا ڕێ نەکەوتووە فەیسەڵ و عەبدولئیلاه و نووری سەعید و دەست‌وپێوەندەکانیان لە شەوێکی وەکوو (١٤)ی تەمووزدا هەموو لە بەغدادابن و هەموو بەو جۆرە کۆببنەوە!. ئەگەر هیچ نیشانەی سەرکەوتن نەبێ کۆبوونەوەی ئەمانە هەموو نیشانەیەکە بۆ سەرکەوتنی شۆڕشە پیرۆزەکەی. پاش ئەم خەیاڵانە بڕیاری‌دا و وتی:

سـأمضي فما بالموت عار على الفتى     إذا مـا نـوى حقـا و جاهد مسـلما
وواسـى الرجـال الصالحيـن بنفسـه     وفـارق مذمومـا و خالـف مجرمـا
فإن عشـت لم أذمم و إن مت لم ألم     كفـى بـك ذلا أن تعيـش و ترغمـا

هەر لە ڕۆژی [١٠ی تەمووزی ١٩٥٨]دا بڕیاری شۆڕشی‌دا و ئەفسەرە هەواخواکانی خۆی تێ‌گەیاند و هەموو تەرتیباتێکی بۆ دانان و ئەوی شایانی ڕێگە دانان و دەرزی سەرلەشکرێك بێ، هەمووی پێ‌وتن. نە عەبدولکەریم خۆی تێك‌دا، نە هەواخواکانی، بە لەسەرخۆیی و بەبێ شڵەژان کاروباریان جێ‌بەجێ ئەکرد. ئەگەر یەکێك لە غەیری ئەفسەرانی ئازاد شتێکی غەیرە ئیعتیادی لێوە ببینیایە ئەیانوت «سەیدنا خەریکی سەفەری خێرە بۆ ئەستەمۆڵ، ئەبێ تەرتیبات بکەین بۆ ئەو!.». بەمە پێنەیان ئەکرد!.

هەتا ئەم دەقیقەیە فەرمان لەلایەن سەرلەشکری گشتییەوە (عەبدولکەریم قاسم) هەر بەزمان بوو بۆ سەرئەفسەرانی ئازاد، لەوانیشەوە دیسان هەر بە زمان بوو بۆ سەرخوارووتر، هیچی نەچووبووە سەر قاقەز، وەکوو لەبەرکردنی منالّی کە قەت لەبیر ناچێتەوە ئەمانیش فەرمان و ڕێگە و شوێنی جەنگییەکەیان ئاوا لەبەر کردبوو.

لە پاش ئەوە هەرکە فرمانی خۆی زانی و بەڕێکەوتن ڕوو بە بەغدا، لە سەعات [١١ی شەوی ١٤ی تەمووز]دا «عەبدولکەریم قاسم» و هاوڕێکانی ڕوویان کردە شوێنی قیادە لە وەزارەتی دفاع. ئەو ئەفسەرەی کە نۆبەتچی مەقەڕی قیادەبوو لەهەواخواکانی «عەبدولکەریم»بوو، بە هۆی ئەوەوە دایەرەکانی وەزارەتی دفاع شکێکیان بە هیچ نەبرد. لە «مقری قیادە» دانیشتن و لە سەعات (١٢)دا ئەوشتانە کە ئەبوا بکرانایە ئەو شەوە ئەفسەرەکانی ئەوێ فەرمانیان لە [عەبدولکەریم] وەرگرت و بەمەکینەی دەستی لەچاپیان‌دا و خێرا بەسەر لق و پۆپی لەشکرەکەی خۆیانا بڵاویان کردەوە.

ئەو ئیشانەی کە ئەوشەوە ئەبوایە بکرایە: گرتنی «قصر الرحاب»، قەسری نووری سەعید، ئێستگەی ئیزاعە، دایەرەی تەلەفۆن و تەلگراف، بڕینی خەتی تەلەفۆن و تەلگراف لە ماڵی عەبدولئیلاه و نووری سەعید و وەزیرەکان، گرتنی هەموو وەزیر و هەواخواکانی «عەبدولئیلاه» و «نووری سەعید»، گرتنی کۆشکی مۆدیریەتی پۆلیسی گشتی، گرتنی مۆدیرەکەی و سەرۆکی ئەرکانی سوپا. گرتنی پردەکانی ناوشاری بەغدا و ئەو شوێنانە کە مەترسی لێ ئەکرێ. وریابوون بۆ گرتنی هێزی پۆلیسی سەیار. ئەمانە ئەبێ تا سەعات (٦)ی بەیانی هەموو بگیرێن بەبێ ئەوە یەکێك لەیەکێ بکەوێ وە هەرکەسە شوێنی ئیشی خۆی بۆ دانرا. وە ئەمانە هەموو بە هۆی تەلسزەوە ئەبێ دەقیقە بەدەقیقە و هەنگاو بە هەنگاو کارەساتی خۆیان بە «عەبدولکەریم قاسم» بگەیەنن لە وەزارەتی دفاع، ئەمیش بە پێی پێشهات فەرمانیان بەسەرا بڵاوکاتەوە.

ئەم فەرمانانە جێ‌بەجێ کرا و دەنگ نەکرا تا هەموو بارەگا و دیواخانێك خەوی لێ کەوت و ئەوی لە ڕابواردنی شەوا بوو گەڕایەوە ماڵی خۆی، واتە بوو بە سەعات سێ پاش نیوەشەو، دنیای بەغدا پەردەی خامۆشی بەتەواوی بەسەر خۆیا کێشا بۆ ئەوە لە پاش سێ سەعاتی‌تر پەردەیەکی شۆڕش پیشان بدا!.

بەرە بەرە دەستەکان هەر کە چوون بە شوێن ئیشی خۆیانەوە. هیچ دەنگێك نەبوو تەنها دەنگی چەك و ڕۆیشتنی سەربازانی ئازا نەبێ بۆ ڕزگارکردنی وڵات لە دیلیەتی چەند ساڵە!. ئەوانەی تەلەفۆن برینیان پێ سپێرابوو ئیشی خۆیانیان کرد، ئەوانەی گرتنی دایەرەی تەلەفۆن و تەلگرافیان پێ سپێرابوو ئیشی خۆیانیان کرد، ڕێگەکان و پردەکان گیرا، ئابلۆقەی ئەو ماڵانە ـ کە ئەبێ خاوەنەکانیان بگیرێن ـ درا. بەڵام ئەمانە هەموو بە بێدەنگی چونکە ئیشی هەرەزل ماوە؛ کۆشکی ڕیحاب و نووری سەعید و ئێستگە ماوە.

دەستەکانی ئەو شوێنانەش بەڕێکەوتن، لە سەعات (٤)دا ئابلۆقەی کۆشکی عەبدولئیلاھ «قصر الرحاب» درا، بڕیار وابوو «عەبدولئیلاھ» و «فەیسەڵ» بگیرێن، [فەوجی حەرەس] بە هەموو چەکێکەوە لە «قصرالرحاب» دابوو، ئامری فەوج [تاھا با مەڕنی] بوو. دیارە کە ئەمانە پەلامار ئەدەن دەرکەوان و نۆبەتچی نایەڵن. ئەمان داوای ئامر فەوج ئەکەن، لە ئاخرا ئامریان دەست ئەکەوێ و پێ‌ئەڵێن شۆڕش بووە و ئەبێ «عەبدولئیلاھ» و «فەیسەڵ» هەردووکیان لە تەختی پادشایی بێنەخوارەوە و تۆ ئەم فەرمانەیان پێ بگەیەنە. «ئامری فەوج» کە چاك ورد ئەبێتەوە سەیر ئەکا چوار دەوری کۆشك گیراوە!. ئەچێ «عەبدولئیلاھ» لەخەو هەڵئەستێنێ و پێی ئەڵێ. عەبدولئیلاھ لەم قسەیە تووڕە ئەبێ و پێی ئەڵێ بچۆ بەرەنگاریان بن تا هەواخواکانی ئێمە ئەگەن. کە دەست ئەدەنە تەلەفۆن و شتە سەیر ئەکەن هەمووی بڕاوە. ئامر ئەگەڕێتەوە و ئەیەوێ فەوجەکەی خۆی بخاتە شەڕەوە، پاشان دەستەی شۆڕش تێ‌ئەگەیەنن کە بەرانبەری کردن کەڵکی نییە و واز لەخۆی بێنێ، ئامر لە فیکرەی خۆی پەشیمان ئەبێتەوە و شۆڕش‌گێڕەکان ئەچنە ژوورەوە. لە سەعات (٥/٤٥) دەقیقەدا قاپی پشتی کۆشك ـ کە بەرەڵابوو عەبدوڵڵا سەعید بە خۆی و تۆپەکانیەوە ئەویش ئەو قاپیە ئەگرێ.

سەیر ئەکەن «عەبدولئیلاھ» و ئەو دەست‌وپێوەندە کە لەوێن بە [مەترەلۆز] ئەکەونە تەقە، لە، شۆڕش گێڕەکان، ئەمان هەر کۆششی ئەوە ئەکەن کە بەڵکوو فەیسەڵ تەخت بداتە دواوە. ئەمە سەرناگرێ ئەمجا «قصرالرحاب» ئەدەنە بەرتۆپ، ئەفسەر «موستەفا عەبدوڵڵا» و «عبدالستار» ئەچنە ژوورەوە. گۆیا «فەیسەڵ» ویستوویەتی چی شۆڕش گێڕەکان ئەیڵێن ئەو وا بکا، عەبدولئیلاھ کوشتوویەتی، وەهەر بە گوللەی عەبدولئیلاھ و خزمەتچیەکان چەند

ئەفسەر و سەربازێکی شۆڕش گێڕەکان بە کوژراوی و بریندار ئەکەون. کە ئیش ئەگاتە ئەم شوێنە ئەمانیش مەترەلۆزیان تێ ئەگرن و ئەوان ئەکوژن. پاشان لەناو کوژراوەکانی «قصرالرحاب»دا لەشی دوو ئافرەتی تیاترۆی فەرەنسی و ئینگلیزیش ئەبینرێتەوە!. تا ئەمانە کرا سەعات بوو بە شەش بەڵام تەقەی «قصرالرحاب» هەر ئەهات.

ئەو دەستەیە کە ڕوویان کردە ئێستگە و ئەفسەرەکەیان لە ئازادەکان بوو بە جۆرێکی ئاسانی ئێستگەیان گرت و لە سەعات (٦)دا «عەبدوسەلام» چووەسەر ئێستگەو وتی: «ئێرە کۆماری عێراقە» و هانی شەعبی‌دا کە بچن بۆ «قصر الرحاب» لاشەی کوژراوی «عەبدولئیلاه» ببینن کە ساڵەهای ساڵە بۆی تینوون!.

ئەوانەی کە ڕوویان کردە کۆشکی «نووری سەعید»، کۆشکیان دایە بەر گوللە، لەگەڵ ئەو هەموو پاسەوانە کە تێدابوو چوونە ژوورەوە، کە ئەچن نووری دیار نییە. بەمە زۆر شڵەژان. تومەز نووری کە ئەزانێ وایە و دەست ئەداتە تەلەفۆن ئەویش بڕاوە، تێ ئەگا کە ئەمە شۆڕشە و ڕۆژەکەیە کە جار جار فیکری لێ ئەکردەوە!. کۆشکەکەی لەسەر ڕووباری دجلەبوو، بە پەلە پڕۆزێ و بەجلی شەوەوە ئەچێتە ڕووبارەکەو بە هۆی «بەلەم»چییەکەوە دەرباز ئەبێ و ڕوو ئەکاتە «کازمەین» و شەوێك لەوێدا ئەمێنێتەوەو پاشان ئەگەڕێتەوە بۆ بەغدا بۆ «کەڕادە» و ڕۆژی دوایی ئەگیرێت و پارچە پارچە ئەکرێت!.

کە ئەو سێ شوێنە گیرا «قوەی سەیار»ی پۆلیس کە لە «ساڵحیە» بوو بەچەند سەربازێکی کەم ئەگیرێت و وردە وردە شوێنەکانی‌تریش ئەگیرێن.

ئیشی هەرەزل ئێستگە کردی؛ کە بڵاوی کردەوە شۆڕش بووە و «عەبدولئیلاه» کوژراوە و وڵات بووە بە جمهووریەت. لەمە ئەو نەیرووە کە ئاگایان لە هیچ نەبوو و هەواخوای بنەماڵەی شاهی بوون هەموو شڵەژان و وتیان مادام دەور و دووکان تێکچووە دیارە ئەمە هێزێکی زل هەیە ئێمە بەرانبەریمان پێ ناکرێ، خۆیان دا بە دەستەوە. مەسەلێکی کوردی هەیە ئەڵێ: «ئەوی خاوەن ماڵ ئەیزانێ ئەگەر دز بیزانێ هیچ لە ماڵا نایەڵێ!.». هێزەکانی‌تر ئەگەر ئەیانزانی هێزی شۆڕش گێڕەکان لە چاو هێزی ئەوانا ئەوەندە کەمە نەیان‌ئەهێشت کە شۆڕش سەربگرێ. بەڵام ئەبوا ئەوەشیان بزانیایە کە هێزی شۆڕش‌گێڕەکان هێزێکی خوایی بوو. خوا ئەیەویست بە شۆڕشی [١٤ی تەمووزی

١٩٥٨]ی «عەبدولکەریم قاسم» لە عێراقا دوایی بەپەردەی زوڵم و جەوری ئەو زاڵمانە بێنێ، کە هەموو چارەنووسێکی ئەم شەعبەیان بەلاوە لە هیچ کەمتر بوو...

هەر لەگەڵ ئەمانەدا وەزیرەکان و ئەفسەرە گەورەکان ـ کە سەربەدەوری پێشوو بوون لەگەڵ گەلێ کەسی‌ترا گیران و نەهێڵران هەنگاو بنێنە بەر هەنگاو!. «نووری سەعید» کە (٢٧) ساڵ (٨٠) هەزار جاسووسی بەخێو کرد نەیانتوانی کنەیەك، سەرەدەزوێك لەشۆڕشە پیرۆزەکەی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق بکەن و بدۆزنەوە! و نەیانتوانی لە تۆزێ لەناو دڵی عەبدولکەریم قاسم بگەن!.

کەوابوو ئەو شۆڕشە هێمنە کە لاپەڕەی ئاسمانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و خوارووی گۆڕی و بوو بە عنوانێکی هەرەزل لە لاپەڕەی تارێخی شۆڕشەکانی عالەما شۆڕشێك بوو کە لە ماوەی ـ ئەگەر ڕاستیت ئەوێ ـ سێ سەعاتا لە [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨] لە عێراقا بەسەرکردەیی «عەبدولکەریم قاسم» ڕوویدا و هیچی‌ترا!.

لە سەعات [١٠ی ڕۆژی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨] لە عێراقا شاری شۆڕش بوو، کەچی لە شاری ئەستەمۆڵدا کە بەتەمای «مەوکبی ملووکی» عێراق بوون بگاتە ئەوێ!. ـ شەقامی ئیستیقلال ـ ئالاکانی تێکدا و خەبەری ماتەمی بردەوە بۆ بارەگاکانی «تورکیا و ئێران و پاکستان و ئینگلیز و ئەمەریکا!!.».

* * *

لە سەعات (٧)ی بەیانی [١٤ی تەمووزی ١٩٥٨] لە ئێستگەی بێ‌تەلی بەغدادا بڵاو کرایەوە کە دەوری ملووکیەت و پادشایەتی ـ ئەو ملووکیەتە، کە لە سەعات (٧) ی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی [١٣ی تەمووزی ١٩٥٨]دا بە خەیاڵیانا نەئەهات کە هێزێك لە عالەما هەبێ تا هەزار ساڵی‌تر بتوانێ لایبەرێ ـ لە عێراقا بەسەرچوو حوکوومەتی عێراق بوو بە حوکوومەتێکی «کۆماری ـ جمهوری». تا کەوتە سەعات هەشتی ڕۆژی (١٤) دیواخانێك بە فەرمانی قائیدی گشتی قواتی موسەللەحە دانراو ناونرایە «مجلسی سیادە» و ئەندامەکانی عیبارەت بوون لە:

(١) فەریق ڕوکن نجیب ڕەبیعی ـ سەرۆك. (٢) موحەممەد مەهدی کبە ـ ئەندام. (٣) خالد نەقشبەندی ـ ئەندام.

هەر لەوکاتەدا ئێستگە بە فەرمانی مجلسی سیادە بڵاوی کردەوە کە دیوانی وزەرای کۆماری دانرا و ئەندامەکانی عیبارەت بوون لە:

[عەبدولکەریم قاسم ڕەئیسی وزەرا و وەکیلی وەزیری دفاع. ئەمە بێجگە لەوە کە قائدی قواتی عامی موسەللەحەیە، عەبدوسەلام موحەممەد عارف نائب ڕەئیسی وزەرا و وەکیلی وزیری داخلە. موحەممەد حەدید وەزیری ماڵیە. عبدالجبار جومرد وەزیری خارجیە. موستەفا عەلی وەزیری عەدلیە. ئیبراهیم کبە وەزیری ئیقتیساد. جابر عومەر وەزیری مەعارف. زەعیم ڕوکن ناجی تالب وەزیری شوئوونی ئیجتیماعی. بابەعەلی شێخ مەحموود وزیری ئەشغال و مواسەلات. موحەممەد ساڵح مەحموود وەزیری سیححە. هودەیب حاجی مەحموود وەزیری زەراعە. فوئاد ڕیکابی وەزیری ئیعمار. سدیق شونەیشل وەزیری ئیرشاد.

لە ڕۆژی [٢٧ی تەمووزی ١٩٥٨]دا «مەجلیسی سیادە» و «مەجلیسی وزەرا» کۆبوونەوە و دەستووری وەختی (موقت)یان دانا بۆ کۆماری عێراقی و بەم دەستوورە قانوونی ئەساسی عێراقی کە لە (١٩٢٠)دا کرا بوو حوکمی لابرا و ئەم دەستوورە نیشتە شوێنی ئەو. دەستووری وەختی عیبارەت بوو لە (٤) باب و لە (٣٠) بەند. بابی یەکەم کۆماری عێراق. بابی دووهەم سەرچاوەی حوکم و حقووقی گشتی. بابی سێیەم یاسای حوکم. بابی چوارەم ئەحکامی ئینتیقالی.

بەرە بەرە کۆماری عێراق کەوتە قایمکردنەوەی ئاشنایەتی خۆی و حوکوومەتەکانی گێتی، کەوتە دامەزراندن و دروستکردنی کاروباری ناوەوە. کەوتە دیوانێکی بەرزی عەسکەری لە ژێر سەرۆکی عەقید فازل عەباس مەهداوی بۆ موحاکمەکردنی پیاوانی سیاسی دەوری پێشوو. کەوتە بەرەڵا کردنی حەپسە سیاسییەکانی دەوری پێشوو. ئەمانەش کە هەر شتێك ئەکرا لە ژێر فەرمانی پێشەوای شۆڕش عەبدولکەریم قاسمدا ئەکرا.

وەکوو بارانی بەهار تەلگرافی حوکوومەتەکانی دنیا ئەباری بە سەر «عەبدولکەریم قاسم»دا و پشتیوانی و ڕەزامەندییان پیشان ئەدا بەرانبەر بەم کۆمارە تازەی عێراقە. هەروەها لە ناوەوەی عێراقەوە، لە شیمال و جنووبەوە تەلگراف و شەعب لە لایەن هەموو دەستەیەکەوە ڕووی ئەکردە بەغدا وە وەفدەکان ئەچوون بۆلای [عەبدولکەریم] و پێ خۆشبوون و ڕەزامەندیی خۆیان بەرانبەر بە بزووتنەوەکەی و بە کۆماری تازە پیشان ئەدا.

بەم جۆرە و لەسەر ئەم وێنەیە بە هۆی کۆششی عەبدولکەریم قاسمەوە شۆڕشی (١٤)ی تەمووزی ساڵی (١٩٥٨)ی عێراق دەزگا و دووکانی پادشایەتی پێچایەوە و عێراق بوو بە حوکوومەتێکی کۆماری و دەنگی بە هەموو عالەمی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بڵاوبووەوە.

❁ ❁ ❁

زۆر لە مێژە کورد و عەرەب پێکەوە لەم وڵاتەدا ئەژین و شان بە شانی یەك لە هەموو شتێکدا هاتوونەتە خوارەوە، لە دەورەکانی عەباسیدا پێکەوە کاروباری ـ ئەوی پێیان کرابێ ـ بنەماڵەی عەباسییان هەڵسووڕاندووە، لە ڕۆژەکانی عوسمانیدا لە شایی و شینی ئەو دەوڵەتەدا هاوبەش بوون، لە زەمانی حوکوومەتی پێشوودا هەردووکیان لە ژێر یەك جەورا ـ بە دەست پیاوەکانیانەوە ـ تلاونەتەوە. ئەو دەورانە و ئەو بنەماڵانە هەموو ڕۆیشتن و کورد و عەرەب هەر مانەوە!. لەم تاریخانەدا ئەوی، زۆر تێدایا هاوبەش بووبێتن چەوساندنەوە و پەریشانی بووە، بەڕاستی لەم ڕووەوە وەکوو یەك شانیان دابووە بەری و ئەرکێکی زلیان هەڵگرتبوو. دیارە هەموو شتێك دوایی هاتنێکی هەیە.

بە تایبەتی لەدەوری پێشوودا شتێکیان دانابوو ناویان نابوو «قانوونی ئەساسی». ئەم قانوونی ئەساسییە لەمەرەکەبەکە بەولاوە ـ کە کەوتبووە سەر قاقەزەکە ـ هیچ نموودێکی تری نەبوو!. ئەمجا هاتبوون لەسەر ئەمە قەوانین و یاسایتریان دروست کردبوو. ڕاستە ئەمانە ئیشیان پێ ئەکرا بەڵام بەرانبەر بە کێ و بەسەر کێدا ئەتوێنرانەوە؟. بەسەر پیاوی هەژار و بێدەسەڵات و کەساسا!!. بەسەر ئەوانەدا کە ئەگەر خوانەکردە قسەیەکی ڕاستیان بەرانبەر بە خاوەن حوکمێك بکردایە خێرا بەداری قانوونەوە لێ ئەهاتنە دەست و ئەیانوت، ئەم قسەی تۆیە پێچەوانەی قانوونە و قانوون وا نافەرموێ!. بە داری ئەو قانوونە ـ کە خۆیان ئەیانفەرموو وا ـ پشتی کابرایان ئەشکاند و دایان ئەڕزاند!.

بەڵام خاوەن حوکمەکان و خاوەن دەسەڵاتەکان ئەوان خۆیان لە ژوور قانوونەوەبوون؛ خەڵکیان ڕووت بکردایەتەوە، ماڵیانیان زەوت بکردایە، حەپسیان بکردنایە، بەرتیلیان لێ وەربگرتنایە هیچ قانوونێك نەبوو، کە موحاسەبەی ئەوان بکا، چونکە ئەوان لە ژوور قانوونەوەن!. قانوون ئەیفەرموو فلانە بەگ، وە یا فلانە شێخ، وە یا فلان وەزیر ئەفەنی! ئەوەندە و ئەوەندە هەزار دیناری ماڵی «زەریبە»ی کەوتۆتە لا، لەبەر ئەوە کە

ئەم جۆرە قەرزانە لەو قەرزانەن، کە دەست ناکەونەوە بڕیاری دا ـ واتە قانوون ـ قەڵەمی لێخۆش‌بوونی بەسەرا بکێشرێ!. لەوەختێکا کە کابرای بەقاڵ وە یا کابرای تۆڕفرۆش لەبەر ئەوە کەوا نیو دینار «زەریبە»ی لەسەرە بە فەرموودەی قانوون حوکم درا و حەپس کرا!!...

ئەمە نموونەیەك بوو لە لق‌وپۆپەکانی «قانوونی ئەساسی» دەوری پێشوو کە کوردێك و عەرەبێك وەکوو یەك وابوون تیا!.

لە نەتیجەی ئەو زوڵم و زۆرەبوو کە پاڵەوانی نەترسی شۆڕش «عەبدولکەریم قاسم» شۆڕشە بەناوبانگەکەی [١٤ای تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراقی گێڕا و ئەو دەور و دووکانەی تێکدا و سەرەولێژی کردەوە.

[عەبدولکەریم قاسم] ئەم ئیشەی کرد، هەموو شەعب پشتیوانیان کرد، ئەم ئیشە پیرۆزەی کرد بە هۆی پشتیوانی‌کردنی شەعبی عێراقیەوە، بەهۆی کوردی عێراقەوە، بە هۆی عەرەبی عێراقەوە. وەکوو پێشەوای شۆڕش گیانی خۆی خستە سەردەستی، ئەفسەرانی کورد و عەرەب و سەربازانی کورد و عەرەب و شەعبی عەرەب و کوردی عێراقیش گیانیان خستە سەردەستیان بۆ فیداکارییە پیرۆزەکەی عەبدولکەریم، بۆ عەبدولکەریم!.

عەبدولکەریم قاسم عێراقی لە دیلیەتی ڕزگار کرد، شەعبی عێراق ئەمەیان لە فیکر ناچێتەوە، وەکوو ئەویش شەعبی عێراقی لە فیکر ناچێتەوە. شۆڕشی [١٤ای تەمووزی ١٩٥٨]ی عێراق دنیای ئیمڕۆژ و دنیای پاشەرۆژ تەنها لە «عەبدولکەریم قاسم»ی ئەناسی و لە شەعبی عێراقی؛ ئەو شەعبە کە عەبدولکەریم و ئەفسەرە ئازاکانی و سەربازە نەترسەکانی هەموو لەو شەعبەن. تەنها ئەمان کردنیان کەسی‌تر نەیکرد.

کورد و عەرەب لە عێراقا وەکوو لە دەورە پڕ جەور و ستەمەکانی پێشوا شان بە شانی یەك ڕۆیشتوون، لەم دەوری کامەرانی و ئازادیەشا هەر ئەڕۆن و ئەبن بە پەروانەی دەوری [عەبدولکەریم قاسم]. کورد تا ئەم ڕۆژە هیچ درێغیەکی لە عەبدولکەریم قاسم و لە قایم‌کردنەوەی کۆماری عێراق نەکردووە لەم ڕۆژەش بەدواوە نایکا چونکە ئەم خاکە و ئەم کۆمارە بە هی خۆی ئەزانێ، بۆیە درێغی ناکا و بەهی خۆی ئەزانێ چونکە بەندی (٣) لەبابی یەکەمی دستوورەکاتییەکەی کۆماری عێراق ئەڵێ:

«کەیانی عێراقی لەسەر ئەساسی یارمەتیدانی هەموو دانیشتووەکانی دائەمەزرێ،

ئەمەش بەوە کە ئیحتیرامی حقووقیان بگیرێت و ئازادییان بپارێزرێت. عەرەب و کورد هاوبەشن لەم نیشتمانەدا. ئەم دەستوورە لە ناو یەکیەتی عێراقیدا دان بە هەموو حقووقێکی کورددا ئەنێ.!».

ئەم بەندە لە دەستووری وەختی کۆماری عێراقا گەلێ جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو بەندانەدا کە لە «قانوونی ئەساسی» عێراقی پێشوودا هەبوو. بەندەکانی ئەوێ حوکمەکەی «أرستقراتی» بوو؛ واتە چەند کەسێك مەفهوومی ئەو بەندانەیان ئەکرد بە بەهانە و بەو هۆیەوە کورسییەکانی وەزارەتیان دائەگرت، ئەمجا بە خۆیان و بە حوکم‌دانەرەوە شەعبەکەیان ئەپلیشاندەوە!. ئەگەر یەکێکیش بیوتایە کوا مەفهوومەکانی قانوونی ئەساسی بەرانبەر بە کورد؟. خێرا پێی ئەوترا: «کوردە! چیت ئەوێ؟. قانوونی ئەساسی وەزیر و نائیبی داویتێ. ئەوا وەزیر و نائبت هەیە داوای حقووقت بۆ ئەکەن!.».

ئەمەیان پێ ئەوت و ڕاست بوو وەزیر و نائبیش هەبوو، بەڵام جارێ بێجگە لەوە کە حقووقەکە هەر ئەوەندەبوو کە وەزیر و نائیبە - زۆرتر زڕەکوردەکانی پێ بىن بە وەزیر و نائیب - بۆ خزمەت‌کردنی گیرفانی خۆیان و ئاغاکانیان!. بێجگە لەمە وەزیر و نائیبەکان لە کۆشکە بەرز و ڕەنگاوڕەنگەکانی خۆیانا بە جۆرێ بە چوار مشقی دانیشتبوون هیچ گەورە و بچووکێکی شەعب - ئەگەر دووربینیشیان بەدەستەوە ببوایە - هەر بەرچاویان نەئەکەوتن. وەکوو ئەمان ئەوانیان بەرچاو نەئەکەوت ئەوانیش بێزیان نەئەهات سەیرێکی ئەمان بکەن!.

ئەمە بوو مەفهوومی «قانوونی ئەساسی» دەوری پێشووی عێراق بەرانبەر بە کورد. بەڵام دەستووری کۆماری عێراقی ئیمڕۆ ئەو قانوونەی پێشووی سەرەولێژ کردەوە و بەهەموو ئاشکراییەك حەقی بە هەموو تاقە کوردێك داوە، هەموو کوردێکی گەورە و بچووك وەکوو یەك تیایا شەریکن، وەکوو هەموو عەرەب و کوردێکی عێراق لە نیشتمانەکەدا هاوبەشن. کەوابوو ڕاست بوو جیاییەکی زۆر هەبوو لە بەینی «قانوونی ئەساسی» دەوری پێشووی عێراق و لە بەینی دەستووری وەختی کۆماری خۆشەویستی عێراقی ئێستەدا.

لەبەر ئەمانە و لەبەر خۆشەویستی زاتی عەبدولکەریم قاسم لە بەرچاوی هەموو تاقەکەسێکی ئەم نیشتمانە لەباوەڕی منا - وەلام وایە لە واقعیشا هەر وایە - کورد تا ئاخر هەناسەی بە هەموو هێزێکیەوە پشتیوانی و تەئییدی کۆماری عێراق و عەبدولکەریم

قاسم سەرۆکی شۆڕشی (١٤)ی تەمووزی عێراق ئەکاو بۆ بەرزبوونەوە و پێشکەوتنیان بەماڵ و بەگیان ئامادەی هەموو فیداکاریەك ئەبن.

* * *

لێرەدا دوو شت هەیە لام وایە پێویستە بە باسکردن:

یەکەم: وەکوو پێویستە لەسەر هەموو تاقە کەسێکی کورد پشتیوانی ئەم کۆماری عێراقە بکا، بەو جۆرەش پێویستە لەسەر هەموو تاقە کەسێکی عەرەب لە عێراقا تا ئاخر هەناسەی پشتیوانی بکا و شان بە شانی یەك ئەم دوو شەعبە تەکان بدەن بۆ بەرزکردنەوە و قایمکردنی ئەم کۆمارە تازەی خۆشەویستەی عێراق. بە تایبەتی ئەوانەی کەوا بە درێژایی عومری درێژی کۆماری خۆشەویست ئەکەونە سەر کورسی حوکم و حوکم ئەگرن بە دەستەوە ـ چە کوردێك بێ وە یا عەرەبێك بێ ـ ئەبێ بە بێ جیاوازی، داد و عەدڵ لە بەینی شەعبا بەجێ بێنن، ئەبێ نەسسەکانی دەستووری کۆمار نەخەنە پشت گوێ بەرانبەر بە هەندێك و بەرانبەر بە هەندێکیتریش «تطبیقی» بکەن. ئەگەر ئەمە بکەن خیانەتێکە لە «شەعب» و لە کۆماری ئەکەن.

ئەو دەورە کە ئەو پیاوانە ئەدۆزێتەوە بۆ «حوکم» دەورەیەکی شەعبی و یەکیەتییە، نەوەك دەورەیەکی «أرستقراتی» و جیایی. شەعب ئیشی ئەوێ نەوەك قسە، یەکیەتی ئەوێ نەوەك جیایی، برایەتی ئەوێ نەوەك دوژمنایەتی، هێمنی و ئاشتی ئەوێ نەوەك ئاژاوە و شەڕ. پیاوەکانی دەوری پێشوو هەموو پێچەوانەکانیان گرتبوو بۆیە ئاشنایەتی لەبەینی ئەوان و شەعبا بچڕابوو.

دووهەم: ئەم عێراقە سەرمایەیەکی زۆری هەیە، نەوتێکی زۆری هەیە هەمووکەس تەماعی تێ ئەکا و چاوی تێ ئەبڕێ، خوێندەواری و سەقافەتێکی وای نییە، کە بتوانێ بەو هۆیەوە بەربەرەکانێ ئەو چاو بڕکێیە بکا، ئەبێ لە پێشا کۆشش بکرێ بۆ پێگەیاندن و بەرز بوونەوەی پایەی خوێندەواری و ئابووری و پیشەسازیی شەعبەکە، پاش ئەوە ئەگەر یەکێکیتریش چاوی تێبڕی ئەم ئەتوانێ تاکی تەرازووی خۆی ڕاست بکاتەوە.

قەومی کورد ـ وەکوو وترا ـ لە هەموو ئەدوار و پلەکانا بەگیان و بە ماڵ و بەدڵ پشتیوانی و تەئییدی ئەم کۆماری عێراقەی کردووە و ئەیکا، تا نیوە هەناسەیەکی تێدا

بمێنێ هەر ئەیکا و دوا ناکەوێ، بۆیەش دوا ناکەوێ و ئەیکا چونکە قازانجی لەمەدایە و هەرکە قازانجی خۆی ئەوێ. وە بێگومان قازانجی عەرەبەکانیش ـ ئەو عەرەبانە کە بۆ دروستکردنی ئەم کۆمارە جەنگیون و ئەرکی دامەزراندن و ڕاگرتنی کۆمار کەوتۆتە سەرشانی هەموو تاقەکەسێکیان ـ هەر لەمەدایە، قازانجیان هەر لەوەدایە چۆن پێکەوە قۆڵیان کرد بە قۆڵی یەکا بۆ قایمکردن و دامەزراندنی کۆمار هەر بەو جۆرەش بمێننەوە و ئاور بەلایەکیترەوە نەدەنەوە.

ئەوانەی کە وا بە پڕوپاگاندە جۆرە شتێکیتر ئەهێننە ناوەوە و گوێ لە دەنگی تەموورەی هەندێ لە دوژمنەکانی عێراق ئەگرن، ئەوانە وەنەبێ دۆستایەتی بکەن لەگەڵ عێراقا و لەگەڵ عەرەبی عێراقا.

پەردەکانی ڕابردووی عەبدولکەریم قاسم دەری ئەخا کە ئەم پیاوە بەرانبەر بەم ئاو و خاك و خەڵکە دڵسۆزە و خۆشی و کامەرانی ئەم میللەتەی ئەوێ، ئەیەوێ عێراق بۆ عێراق بێت و دەستێکیتر لەناویا نەبێ، پێچەوانەی ئەو باوەڕەی ئەو، بێگومان زیان بە عەرەبەکان زیاتر ئەگەیەنێ لە عێراقا تا کوردەکان. چونکە کوردەکان پشتیوانی بیروباوەڕی عەبدولکەریم قاسم تا ئاخر تنۆکی خوێنی ژیانیان ئەکەن و ئەم ـ جمهووریەتی عێراقیە ـ ئەپارێزن، گومانی تێدا نییە ئەوی پێچەوانەی ئەم باوەڕەی هەبێ بڕوا ناکرێ تیایا سەرکەوێ.

خۆ ئەگەر لە بیروباوەڕێکی ڕاستا بیانەوێ هاوکاری لەگەڵ کوردەکانا بکەن، ئەوە کورد تا تنۆکی خوێنی تێدا بمێنێ قۆڵی لە قۆڵیانایە و هەنگاو بە هەنگاو پێکەوە ئەچن بەرێدا و بە هێزی هەر دوولایانەوە ئەوەندەیتر کۆماری خۆشەویستی عێراق ئەگەیەننە چڵەپۆپەی بەرزیەتی و هیچ دەستێکی گزیکەری دەرەوەی «عێراق» ناتوانێ پەنجە بخاتە ناویانەوە.

◈◈◈

**[بۆ دانانی ئەم کتێبە سەیری ئەم سەرچاوانەی خوارەوەش کراوە:]**


١ـ شرفنامه — شرفخانی بتلیسی

٢ـ تاریخ مردوخ — آیت‌اللّه کردستانی

٣ـ تاریخ أردلان — ناصر آزادپور

٤ـ اسرار بارزان — دکتر اسماعیل اردلان

٥ـ خلاصه کرد و کردستان — محمدامین زکی

٦ـ مشاهیر الکرد — محمد امین زکی

٧ـ امارة بهدینان — صدیق الدملوجی

٨ـ تاریخ الوزارات العیراقیة — سید عبدالرزاق الحسنی

٩ـ الضحایا الثلاث — عبدالمنعم الغلامی

١٠ـ القضیة الکردیة — دکتر بلەچ. شێرکۆ

١١ـ بارزان المظلومة — معروف جیاوگ

١٢ـ یادداشت — ماموستا رفیق حلمی

١٣ـ مێژووی ئەدەبی کوردی — علاءالدین سجادی

١٤ـ هەڵکەوتێکی دێڕی — حسین حوزنی موکریانی

١٥ـ مەسەلەی کوردەکان — و.جی.ایلفنستن. وەرگێڕی [عبدالقادر حشمت].

١٦ـ ازمهاباد خونین — نجفقلی پسیان.

١٧ـ مرگ بود و بازگشت هم بود — نجفقلی پسیان.

١٨ـ یادداشتی دەستنووس لە بارەی سابڵاخەوە... — عبدالرحمن زەبیحی.

١٩ـ گۆڤاری گەلاوێژ....

٢٠ـ الخرائط والمساحات العیراقیة...

٢١ـ ئەو شۆڕشانەی کە لە بارەی عێراقەوە دەرچوون...

٢٢ـ ڕۆژنامە کوردییەکان...



## مامۆستا عەلائەددین سەجادی
**١٩٠٧-١٩٨٤ زایینی**

عاشقی وشەی خاوێنی کورد، کەڵەپیاوی بەدەستوبرد، هۆگری داب‌ونەریتی کوردەواری، کۆکەرەوەی کەلەپوور لە دێهات و شاری، زیندووکەرەوەی شادی، شێخ عەلائەددینی سەجادی.

ناوی«عەلائەددین نەجمەددین عیسامەددین»ە و لە بنەماڵەی ناوداری «سە جادی»یە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. لە ساڵی ١٩٠٧ی زایینی لە سنەدا هاتۆتە دنیاوە و لە کۆشی خێزانێکی ئایینیدا پەروەردە کراوە. لە ساڵی ١٩٣٨ی زایینی ئیجازەی مەلایەتی لای مامۆستا «شێخ بابەعەلی تەکیەیی» وەرگرتووە و چووە بۆ بەغدا و لە مزگەوتی «نەعیمە» خاتوون بووە بە پێش‌نوێژ. لە بەغداش لای مامۆستایان شێخ «ئەمجەدی زەهاوی» و شێخ «محەممەدی قزڵجی» بە هەندێ لە زانستە ئیسلامییەکاندا چۆتەوە. لە ساڵی ١٩٣٩ی زایینیدا چۆتە مەیدانی ڕۆژنامەنووسی و لە ١٩٤١دا بووە بە بەڕێوەبەری گۆڤاری «گەلاوێژ» و وردە وردە بووە بە هەمەکارەی و تا داخستنی لە ١٩٤٩دا لەگەڵی بووە.

لە ساڵی ١٩٤٨دا گۆڤاری «نزار»ی بە عەرەبی و کوردی دەرکردووە، کە گۆڤارێکی نیشتمانپەروەری و سیاسی بووە. تا ساڵی ١٩٧٤ مامۆستای وێژە و مێژووی وێژەی کوردی بووە لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا. لە ساڵی ١٩٧٤دا کرا بە ئەمینداری گشتی ئەوقاف و سێ ساڵ لەو کارەدا ماوەتەوە.

ئێوارەی ڕۆژی پێنج‌شەممەی ١٩٨٤/١٢/١٤ی زایینی،کۆچی‌دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە نزیکی شێخ عەبدوڕڕەحمانی ئەبولوەفای نەقشبەندی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە کۆشی خاک سپێرراوە.

عەلائەددینی سەجادی زیاتر لە چل‌ساڵ خەریکی زیندووکردنەوەی کەلەپوور و نووسینی مێژووی وێژەی کورد بوو. تێکۆشانی بێ‌وچانی ئەم پایەبەرزە نەیهێشت کە گەنجینەی کەلەپووری نەتەوەکەمان بفەوتێ.

ناوی بەرز و ڕۆحی شاد بێت

طراح جلد: شیلان هوشیاری
نوشتەی عنوان: حمیدرضا رزی

انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنندج - پاساژ عزتی - تلفن: ٣٣١۶۵٣٨٢

9789649802596